خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا
لێپرسراوی دەزگا: ئەنوەر حسێن

سەرپەرشتیارانی پرۆژەی چاپکردنی کتێب
د. لوقمان رەئوف
ئەرسەلان حەسەن
باوان عومەر
بابان ئەنوەر

# ئەرکی سیخوڕانی نهێنی

**فیل هایریخ**

**وەرگێڕانی: ئاسۆ حەسەن**

**2017**

خاوەن ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا
لێپرسراوی دەزگا: ئەنور حسێن

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا
زنجیرە (210 )

ناوی کتێب: ئەرکی سیخوڕانی نهێنی
بابەت: سیاسی
ناوی نووسەر: فیل هایریخ
وەرگێڕانی: ئاسۆ حەسەن
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد
تایپ و هەڵەچن: زریان رەحیم- کەیوان عمر- نیاز کمال
چاپخانە: حەمدی
ساڵی چاپ: 2017
چاپ: یەکەم
تیراژ: 500 دانە
نرخ: 6000 دینار
لەبڵاوکراوەکانی: دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە

www.ideafoundation.co
ideafoun@gmail.com
www.facebook.com/dezgai.idea
07701955044 - 0533220180
سلێمانی - گردی سەرچنار- نزیک کۆمەڵگەی بەهاران

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن ( 1630 )ی ساڵی 2017ی پێدراوە

**شرۆڤەکردنی چالاکیی ئەو سیخوڕانەیە، ئەرکی تیرۆرکردنی ئەم کەسایەتییانەی خوارەوەیان پێسپێردراوە:**

ستالین، ڕاینهات هایدریخ، ئایزنهاوەر، وایلدنییل هماکاک، هیتلەر، جاک سۆستیل، ڕیچارد نیکسۆن، جەنەراڵ کۆرت ستودفت، جەنەراڵ پانچو ویلا، مک کنیلی، خرۆشۆف، ئال کاپوک.

# پێڕست

## پێشەکی

ئەم کتێبەی بەردەستت، یادەوەری و بەسەرهاتی ڕاچڵەکێنەری ئەو سیخوڕانەیە، کە دنیایان پەلکێشی کاولبوون و نوقمی خوێن کرد و بوسیا (فیل هایریخ)، کۆیکردووەتەوە و وەک کۆمەڵەیەک ڕێکیخستووە، ناوونیشانی ئەسڵیی کتێبەکە مامەڵەچیانی مردنە، لەم کۆمەڵەیە سەیر و ڕاچڵەکێنەرەدا، خوێنەر لە نهێنییەک

دەگات, کە تا ئێستا بەنهێنی ماوەتەوە و خوێندنەوەیان جەستەی مرۆڤ دەخاتە لەرزەوە.

ئەم کتێبە دوای بڵاوبوونەوەی لە ئەمەریکا، بە ئاستێک هەرا و زەنایەکی ناوەتەوە، کە لە ماوەی مانگێکدا (5) ملیۆن نوسخەی لێفرۆشراوە.

لەو کۆمەڵەیەدا هاتووە، کە چۆن ویستوویانە هیتلەر بە بۆمبی سەعاتی بکوژن، یان نیکسۆن، یاریدەدەری سەرۆککۆماری ئەمەریکا بەردباران بکەن و سیخوڕێک باسی ئەرکی خۆی دەکات، بۆ کوشتنی ستالین، کە پێی سپێدراوە.

دوو بەشەکەی دیکەی کتێبەکە، بەتەواوەتی باسی چۆنییەتیی نەخشەی بەراوەژوو دەکات، دژی خرۆشۆف، ئەزینهاوەر، چەرچڵ، چۆنیەتیی کوشتنی جەنەراڵ (پانچو ویلا) و (ویلیام مەک کۆنیلی) سەرۆککۆماریش باسیکراوە، کە دەکرێت ئەو کتێبە بەسەریەکەوە بە بەڵگەیەکی زیندو دابنرێت، لەبارەی تاوان و هەنگاوەکانی سیخوڕان.

ژمارەیەک لە خۆیان دەپرسن سیخوڕەکان لەپێناو چیدا خیانەت دەکەن؟ ئایا لە سکی دایکیانەوە پیاوکوژ بوون؟ سادیزمیان هەیە، یان حەز بە ناو و ناوبانگ دەکەن؟ نیشتمانپەروەرن، یان تەنیا ئەو مامەڵەچییانەن، کە مامەڵەی مردن دەکەن؟ یان لەپێناو سوودوەرگرتنی ماددی زۆردایە؟

لەم کتێبەدا، وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدرێتەوە.

(مـن ستالینم نـاسـی و دەسـتـم بـردە نـاو گیرفانی چاکەتەکەیەوە و کلیلی بۆمبی سەعاتییەکەم داگـرت، پێموابوو تا پێنج چرکەی دیکە... . )

لەوانەیە من تاکە پاشماوەی یەکێک لە یەکە نەناسراوەکانی سەربازی شەڕی دووەمی جیهانی بم، ئەگەر لە کارەکەم سەردەکەوتم و دەمتوانی ئەرکەکەم جێبەجێ بکەم، نەک تەنیا چارەنووسی شەڕ دەگۆڕا، بەڵکو بارودۆخی دنیاش بەیەکجاری وەردەچەرخا، چونکە یەکێک بووم لەو کۆمەڵە سیخوڕە تایبەتییە، کە بۆ کوشتنی (جۆزێف ستالین)، ڕەوانـەی مۆسکۆ کرابووم و تا ڕاددەیـەک چی وای بۆ ئەرکەکە نەمابوو، کە ڕووداوێـکـی لاوەکـی و پێشبینی نەکراو، بووە فریادڕەسی ژیانی دیکتاتۆری ڕووسیا و وایکرد، هەشت ساڵی دیکە درێژە بە ژیان بدات، کارەساتی جیهانی بخولْقێنێت.

بەسەرهاتی من، یان بە دەستەواژەیەکی دیکە، ڕەوتی ئەرکەکەم لە مانگی ئابی ساڵی 1944دا، دەستیپێکرد. ئەو کاتە تەمەنم لە 20 ساڵ زیاتر نەدەبوو، سەعات 5ی بەیانییەکی ئەو مانگە، کە سەرقاڵی نۆرەی پاسەوانیی خۆم بووم لە بەردەم سەربازگەی دەرەوەی (بەرلین)، لەناکاو شەوقی گڵۆپی چەند ئۆتۆمبێلێکم بینی، لە سەربازگەکە نزیکدەبوونەوە و دوای کەمێک ئۆتۆمبێلێکی سەربازی

گەورە لە بەرامبەر تەلاری دەزگای هەواڵگری وەستا، فەرماندەی لەشکرەکەمانی لێ دابەزی و دوو ئەفسەر بە جلوبەرگی یونیفۆرمی (ئێس ئێس)ی ئەڵمانی، کە یاوەری بوون، لە ئۆتۆمبێلەکەدا مانەوە. فەرماندەی لەشکرەکە بە دەنگێکی قاییم و پتەو بەردانگ بە ئەفسەری ئێشکگر وتی: (هەموو سەربازەکان لە سەری سەعات، با لە هۆڵی وتاردان ئامادەبن).

دوای سەعاتێک هەموو "واتا 120 سەرباز و ئەفسەرەکان"یش هاتن. ئامادەباش لە هۆڵەکەدا وەستابووین، دوو ئەفسەر ڕێکیان کردین و پاشان یەکێکیان وتی: من پێویستم بە 10 پیاوە، لەبیرتان بێت، پێویستم بە 10 پیاوە، کە ئامادەبن ئەرکێکی زۆر ترسناک و گرنگ قبووڵ بکەن.

ئەوانەی من پێویستم پێیانە، دەبێت زمان و دابونەریتی ڕووسەکان بزانن. خۆبەخشەکان زۆر شتی وەک سێ پاکەت جگەرە، بتڵێک کۆنیاک وەردەگرن و خزم و کەسەکانیان مووچەی هەمیشەیان دەبێت. زۆر باشە، خۆبەخشەکان هەنگاوێک بۆ پێشەوە.

نزیکەی چل کەس لەو ئەفسەرانەی پێشتر بۆ بەرەی شەڕی ڕووسیا نێردرابوون، هەنگاویان بۆ پێشەوە نا و سەرلەشکری ئەڵمانی، 10 کەسی لە هەمووان گەنجتری لێ هەڵبژاردن، لەوانە خودی من. بۆ خۆیشم نەمدەزانی

بۆچی بوومەتە خۆبەخشی ئەو کارە، چونکە من ئەندامی حیزبەکەی ئەوان نەبووم، بەڵام پێموایە بیری بابەتی مووچەی تایبەت و پەیوەندیم بە شەڕانگێزی، منی بۆ ئەو کارە پاڵ پێوەنا و لەوانەیشە ئەفسەری سەرووی ئێمە لەبارەی ئەو کارەی منەوە ڕاستی وتبێت، چونکە کاتێک بەرەو ئەرکەکەم کەوتمەڕێ، بە زمانی خۆمان، واتە بە زمانی ئەڵمانی، بە گوێیدا چرپاندم و وتی گەمژە !

لەوانەیە گەمژەیی بووبێت، بەڵام هەرچۆنێک بێت، هەر ئەو ڕۆژە هەر 10 کەسمان جلوبەرگی نوێیان پێ پۆشین و دوای سێ ڕۆژ بردیانین، بۆ قەڵای (شلوس فرایدنشاڵ)، کە لە کەناری ڕووباری (مادل) دروستکراوە، دوو میل لە وێستگەی هێڵی ئاسنی (سائسن ماون)ەوە دوورە، تا مەشقمان پێبکەن.

نیوەڕۆ بوو کە چووینە ناو قەڵاکەوە و هەموومان بە بینینی ئەو هەموو شان و شکۆیە سەرسام بووین و حەپەساین. هۆڵی نانخواردن بە کەلوپەلی نوێ، مێزی سپی، خزمەتکاری دەست بە سینگەوە، خواردنی خۆش و بەتام، بەتوندی ئێمەیان خستە ژێر کاریگەرییەوە.

لەسەر هەرمێزێک کچێک دانیشتبوو، دوای ئەوەی ئێمەش لەپشت مێزەکان دانیشتین، کچێکی بەڕەگەز ئیتالی لەپەنام دانیشت و هەرچەند نەیدەتوانی بەئەڵمانی بدوێت،

لەگەڵ ئەوەشدا تەق و لۆق، مەبەستی خۆی دەردەبڕی.

هەرچۆنێک بێت، بۆ بەیانی هەریەک لە ئەندامانی گرووپەکەمان ژمارەی نهێنیی خۆیان وەرگرت، کە ژمارەی سیخوڕیی من (ب- 2/473) بوو. پاشان هەموومان لە هۆڵێکدا خەریکی فێربوونی مۆدیلی سیخوڕی و چۆنیەتیی ئەرکەکەمان بووین و ڕۆژەکانی دوایی لەو قەڵایەدا، (کە ئێستا بووەتە ناوەندی پەروەردەکردنی سیخوڕانی ئەڵمانی)، خەریکی مەشقی تەقەکردن و توێژینەوەی نەخشەی جۆراوجۆر بووین و بە تێکڕای پێداویستییەکانی ئەمەریکی و بەریتانی و ڕووسی، وەک نارنجۆک و هەموو ماددە تەقینەوەییەکانیان پێ ناساندین، پاشان مەشقی سەرکەوتن بەسەر پەت و دیواری بەرز و ڕۆیشتن بە نێوان ڕووبارە بەرداوییەکانیان پێکردین.

هەموومان زانیاریی ئەوەمان هەبوو، کە (فومرد) نیازیوایە چەکی نوێ بۆ شەڕ بهێنێت و ڕۆژانە سەعاتێک مژوولی فێربوونی نهێنیی ئەرکەکەمان بووین. هەڵبەتە وێڕای ئێمە، ژمارەیەکی زۆری دیکەش لەو ئەکادیمییە، هونەری سیخوڕیان دەخوێند و ژمارەیان نزیکەی 300کەس دەبوو، هەرکە یەکێکیان خوێندنی تەواو دەبوو، لەوێ دەڕۆیشت. کەسێکی دیکە شوێنی دەگرتەوە و دەڕۆیشت. من هەر لە سەرەتاوە تێگەیشتم، کە ئەڵمانیا سیخوڕی بەتوانا

پەروەردەدەکات، بۆ شوێنەکانی دنیایان دەنێرێت. ئەوانەی بۆ کاری سیخوڕی دیاریدەکران، هەموویان یان سەر بە هێزەکانی ئاسمانی، یان پیادە، یان خاوەن پۆستەکانی دەریایی بوون و بێجگە لە ئێمە (کە بە بەشێک لە سیخوڕانی کاتی پەروەردە دادەنراین)، کەسانی دیکەش هەبوون، بەهۆی خودی هیتلەرەوە دیاریکرابوون و تەمەنیان لە 17 بۆ 18 ساڵ زیاتر نەبوون، لەنێویاندا زیندانیانی بڕیارلێدراو بە لەسێدارەدانیش، کە خۆبەخشی کاری سیخوڕی بوون، لەو ئەکادیمییەدا فێردەکران و فێرکردنیان پەیوەندی بە کاری ترسناکی ئێمەوە هەبوو، نەوەد لە سەد، ئەگەری بە زیندوومانەوەیان لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکەیان، نەبوو.

نزیکەی یەک لە سێی مامۆستایانی ئەکادیمی، خەڵکی دەرەوە و بێگانە بوون، کە دەکرێت لەوانە ناوی بەریتانی، هۆڵەندی، نەرویجی، پۆڵەندی، ئیسپانی و تەنانەت ژمارەیەک ڕووسی بهێنین. هەر لەو ئەکادیمیەدا نزیکەی 50 بۆ 70 ژن و کچیش وانەیان دەخوێند و هەڵبەتە فێرکردنی ئەوان لە ئێمە گرنگتر بوو. چونکە ئەوان سەرەڕای فێربوونی شێوازی ئیشپێکردنی چەکی جۆراوجۆر، فێری جفرەی تەلگراف و بێسیمیش دەکران و ڕێنمایی وردی ئەوان، بەو بۆنەوەیە بوو کە ئەو ژنانە، سیخوڕی نێودەوڵەتی بوون. لە کاتێکدا ئێمە تەنیا بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێک لە مۆسکۆ

ڕادەهێنراین و ڕێنمایی سەرەتایی ئێمە، جگە لە سۆڤێت، بەکەڵکی هیچ ولاتێکی دیکە نەدەهات.

چوار هەفتە دوای چوونمان بۆ ئەکادیمی (خریدفتال)، من بۆ یەکەم جار چاوم بە سەرۆکی سیخوڕان، واتە سەرلەشکر (ئۆتۆسکۆرزەنی) کەوت، ئەو پیاوێکی جیددی و تووڕە و بوێر بوو، هەمان کەسە کە لە ساڵی 1943، (مۆسۆلینی) لە دەستی هاوپەیمانان ڕزگارکرد.

کاتێک من بۆ یەکەم جار ئەو پیاوەم بینی، کەتەیەکی زلە لە پلیکانەکانی ئەکادیمییەکە دەچووەخوار و شوێنی برینێکی سپی لەسەر گۆنای چەپی، واتە بە هاوتەریبی گوێ و دەمی دەبینرێت، تەوقەی لەگەڵ هەموو ئەو سیخوڕانە کرد، کە بڕیاربوو بەیانی بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەیان بنێردرێن و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستن.

تا ڕاددەیەک سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ساڵی 1944، ئەو کەسە، واتە (ئوتوسکورزەنی) بەیەکجاری دیارنەما و پاشان زانیمان، بە هاوڕێیەتیی ژمارەیەک سیخوڕ خۆیان گۆڕیوە بۆ هاوشێوەی ئینگلیزەکان و ئاشنا بە زمانەکەیان، بەهۆی پەڕەشووتەوە، لەپشت بەرەی شەڕی دوژمن دابەزیوە، ئەرکی کوشتنی جەنەراڵ ئایزنهاوەر (کە ئەوکاتە ئەیزنهاوەر هێشتا نەببووە سەرۆککۆمار)، و (برادلی) و مارشاڵ (مۆنتگمەری)، تەواوی پلەدارەکانی

سوپای هاوپەیمانانیان پێسپێدراوە (لە بەشی داهاتوودا باسی چۆنییەتیی ئەو ئەرکە کراوە).

دوای ئەو ماوەیەی کە ئێمە ڕاهێنانمان پێدەکرا، هەمووومان بۆ کۆمەڵی گچکە دابەشکراین و بڕیاری خێرامان وەرگرت و من و 9 سیخوڕی دیکە، کە بەباشی قسەمان بە زمانی ڕووسی دەکرد، لەژێر چاودێریی ژمارەیەک لە پلەداران و سیخوڕانی بە ڕەگەز ڕووسی، خەریکی فێربوونی دابونەریت و ئایدیای کۆمۆنیستی و یاساکانی سوپای سوور بووین.

لەناوماندا دەنگۆی ئەوە هەبوو، کە پێویستە ئێمە لەپشت بەرەی شەڕی سۆڤێتییەکان دابەزین و نامەکانی پەیوەندی و دەزگا هەواڵگرییەکانیان لەکاربخەین.

سەرئەنجام لە شەوی 7ی مانگی شوباتی ساڵی 1945، لەپڕ هەشت کەس لە کۆمەڵەکەمان بانگهێشتی نووسینگەی ئەکادیمی کراین، لەوێ (هیملەر) کە یەکێک بوو لە بەرپرسانی سوپای (ئێس ئێس)، قسەی بۆکردین.

دەزگای خستنە داوەوەی ئەڵمانیا (دەزگای سیخوڕی)، زانیبووی کە بڕیارە لە یەکێک لە شوێنە نادیارەکان، کۆبوونەوەیەک لەنێوان ستالین و چەرچڵ و ڕۆزفلێت بکرێت. (هیملەر)، ڕایگەیاند شوێنی کۆبوونەوەکە نادیارە و ئەرکمان پێسپێدراوە لە شوێنێک لە بیابانی سینا، (کە بەپێی

زانیاری، کۆبوونەوەکە لەو دەورووبـەرە ئەنجامدەدرا)، شوێنی کۆبوونەوەکە بدۆزینەوە، ئاشکرای بکەین، ئەڵقەی گەمارۆدراوی پاسەوانەکان ببڕین و ستالین بکوژین.

(هیملەر) دوای باسکردنی ئەرکەکەی ئێمە، بـەردەوام بوو: باش بیر لە وردەکاریی ئەو کارە بکەنەوە، بە مردنی ستالین کۆمۆنیزم (لەناودەچێت و خەڵک شۆڕشدەکەن و شەڕ لەگەڵ سۆڤێت کۆتایی پێدێت، بەڵام پێویستە زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت، کە چەرچڵ هیچ زیانێکی پێنەگات، ئەو بڕیارە جەختی لێدەکرێتەوە و تەنانەت ئەگەر ئەرکەکەتان شکستیهێنا، هەر باشە مووێک لەسەری بەرپرسانی وڵاتانی خۆرئاوا، کەم بێتەوە، چونکە لە یەکێک لە قۆناغەکانی شەڕدا، ئاشتیکردن لەگەڵ هێزەکانی خۆرئاوا، یەکجار پێویست و گرنگە.) هیملەر بێدەنگ بوو، چاوی بە یەک بە یەکی ئێمە هەشت کەسەکەدا گێڕا و پاشان بـەردەوام بوو. گەر لەو ئەرکەدا سەرکەوتووبن ناوی ئێوە لە مێژوودا تۆماردەکرێت، بە پاڵەوانانی نەتەوەیی ئەڵمانیا ئەژماردەکرێن، هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم. داهاتووی ڕایش و ئەڵمانیا لە دەستی ئێوەدایە و پێشەوای ئێوە لەکۆتاییدا بێ سەبر و حەوسەلە، چاوەڕێی ئەنجامی ئێوەیە. بژی هیتلەر!

هەستمکرد گێژەخولەمە، لەشم داهـێزراوە، لەو کارە حەپەساوم، زمانم گیراوە و ئەفسەرەکەی سەرووی خۆم

بیرکەوتەوە، کە لە سەرەتای ڕەزامەندی دەربڕینمدا، بە گوێیدا چرپاندم: گەمژە !

ئەوکاتە، زانیم ئەو پیاوە ڕاستیکردووە و من گەمژەییەکی زۆرم کردووە. بەڵام کار لە کار ترازابوو. جلوبەرگمان کردەبەر و هەر هەشت کەسەکە سواری ئۆتۆمۆبێل بووین و لە ئەکادیمییەکە هاتینەدەر، دوای 2 سەعات، گەیشیتنە فڕۆکەخانەی گەورەی نزیک (دوبرتبس) و ئۆتۆمۆبێلەکە وەستا. هەلیکۆپتەرێکی مۆدێل (جارکەرز 52) چاوەڕوانمان بوو. سەعات یەکی دوای نیوەشەو، سەرکەوتین و بەرەو شوێنی ئەرکەکەمان بەڕێ کەوتین.

هەلیکۆپتەرەکە دوای بڕینی 50 کیلۆمەتر بە ئاڕاستەی خۆرئاوادا، بەرەو باشوور سووڕایەوە و بەسەر ئاسمانی پایتەختی (نەمسا)دا دەفڕین. دووکەڵێکی ڕەشی تۆخ لەسەر شارەکەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەستا و هۆی ئەو کارە ئەوە بوو، کە پێش چەند سەعاتێک شارەکە کەوتووەتە بەر پەلاماری ئاسمانی و فڕۆکەکانی بەریتانیا، بە شێوەیەکی چڕوپڕ فڕۆکەخانەکەیان بۆردومان کردبوو. بەم شێوەیە، فڕۆکەوانەکە بەزەحمەت توانیی هەلیکۆپتەرەکە بنیشێنێتەوە. سەعات چواری دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، ئێمە هەشت کەس لە فڕۆکەخانە ماینەوە، پاشان بە هاوڕێیەتی بەرپرسێکی ئەڵمانی، براینە ئارایشتگایەک تا قژمان بە مۆدیلی قژی

سەربازانی سوپای سوور کورتبکەینەوە و پاشان، جلوبەرگی خۆمان گۆڕی و یونیفۆرمی کۆنەی ڕووسیمان کردەبەر و بە هەریەکەمان بەستەیەک ڕۆبڵی ڕووسی و ناسنامەی سوپای سووریان پێداین. من بەدیقەتەوە سەیری ناسنامەساختەکەمم کرد. سووچی ناسنامەکە زەردببوون و دڕابوون و مەرەکەبی نووسینگەش بەهۆی با و بارانەوە سڕدراوەتەوە و تێکەڵ بووە، من زانیم ئەو ناسنامە ساختە نییە، بەڵکو هی سەربازێکی ڕووسی بوو، کە لە بەرەی شەڕ کوژراوە و لە گیرفانیان دەرهێناوە.

دوای ئەو کەلوپەلانە، بەشەنان، حەپی ڤیتامین، پاکەتە جگەرە، شکولاتە و بتڵێکی گچکەی ویسکیان، بە هەریەکێکمانیان داو ئێمە خستماننە کۆڵەپشتە چەرمییەکەمانەوە، کە دژە باران و ئاو بوو. کۆڵەپشتەکە وەک جانتا درووستکرابوو، دوو بەرگی هەبوو، بەرگێکیان دەمانچەیەکی حەوت تیری ڕووسی و سێ نارنجۆکی دەستی تێدابوو.

لە دەرەوەی گەنجینەی کەلوپەلەکانی سوپا، سێ فەرماندەی سەربازی، کە لە ئۆتۆمۆبێلێککی جیب دانیشتبوون، چاوەڕوانیی ئێمەیان دەکرد و یەکێکیان جلوبەرگی یونیفۆرمی (ئێس ئێس)ی پۆشیبوو. (ئێس ئێس، کورتکراوەی سکیورتی دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیایە) لە

دواوەی ئەو جێبە، ئیڤایەکی سەرداپۆشراو وەستابوو، خێمەیان بە پشتەوەی دادابوو.

ئێمە هەر هەشتمان سواری ئیڤاکە بووین و کەوتینەڕێ و دوای نیو سەعات، کە گەیشتاینە ڕووباری (دانوب)، ئۆتۆمۆبێلەکە وەستا. لەوێ بەلەم و کەشتیی شەڕی زۆری ڕووسی دەبینران، کە ئەڵمانەکان لەشەڕدا گرتبوونیان و ئێمە بە یونیفۆرمی ڕووسی لەگەڵ مەلەوانەکان لە کەنارەکە وەستابووین و من هەر لە یەکەم بینیندا، زانیم ئەوانە هەموویان ڕووسین.

کۆمەڵەکەمان بۆ دوو گرووپی چوارکەسی دابەشکراو هەرگرووپێک سواری هەلیکۆپتەرێکی شەڕ کراین، کە لەوێ بوون. ئەو هەلیکۆپتەرەی من سواری بووم، چوار کەسی ڕووسی، واتا فڕۆکەوان، هاوکاری فڕۆکەوان، دوو کەسی تری تێدابوون و لە کاتی گەرمکردنی مەکینەکەی، ئێمە دوا بڕیارمان وەرگرت.

لەگەڵ هەستانی هەلیکۆپتەرەکە چاوێکم لە سەعاتەکەم کرد، هەستم کرد، ڕێک سەعات چوار و پەنجا خولەکی دوای نیوەڕۆیە. دوای بەرزبوونەوەی تەواو، هەلیکۆپتەرە ڕووسییەکەی ئێمە، لە کاتێکدا فڕۆکەیەکی ئەڵمانی لەو کاتەدا پارێزگاری لێدەکرد، بەرەو خۆرئاوا سووڕایەوە و من هەستمکرد بەسەر ڕووباری دانوبەوە بەرەو

(بۆداپست) دەفڕین. هەرچەندجارێک بریسکەی تۆپباران و تەقینەوەی بۆمبەکانمان لەسەر زەوی دەبینی و بەپێی دواڕاپۆرت، لەو کاتەدا سۆڤیتییەکان ڕژاونەتە ناو پایتەخت (بەرلین)ەوە، لە گەرمەی شەڕی سەر شەقامەکان دابوون. هەلیکۆپتەرەکەمان بە ئاستێک بەرزبوونەوەکەی کەمکردەوە و لە زەوی نزیکبووەوە، تا سۆڤێتییەکان وابزانن هەلیکۆپتەرێکی جەنگی ڕووسییە.

هەروەک بەرەوپێش دەچووین، یەکجێ عەدەد دۆشکەکەی ئێمە هاواری کرد: سۆڤێتییەکان ڕێک لەسەر سەری ئێمەوە دەفڕن. خوایە گیان، چوار هەلیکۆپتەر چاودێریمان دەکەن! هەر ئەو کاتە دەسڕێژی گوللە بەلای باڵی هەلیکۆپتەرەکەی ئێمەدا ویزەی هات و هەمووومان زانیمان، کە فڕۆکە ئەڵمانییەکە بەرەو ئێمە تەقە دەکات، بەڵام هەوڵدەدات فیشەکەکان ئامانج نەپێکن. هەلیکۆپتەرەکەی ئێمەش لەبەرامبەردا تەقەی کرد و هەموو هەلیکۆپتەرە ڕووسییەکان هاتن بە هاوارمانەوە، بەڵام فڕۆکە تیژفڕە ئەڵمانییەکە خێرا سووڕایەوە و بەرەو بۆداپست گەڕایەوە.

دوای ئەوەی لە زنجیرە شاخی کاربات تێپەڕین، هەموو فڕۆکە سۆڤێتییەکان لەچاو ونبوون و فڕۆکەوانەکە پێمانی وت، کە بەم زوانە دەنیشینەوە.

ژانەسەر دایگرتبووم و هەستم دەکرد دەلەرزم و دوای چەند خولەکێک نەڕەی ماتۆڕەکە هات، فڕۆکەوانەکە هاواری کرد: پشتاینەکانتان توندبکەن و ئێمە ئێستا دەنیشینەوە.

پێش ئەوەی پشتێنی سەلامەتی ببەستم، لەپشت شووشەکەوە چاوێکم بەدەرەوەدا گێڕا و لە ئاسۆی دوورەوە ڕووناکاییەکی دووروورێژم بینی، ئەوکاتە زانیم کە بەسەر ئاسمانی دەریای ڕەشەوەین و نزیک لە کەناراوەکانی سۆڤێت دەفڕین، بەڵام فڕۆکەکە بەرەو ڕاست بایداوەتەوە، پاشان ستوونی بەرەو خوارەوە ڕۆیشت و فڕۆکەوانەکە، کە ڕوخساری ئارەقاوی لە تیشکی ڕووناکیی گڵۆپی کابینەکە و دووپشکەکاندا دەدرەوشایەوە، لەپشت شووشەکەوە لە تاریکیی دەرەوە ڕاماوە و لە نەخافڵ هاواری کرد: خۆتان توندبگرن، چونکە لەسەر ئاو دەنیشینەوە.

من خێرا توند بەو دەسکەوە نووسام، کە لە تەنیشت کورسییەکەم بوو، هەلیکۆپتەرەکە بەخێرایی خۆی بە ئاوەکەدا کێشا و فشاری ئەو نیشتنەوە لەکاوە ئەوەندە بەهێزبوو، هەمووومان بەدەمدا کەوتین و هەلیکۆپتەرەکەش دوای بەرکەوتنی بە ئاوەکە، ڕاتەکا و سەرەتا پێموابوو بێگومان هەلیکۆپتەرەکە سەرەوبن دەبێت، بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانی، هەلیکۆپتەرەکە وەک بەلەم ڕاوەستاوە و پاشان هێمن و بە بێجووڵە لەسەر ئاوەکە لەنگەری گرت.

دوای ئەوەی هەلیکۆپتەرەکە لەسەر ئاوەکە نیشتەوە، عەدەد دۆشکەکە، دەرگاکەی کردەوە و هەوا و بای سارد و کزەبا، کابینەکەی پڕکرد. عەدەد دۆشکەکە دوای کردنەوەی دەرگاکە چووە دەرێ و پەتی ئەو بەلەمە پلاستیکییەی کردەوە، کە بە هەلیکۆپتەرەکەوە بەسترابوو. دوای کەمێک بەلەمە پلاستیکییە گەورەکە کەوتە سەر ئاو و ئێمە یەک یەک چووینە دەرەوە و سواری بەلەمەکە بووین. دوو کەسی ئەڵمانی و دووی ڕووسی، کە سیخوڕی ئەڵمانیا بوون، لە بەلەمێکی دیکەدا دانیشتن و فەرمانیان پێکردین، کە لە کەنارەکە بەجیا دابەزین و هەمoomان بەیەکەوە ماڵاواییمان کرد و بەلەمی ئەو چوار کەسە لە تاریکییەکەدا بزربوو. پاشان نەک هەر ئەو چوار کەسە نەگەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا، بەڵکو شوێنەواریکیشیان دەست نەکەوت، من نەمزانی ئەوانە لە کاتی نزیکبوونەوە لە کەناراوەکانی سۆڤێت، لەلایەن پۆلیسی دەریایی دەستگیرکراون، یان کە گەیشتوونەتە کەنار، ڕووسەکان دەستگیریان کردوون. بەڵام بێگومان نەیانتوانی ئەرکەکەیان جێبەجێ بکەن، واتا ستالین بکوژن و نیشانە و هەواڵێکیان دەست نەکەوت.

ئەو بەلەمەی من سواری ببووم، چوار کەسی دیکەشەی تێدابوون، کە دووانیان ئەڵمانی بوون و دووانەکەی دیکە فڕۆکەوانەکە و عەدەد دۆشکەکەی

هەلیکۆپتەرەکە بوون، فڕۆکەوانەکە پێش بەجێهێشتنی فڕۆکەکە، دوو بۆمبی گەورەی لە هەردوو باڵی فڕۆکەکە بەست و ئەڵقەکانی ڕاکێشا. ئەو بۆمبانە بە شێوەیەک درووستکرابوون، کە نە پێویستیان بە ئاگر هەبوو، نە بە پەیوەندیی ئەلەکتریکی و لەجیاتی کەپسوولێکی گچکەیان لەناودابوو، کە بە داگرتنی دەسکی بۆمبەکە، هەرەمێکی نوک تیژی ناو ئەو کەپسولە دەچووە ناو پێکهاتەی ئەسیدەکە و دەیشکاند و ئەسیدەکە دڵۆپ دڵۆپ بەناو بۆڕیەکی باریکدا دەڕژایەسەر پارێزەرێکی گچکەی دیکە و دەبووەهۆی سووتاندن و تەقینەوەی بۆمبەکە. هەرچۆنێک بێت، دوای ئەوەی فڕۆکەوانەکە بۆمبەکانی دانان و سواری بەلەمەکە بوو، خێرا کەوتە سەوڵلێدان و ئەوەندەی توانیمان لە هەلیکۆپتەرەکە دوورکەوتینەوە و نزیکەی دوای پەنجا خولەک، بە حاڵ و باڵ گوێمان لە دەنگی تەقینەوەیەک بوو، گڕێکی شینی کاڵ لەسەر ئاوەکە درەوشایەوە و هاوڕێ ئەڵمانییەکەم بۆ دیتنی دیمەنی نوقمبوونی هەلیکۆپتەرەکە لە جێی خۆی لاخێز بوو. ئەو کاتەی ئەو پیاوە لە شوێنەکەی هەستا، قورساییەکەی لای چەپی بەلەمەکەی لاسەنگکرد، هاوسەنگیی بەلەمەکەی تێکدا و بە هاتنەپێشی شەپۆلێکی گەورە، بەلەمەکە بەتوندی تەکانی خوارد و بە لایەکدا لاربووەوە، ئەوە

وایکرد هاوڕێ ئەڵمانییەکەشم هاوسەنگیی خۆی لەدەست بدات و بکەوێتە ناو ئاوەکەوە. کە پیاوەکە کەوتە ناو ئاوەکەوە، هەموومان وامان  بە خەیاڵدا هات، کە ناتوانین ڕزگاری بکەین و بای توند و شەپۆلی گەورە و تاریکیی شەویش ببوونە سەربار، بەڵام بە پێچەوانەی خەیاڵمان دوای چەند چرکەیەک، هەرسێکمان دەستمان درێژکرد و شانی هاوڕێکەمان گرت، کە بە دەستی توند ڕۆخی بەلەمەکەی گرتبوو، هەڵمانکێشایە سەرەوە.

ئەگەر ئەو پیاوەمان ڕزگارنەکردبا، بێگومان لە داهاتوودا ویژدانمان نیگەران دەبوو، چونکە وازمان لێهێنا لە ئاوەکەدا نوقم بێت و سەرزەنشتی  خۆمان دەکرد، بەڵام کە هەڵمانکێشایە سەرەوە، لەوپەڕی واقوڕماویدا هەستمانکرد مردووە. مردنەکەی نە بە هۆی خنکان بوو، نە بە بۆنەی زەربە ویکەوتن، بەڵکو بەستنی ئاوەکە بووەتەهۆی مردنی و هاوڕێکەمان هەر کە کەوتووەتە ناو ئاوەکەوە، بەهۆی سەکتەی لەناکاو و ساردی ئاوەکە، دڵی لەجووڵە کەوتووە، بەو شێوەیە یەکەمین ئەندامی گرووپەکەمان، کە نێردرابووین ستالین تیرۆربکەین مرد، چونکە هیچ کارێکمان لە دەست نەدەهات، جلەکانیمان لەبەر داکەند، هەموو کاغەز، بەڵگەکانیمان دڕاند و پاشان لاشەکەیمان هەڵدایە ناو ئاوەکەوە.

چاکەی سیخوڕان لەوەدایە، یەکەم دڵێکی خاوەن بەزەییان نییە و دووەم باکیان بە گیانیان نییە، سێیەم تا ئاستی مردن بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکەیان هەوڵدەدەن، ئەگەر من سیخوڕ نەبووم و ئەرکێکی گرنگم نەدەبوو، لە مردنی ئەو هاوڕێیە بەو ڕێگەیە و ئەو بارودۆخە خراپ بە ژان دەبووم، بەڵام لەو کاتەدا، واتە ئەگەر ئەرکێکی وەهام نەدەبوو، بۆیە نەدەچوومە ناو دەریا و هاوڕێیەکەم بەو شێوەیە گیانی نەدەسپارد، بەڵام چونکە ئەرکم پێ سپێردرابوو، ئەرکەکەم پێ لە سەرووتری ژان و ئازار و ئارەزووی کەسیمەوە زانی.

دووریی ئێمە لەو خاڵەوە تا کەنارەکە نزیکەی هەشت میل بوو، چوار سەعاتی تەواوی خایاند تا بە سەوڵلێدانی بەردەوام، گەیشتینە ئەوێ و لەگەڵ شەبەقی بەیانی، لەبن تاتەبەردەکان، کە وەک ئەشکەوت لە کەنارەکە بوون، دانیشتین و تا چەند خولەکێک دووربین لە سەرماوسۆڵە و کزەی بایەکە. تەمێکی چڕ کەنارەکەی داگرتووە، چڕیەکەی بە ئاستێک بوو، بەزەحمەت بەر پێی خۆمان دەبینی و هەرچەند تەمەکە کارەکەی ئێجگار قورسترکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لە چەند ڕوویەکەوە سوودی هەبوو. وەک توانیمان بەبێ ئەوەی پاسەوانەکانی کەنارەک بمانبینن، دابەزین.

جلوبەرگی هەرسێکمان بەهۆی سەرما و شەختەوە ببوونە بەرد و ڕەق هەڵاتبوون، لەو کاتەدا کە هەردوو هاوکارە ڕووسییەکەم بەلەمەکەیان دەدڕاند و پارچە پارچەیان دەکرد، من بڕێک چیلکەوچەوێڵی وشکم دۆزییەوە، ئاگرم کردەوە، هەرسێکمان لە دەوری ئاگرەکە خڕبووینەوە، خۆمان گەرم دەکردەوە و پاشان هەموومان جلەکانمان لەبەر خۆمان داکەند، بەو تاتەبەردەی بەرامبەر ئاگرەکەمان دادان تا وشکبوونەوە و ئەوجا نانمان خوارد، جگەرەمان کێشا و قسەمان لەبارەی قۆناغی داهاتووی ئەرکەکەمانەوە کرد.

یەکەم هەنگاو کە دەبووایە ئەنجامی بدەین، ئەوەبوو شوێنی کۆبوونەوەی سەرانی هەر سێ وڵات، واتە ستالین و چەرچڵ و ڕۆزفلێت، بدۆزینەوە، فڕۆکەوانەکە کە وتم بەڕەگەز سۆڤیێتی بوو، بەڵام کاری بۆ ئەڵمانییەکان دەکرد، نەخشەی وردی (کەریمە)ی لەبەرامبەر خۆی پانکردەوە و دوای کەمێک تاوتوێکردن ڕایگەیاند، کە ئێستا ئێمە نزیکەی 30 کلیۆمەتر لە باکووری شاری (سواستوپل)ین و پاشان وتی: لە سەرەتای شەڕەوە، وەک ئەفسەری فڕۆکەوانی سوپای سوور خزمەتی کردووە، بۆیە تەواو شارەزای ئەو شارەیە و کاتی جوگرافیشی بەباشی دەزانێت.

هەرسێکمان ئـەوەی پێویستمان بـوو لەگەڵ خۆمان بردمان و پاشان هەریەکەمان بۆمبێکی گچکەمان لەژێر جلەکانمان ڕێک لەسەر سنگمان دانا و جل و پاڵتۆکەی خـۆمـان کـردەوەبـەر،پـاشـان هـەریـەکـەمـان تفەنگەکەی خۆمان کە هەڵمانگرتبوو، لەژێر چاکەتە چەرمییەکەمان شاردماننەوە، بە ورەی جووڵان بەرەو ئامانج لە شوێنی خۆمان هەستاین. فڕۆکەوانەکە بە بیر و هۆشەوە ڕووی لە من کرد، وتی: ئێمە هەرسێکمان سیخوڕین، بەڵام لەڕوانگەی نەتەوەییەوە لە یەکتری جیاوازین، بە مانای من و ئەو کەسە (ئاماژە بە عەدەد دۆشکەکە)، ڕووسیین، بەڵام تۆ ئەڵمانی و هەر لەبەر ئەوە هەرچەند تەواو شارەزای زمانی ڕووسیت، ناتوانیت بە شێوەزاری ڕووسەکان قسەبکەیت و زمانی ڕووسی بە شێوەزاری ئەڵمانی قسەی پێدەکەیت و لەوانەیە ئەو کارە تووشی سەرئێشەمان بکات.

سەرم لەقاند و وتم: ڕاستە و هەرچەند هەرسێکمان سیخوڕی ئەڵمانین و بە هاوڕێیەتی ژمارەیەکی دیکە بۆ ئەرکێکی گرنگ هاتووینەتە سۆڤێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر یەکێکمان بکەوێتە داوەوە، لەوانەیە دەمی خۆی پێنەگیرێت و ئەوانی دیکەش ئاشکرابکات، لەبەرئەوە من هاوڕاتم و دەزانم زمانی ڕووسی بە شێوەزاری ئەڵمانی گۆدەکەم، ئەگەر قسە لەگەڵ ڕووسییەک بکەم، دەزانێت من ئەڵمانیم،

بەڵام ئایا ئەو کارە چارەسەری هەیە؟ پێموایە واباشترە خۆم لاڵ نیشان بدەم. لەناکاو ڕووی فڕۆکەوانەکە کرایەوە و وتی:

– من بیرم لە ڕێگەیەکی باشتر کردووەتەوە، نەک تەنیا هیچ کەسێک گومانت لێ ناکات، بەڵکو هەموویان ڕێزت لێدەگرن. بەسەرسامییەوە پرسیم: مەبەستت چییە و ڕووسەکان چۆن ڕێزم لێدەگرن؟ فڕۆکەوانەکە بێئەوەی نقەی لێوەبێت و وەڵام بداتەوە، زالکی جانتای هاوکارییە سەرەتاییەکەی خۆی کردەوە، لەفافێکی لەناوی دەرهێنا و لە سەر و ڕوخسارمی پێچا، کە جگە لە لووت و چاوم، هیچ شوێنێکی دیکەی دەموچاوم دیارنەبوو، تێگەیشتم بوومە شتێکی پێکەنیناوی، چونکە دووانەکەی دیکە لە پرمەی پێکەنینیان دا و فڕۆکەوانەکە بەشادییەوە وتی: باشە، ئێستا ئیدی تۆ لە سەربازێکی ئازا دەچی کە لە ڕیزی پێشەوە لەگەڵ دوژمنەکانی شەڕی کردووە و لە کاتی بەرگری لە خاکی سۆڤێت، سەروگوێلاکت بریندار‌بوون، بەهۆی برینداری و تەداوی و پێچرانی دەمت، ناتوانیت قسە بکەیت و ئەگەر یەکێک قسەی لەگەڵ کردی، ئێمە لەجیاتی تۆ وەڵام دەدەینەوە.

شانەکانم هەڵتەکاندن و پاشان بە ئاڕاستەی پێچەوانەی دەریا ڕێمانکرد. تا ڕاددەیەک دوای نیو سەعات گەیشتینە

جادەی کەنارەکە و ملی ڕێگەیەکمان گرتەبەر، کە بە شاری (سواستوپول) کۆتایی دەهات، بە درێژایی ڕێگەکە زانیم ئەو فڕۆکەوانە (ڤاسیلی کوچیوک)ەو لە سەرەتای شەڕەوە فڕۆکەوانی هەلیکۆپتەری جەنگی سۆڤیێت بووە، بەڵام پاشان لە بەرەی شەڕ ڕایکردووە، بە هەلیکۆپتەرەکەی خۆی لە ساڵی 1943، لەپشت کەشتیی ئەڵمانییەکان نیشتووەتەوە و پەیوەندی بە گرووپی سیخوڕانی ئەڵمانییەوە کردووە، عەدەد دۆشکەکە کە (جۆزێف ستپانۆف)ی ناوبوو، لەو کەشتییە کاری کردووە، پێش ئەو بووەتە دیلی ئەڵمانییەکان و لە قازانجی ئەوان کاری دەکرد.

بۆ یەکەم جار من لە ناخەوە هەستم بە دڵنیایی و متمانەیەکی زۆر کرد، بە هەردوو هاوکارەکەم و زیاتر لە سەعاتێک ڕێگەکەمان بەرەوپێش بڕی، تا ئیڤایەکی خۆراکی سوپا گەیشت و ئێمە وەک سەربازی سۆڤیەتین و دەمانەوێت بۆ شار بڕۆین، سواری کردین و لەجێدا کەمتر لە سەعات و نیوێک، گەیشتینە شارەکە.

لە وڵاتانی خۆرئاوا، وەک ئەمەریکا و ئەوروپا و وڵاتانی تر، ڕۆژانە تەلارسازی پێشدەکەوێت و هەڵدەکشێت و خانوو و تەلارەکان لەسەر بنەمای ئابووری درووستدەکرێن، بەو مانایە کە لەجیاتی داگیرکردنی زەوی بۆ درووستکردنی خانوو، لەجیاتی هەوا داگیردەکەن و تەلارەکان بەرزتر

دەکەنەوە، ئاسمان ئـازاردەری گـەورە بینادەکەن، بەڵام من لەو کاتەدا شاری (بواستوپول)م بینی، کە یەکێکە لە شارە قەرەباڵغەکانی وڵاتی سۆڤێت، زانیم لەویێ لەجیاتی ئەوەی لەسەر گریمانەی پەنجا نهۆم بیناکراوە و ئاسمان ئازاردەر درووستکراوە. ئەو پەنجا نهۆمە بە شێوەی جیا و کراوە درووستکراون، خانووە یەک نهۆمەکان بە دووریی مامناوەند لە یەکتری درووستکراون. زۆربەیان داڕماون و لە شەڕدا سووتاون، ئەو بەڵایە ئەڵمانییەکان بۆ داگیرکردنی بـەنـدەرەکـە بـەسـەری هێناون. (ڤاسیلی) فـڕۆکـەوان بە شوفێری ئیڤایەکەی وت بوەستێت و دوای وەستان ئێمە هەرسێکمان دابەزین و کە ئیڤایەکە دوورکەوتەوە، خێرا ڕامانکردە خانوویەکی وێرانەوە (ڤاسیلی) وتی: ئێوە ئەو دووانەتان لەو کاولەدا بمێننەوە و من دەچم چاوێک بە بارودۆخەکەدا دەخشێنم.

سەرنج بەوەی ئەو پیاوە شارەزای بارودۆخی شارەکە بوو، ئێمەی بەجێهێشت، ڕۆیشت، من و (جۆزێف ستپانۆف) هەلەکەمان قۆستەوە و نووستین و دوای سێ سەعات (ڤاسیلی) گەڕایەوە، ئێمەی لە خەو خەبەرکردەوە، هەردوو بووخچەکەی کردەوە کە لەگەڵ خۆی هێنابوونی، یەکێکیان نـان و باسترمە و ئـەوی دیکە قاتێک جلی پاکوخاوێنی ئەفسەرانی سۆڤێتی بوو، سەرشانەکانی پان و قەیتانی

تایبەتی پێوەبوو، (ڤاسیلی) دوای نانخواردن وتی: ستالین، چەرچڵ، ڕۆزفلێت لە کۆشکی (لیوادیا)ی نزیک شاری (یالنا) کۆدەبنەوە، کۆنفرانسی سەرانی هەرسێ وڵات لە ڕۆژی شەممەی ڕابردووەوە دەستی پێکردووە.

کاتێک ئەو هەواڵەم بیست، زۆر سەرسام بووم و زەندەقم چوو، چونکە ئەو ڕۆژە هەینی بوو نیشانیدەدا، کە کۆنفرانسی سەرانی وڵاتان هەفتەیەکی تەواو دەخایانێت، چونکە لەوانەیە ئەو کۆنفرانسە تەواوبێت، ناچاربووین کە دەستبەجێ و بەبێ خۆخافڵاندن دەستبەکاربین. شاری (سواتوپول) 130 کیلۆمەتر لە شاری (یالتا) دووربوو، واتە شوێنی سازدانی کۆنفرانسەکەیە، (ڤاسیلی) نەخشەکەی خۆی لە گیرفانی دەرهێنا و وتی: بە هەرشێوەیەک بووە ئەمشەو بگەینە شار (یالتا)، ڕۆژانە لەنێوان سەعات سێ، یان چواری دوانیوەڕۆ چەندین ئیڤای خۆراکبارکردوو بێرەدا تێدەپەڕن تا بۆ شاری (ئالوپکا) بڕۆن و ئەو شارە لێرەوە 30 کیلۆمەتر دوورترە، دەبێت ئێمە لەگەڵ یەکێک لەو ئیڤایانە بچینە ئەو شارە و لە شاری (ئالوپکا)، نەخۆشخانەیەکی عەسکەری هەیە، کە چاودێریی سەربازە بریندارەکان دەکەن.

(ڤاسیلی) دوای تەواوکردنی قسەکانی بەتەوسەوە پێکەنی و ئاماژەی بەسەروکەللەی پێچراوی من کرد و بەردەوام

بوو: ئێمە بەو ناونیشانەی  کە تۆ برینداری و دەبێت بچیت بۆ شاری (یالْتا)، بە ئەمبولانسێک دەچین بۆ ئەوێ، من لە شاری یالتا شوێنێکی باشم بۆ مانەوە ڕەچاوکردووە، دایک و خوشکم لە دەرەوەی شارەکەدا دەژین.

بەحەپەسانەوە چاوێکم بە (ڤاسیلی)دا گێڕا و پرسیم: کەوایە تۆ دایک و خوشکت لە سۆڤیەتن، بۆچی پەیوەندیت بە تیمی سیخوڕانەوە کردووە؟

(ڤاسیلی) سەری بەردایەوە، ئاخێکی هەڵکێشا و وتی: لەبەرئەوەی هەردوو براکەم لە شۆڕشی ساڵی 1938، بە بڕیاری ستالین لەسێدارەدران.

ئەو لەفافەی لە دەمم هەڵاندبوو، ئەوکاتە کردبوومەوە، ڕامکێشایە دواوە و وتم: ڤاسیلی پێم بڵێ تۆ چۆنت زانی، کە کۆنفرانسەکە لەکوێ و کەی سازدەدرێت؟

(ڤاسیلی) بزەیەکی کرد و وتی: کە ئێوەم بەجێهێشت و چوومە شاری (سواتوپول)، یەکسەر چوومە بەرگدروویەک و دەستێک یونیفۆرمی گونجاوی ئەفسەرانی ئاساییشی ناوخۆی سۆڤێتم کڕی و لە کاتی قسەکردندا لە بەرگدرووێکەم پرسی کۆنفرانسەکە لەکوێ سازدەدرێت.

-چۆن ئەو کارەت بە خەیاڵدا هات؟

- بەرگدرووەکە سکاڵای لە دەست بارودۆخی خۆی دەکرد و دەیوت، کە لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا زۆربەی

ئەفسەران و سەربازەکان بۆ چاککردن و دروونی جلوبەرگەکانیان سەردانی دەکەن، جاریکیش بردوویانەتە کۆشکی (لیڤادیا) تا جلوبەرگی تەواوی خزمەتکارانی کۆشکەکە چاکبکاتەوە، بەو شێوەیە من بەو کورتە لێکۆڵینەوەیە، تێگەیشتم کۆنفرانسەکە لە ڕۆژی یەکشەممەی ڕابردووەوە لە کۆشکی (لیڤادیا)ی هەڵکەوتەی شاری (یالتا)، دەستی پێکردووە، هێشتا ئەنجامی گفتوگۆی سەرانی هەرسێ وڵات ڕانەگەیێنراوە.

سەعات نزیکەی 2ی دوانیوەڕۆ بوو، کە (ڤاسیلی) یونیفۆرمی ئەفسەرانی ئاساییشی ناوخۆی پۆشی و پەتێکی زەردیشی لە قۆڵی چەپی کرد، پاشان هەرسێکمان ڕێمانکرد و بەرەو شاری (سواستوپول) کەوتینەڕێ. لەو شارەدا کەس گوێی پێنەداین، چونکە یونیفۆرمی ئەفسەرانی ڕووسیمان لەبەردابوو، تەنیا ژنەکان کە سەروکەللەی پێچراومیان بە لەفاف دەبینی، لە جێی خۆیان دەوەستان و هێمای خاچیان لەسەر نێوچاوانیان دەکێشا. سەرئەنجام گەیشتاینە گەنجینەی خۆراکی سوپا و (ڤاسیلی) چووە ژوورەوە و دوای کەمێک گەڕایەوە، پێی وتین کە بچینە حەوشەکەوە.

ژمارەیەکی زۆر سەرباز سەرقاڵی بارکردنی سندوقی خواردەمەنی بوون، من و (جۆزێف)ی عەدەد دۆشکەش

لەسەر گونییەشەکرەکان دانیشتین و چاوەڕوان بووین، دوای کەمێک (ڤاسیلی) لێمان نزیکبووەوە و وتی: ڕەزامەندیی فەرماندەی ئەفسەرەکانم وەرگرتووە ئیڤایەک بمانگەیەنێتە شاری (ئالوپکا)، پاشان هەرسێکمان سواربووین و ڕێمانکرد.

هێشتا ئیڤاکە چەند کیلۆمەترێکی نەبڕیبوو، لەناکاو وەستا و 10 سەربازی چەک بەدەست گەمارۆیان دا و مقەدەمی سوپا داوای ناسنامەی لە سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە کرد. لەو کاتەی کە من بۆ دەرهێنانی ناسنامەکەم دەستم لە گیرفان ڕۆکردبوو، هەموو لەشم وەک مێژۆک دەلەرزی و هەرچۆنێک بێت دەرمهێنا و لەگەڵ کارتێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی، کە بە ناسنامە و مۆڵەتی سەربازی ئەژماردەکرا، دامە دەستی (ڤاسیلی)، (ڤاسیلی) توند لێی وەرگرتم و دای بە مقەدەمەکە، وتی جەنابی مقەدەم پەلەبکە و پێویستە ئێمە چەندی زووە ئەو داماوە بگەیەنینە نەخۆشخانە.

مقەدەم لێی هەڵڕوانیم و بە داوای لێبووردنەوە پرسی: ئایا برینەکەی ئەو داماوە ترسناکە؟

(ڤاسیلی) بە تۆنێکی کوڵ هەستا و وتی: جەنابی مقەدەم گوللە بەسەختی زیانی پێگەیاندووە، سەرەڕای ئەوەی دەموچاویشی زۆر برینداربووە، گوللەیەکی دیکەش شوێنێکی هەستیاری لەشی پێکاوە، پێموانییە ئەو داماوە

ئەگەربێتو تا دوا تەمەنیشی زیندووبێت، بتوانێت ژن بێنێت.

مقەدەم ناسنامەکانی پێداینەوە و بیستم، کە بە یەکێک لە هاوەڵانی خۆی دەڵێت: بەو شێوەیەی ئەو پیاوە دەڵێت ئەگەر گولله سەروگوێلاکی ئەو سەربازەی پێکابێت، تەنانەت ئەگەر گوللەی دووەم شوێنێکی هەستیاری لەشیشی نەپێکابێتو نەیدەتوانی ژن بێنێت، بـەڵام خوا چۆن زانیویەتی ئەو پیاوە بە سەروگوێلاکی ناشیرینی ناتوانێت هاوسەرگیری بکات، هەمیشە نیگەران و سوێی دەبێتەوە، بۆیە گوللەیەکی دیکەش ئەوێی پێکاوە تا لە هەموو ڕوویەکەوە بێخەم بێت.

ئەفسەرەکە قاقا پێکەنی و پاشان مقەدەم لە (ڤاسیلی) پرسی: دەتوانی بڕیاری گواستنەوەی ئەو بریندارەم بۆ نەخۆشخانەی (ئالوپکا) نیشان بدەی؟

یەکسەر دڵم داخورپا و (ڤاسیلی) دەستی بە پشکنینی گیرفانەکانی خۆی کرد، ئەوەندە درێژەی پێدا تا مقەدەم تاقەتی چوو، وتی: پێویست بە بڕیاری نەخۆشخانە ناکات. دەی، دەتوانن بڕۆن.

کاتێک ئیڤاکە، گەیشتە شاری (ئالوپکا)، تا ڕاددەیەک دنیا تاریک داهاتبوو، بە ناوەڕاستی شاردا تێپەڕین و لە بەردەم نەخۆشخانەکە وەستاین، و (ڤاسیلی) و (جۆزێف) دەست و لاقیان گرتم و لە ئۆتۆمۆبێلەکە هێنایانمەخوار و ئیڤاکە دوورکەوتەوە و ئێمە بێئەوەی بچینە ناو نەخۆشخانەکە،

بەپەلە بەرەو ڕێگەیەک، کە بە شاری (یالتا) کۆتایی دەهات، ڕۆیشتاین و وەک تیسکەی تفەنگێ دەڕۆیشتین و ئەو ڕێکردنە نزیکەی دوای نیو سەعات گەیشتە ئەنجام، ئێمە بە بێ بەرکەوتە بە پۆلیس و پاسەوانان لە شاری (یالتا) نزیکبووینەوە، (ڤاسیلی) بۆ زەوییەک ڕێنمایی کردین، کە ماڵی دایک و خوشکەکەی لەوێ بوو.

نیو سەعات لە نیوەشەو تێپەڕیوە و تاریکی و نوتەکی باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشابوو، دوای کەمێک گەیشتینە بەردەم تەلارێکی ڤێلائاسا، کە لە یەکێک لە پەنجەرەکانی ڕووناکییەک بۆ دەرەوە شەوقی دەدایەوە، من و (جۆزێف)، لەبن دارێک وەستاین و (ڤاسیلی) بە پارێزەوە بەرەو ڤێلاکە ڕۆیشت و مستێکی بە پەنجەرە ڕووناکەکەدا کێشا، پاشان بە شێوەیەک ڕووخساری بە شووشەکەوە نووساند، کە لە ژوورەکەدا بینرا و لەناکاو دەنگی هاواری شادی و خۆشی لەناو ماڵەکە هەستا، (ڤاسیلی) چووە ژوورەوە و دوای چەند خولەکێک پەردەی بەردەم پەنجەرە ڕووناکەکە لادرا، بەپارێزەوە گەڕایەوە و (ڤاسیلی) پەیوەندی پێوەکردین، پاشان هەرسێکمان چووینە ژوورێکی جوان و ڕازاوە و مامناوەندییەوە، کە دوو ژنی بەدبەخت و پرچدرێژ لە کاتێکدا چاویان بەهۆی فرمێسکەوە دەبریسکایەوە، لەناویدا دەبینران. یەکێک لەو دوو ژنانە

دایکی (ڤاسیلی) بوو، قژی خۆڵەمێشی و ڕوخساری تێک قوپابوو، ئەوی دیکە خوشکی هاوڕێکەمان بوو، بە (لوبا) بانگدەکرا و کچێکی تەمەن 20 ساڵە و باڵابەرز بوو.

لە کاتێکدا ژنەکان نانی ئێوارەیان ئامادەدەکرد، چایان دەمدەکرد، (ڤاسیلی) بۆی باسی بەسەرهاتی هەڵاتن و پەیوەندیکردنی بە ئەفسەرانی حیزبی نازی ئەڵمانیاوەی کرد و پاشان دایکی وتی: ئاساییش چەندجارێک هاتووەتەماڵیان و پرسیاری ئەویان کردووە و لە ئاکامدا ئاساییشیش وەک ئەو دوو ژنە قەناعەتی کردووە. کاتێک کە (ڤاسیلی) هۆی گەڕانەوەی خۆی بۆ سۆڤێت پێ وتن و ئەرکەکەی ئاشکراکرد. یەکسەر ئەو دووژنە ئەژنۆیان شکا و خۆشی و شادیان بارگەوبنەی تێکنا و دایکی لە پڕمەی  گریانی دا و (لوبا)ش هەوڵیدا لەوانەیە براکەی واز لە بڕیارەکەی بهێنێت، وتی کە شاری (یالتا) پڕە لە سەرباز و پۆلیسی نهێنی، بە شێوەیەک پاسەوانی کۆشکی (لیوادیا) دەکەن، کە ناوەندی کۆنفرانسەکەیە و تەنانەت مێرولەیەکیش بەبێ سەرنجڕاکێشان، ناتوانێت بچێتە ژوورەوە.

کە (ڤاسیلی) ئەو قسانەی لە دەمی خوشکەکەیەوە بیست، وتی: من بڕیاری خۆم داوە،  بە هەرشێوەیەک بووە نەخشەی خۆم بە سەرکەوتن کۆتایی پێدێنم، لەبیرتان چوو چییان بەسەر (گوپشا) و  (ئالسی) هێنا؟

خوشکەکەی (ڤاسیلی) یەکسەر ڕەنگی پەڕی و بە دەنگێکی پاڕانەوەئاساوە، وتی: زۆر باشە منیش یارمەتیتان دەدەم. بەیانی زوو قسە لەگەڵ (پارامانۆف) دەکەین، ئەو ڕێنماییمان دەکات.

(ڤاسیلی) سەری لەقاندو وتی: بەیانی زۆر درەنگە و ئێمە کاتمان نییە، واباشترە هەر ئێستا قسە لەگەڵ (پارامانۆف) بکەین، کە یەکێکە لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی باوکم.

(لوبا) بێ ئەوەی ورتەی لێوەبێت، چووە ژووری نووستنەوە و لە ماوەی کەمتر لە 10 خولەک، گەڕایەوە، بینیم تەواو خۆی پۆشتەوپەرداخ کردووە، ملپێچی لەملی ئاڵاندووە و چەند بەتانی و دۆشەک بە دەستییەوە دەبینرێت، لەسەر زەوییەکە جێگەی بۆ من و جۆزیچف ڕاخست، تا ڕاددەیەک پێش ئەوەی ئەو و (ڤاسیلی) لە ژووورەکە بچنەدەرێ، من خەو بردمییەوە.

***

بەهۆی بەتوندی ڕاتەکاندنم لە خەو ڕاپەڕیم و بینیم (لوبا) لەسەر سەرمەوە وەستاوە و بەحەپەساوییەوە تەماشای سەعاتەکەی مەچەکی خۆی دەکات، زانیم سەعات چواری بەیانییە. (جۆزێف) خەبەری ببووەوە، (لوبا) بەسەر

ئاماژەی بە دەرگاکە کرد و ئێمە بەدوایدا چووینەدەرەوە، لە کاتی چوونەدەرەوە وتی: ڤاسیلی ئیشی بە ئێوەیە.

ئەو کاتە شەقامەکانی شاری (یاڵتا) چۆڵ بوون، بێجگە لە ئێمە سێ کەس، هیچ کەسی دیکە لە شەقامەکە نەدەبینرا. لە بەرامبەر تەلارێکی مۆدێرن وەستاین و (لوبا) دەرگاکەی کردەوە، بە دالانێکی فەرشکراو و جواندا تێپەڕین، کاتێک لە کۆتایی ڕاڕەوەکە گەیشتینە دەرگایەک، (لوبا) وەستا و لە دەرگاکەی دا و پاش کەمێک پیرەمێردێکی کورتەبالا، کە بەهۆی تەمەندرێژییەوە پشتی کۆمابووەوە، دەرگاکەی کردەوە و چووینە ژووری پڕ لە قەنەفەی سەرسامکەر. دیوارەکانی بە کاغەزی لەزگە ڕازێنرابووەوە، زەوییەکەی بە فەرشی گرانبەها داخرابوو، (ڤاسیلی) هاوڕێ دڵسۆزەکەی باوکی ناساند، کە بازرگانی فەرش بوو. بتڵێک ڤۆدکا (عارەقی ڕووسی) لەسەر مێزەکە بوو، لەو کاتەی (ڤاسیلی) ئەرکەکەمانی دیاریدەکرد، ڤۆدکام خواردەوە.

(ڤاسیلی) وتی: کۆشکی (لیوادیا) تایبەت کراوە بە شوێنی حەوانەوەی ڕۆزفلێت، سەرۆککۆماری ئەمەریکا و یاوەرانیان و ستالین و یاوەرانیشی لە ڤێلای (کوریس)، کە چەند کیلۆمەتر دوورترە بەسەردەبەن و چەرچڵ سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا لە ڤێلایەکی دیکە مەنزڵی خستووە، ئەو سێ سەرانی وڵاتان، هەمووڕۆژێک دوانیوەڕۆیان لە کۆشکی

(لیوادیا) ڕاوێژدەکەن، دوابڕیاری سەران دوێنێ دوای نیوەڕۆ دراوە و ئەمڕۆ ئەوێ بەجێدەهێڵن، تەواوی ئەوانەی لە کۆشکی (لیوادیا) نزیکدەبنەوە، بەوردی دەپشکێندرێن و هیچ کەسێک بەبێ بەدەستەوەبوونی مۆڵەتی نووسراو ناتوانێت بچێتە ژوورەوە، جەنابی (پارامانۆف)، کە هاوڕێ کاربەدەستەکانی بۆمان ڕێکدەخەن، مۆڵەتی نووسراو وەربگرین و نەخشەی کۆشکەکەشمان پێدەدەن.

لێرەدا (ڤاسیلی) بێدەنگ بوو، پاشان وتی: بەڵام خەوشی کارەکە لەوەدایە، کە ناتوانین بۆ چووە ژوورەوە جگە لە مۆڵەتنامەیەک زیاتر وەربگرین و تەنیا یەکێک لە ئێمە دەتوانێت بچێتە ناو کۆشکەکەوە، لە ڕیزی بینەراندا دابنیشێت و ئەو یەک کەسەش بۆ خۆم دەبم.

من و (جۆزێف) زمانی ناڕەزاییمان کردەوە، بەڵام (ڤاسیلی) بەئەدەبەوە قسەکەی پێ بڕین و وتی: بەرپرسیارێتیی کۆمەڵی دووەم، کە ئێوەش لەوانن و من فەرمانم پێکراوە دەبێت کارەکان ڕێکبخەم و بێجگە لەوانە من لە هەموو ڕوویەکەوە لە ئێوە ئامادەترم و وێڕای ئەوەش من نیازی تۆڵەم هەیە.

کاتێک ئەو قسانەم لە دەمی (ڤاسیلی) بیست، هەم من و هەم (جۆزێف)، تێگەیشتین بگرەوبەردە بێسوودە و ئەو پیاوە ڕاستدەکات و جگە لەوەی بەرپرسمان بوو، خودی

خۆیشی خوازیاری ئەنجامدانی ئەو کارەیە، ئەوەشمان دەزانی ئەگەر لە جێبەجێکردنی مەبەستی سەرکەوتووبێت، یەک لە هەزار ئەگەری بەزیندوویی مانەوەی هەیە، چونکە کەسێکە ئەرکەکەی کوشتنی ستالین بوو. دەبوو ئەرکەکەی بە بۆمب ئەنجامبدات و ئەگەر لە کاتی تەقینەوەی بۆمبەکە بۆ خۆشی نەدەکوژرا، لەسەدا سەد پۆلیس دەستگیریان دەکرد، یان دەیانکوشت. هەرچۆنێک بێت، دوای ئەوەی بڕیاربوو (ڤاسیلی) وەک ئەفسەری بینەر بچێتە کۆشکەکەوە، ئێمە نەخشەی بڕیارەکەمان ڕێکخست و نەخشەکەمان بەو شێوەیە بوو، دوا ئەوەی (ڤاسیلی) چوو بۆ ناو کۆشکەکە، (جۆزێف) ئیڤایەک بدزێت و لە نزیک ماڵی دایکی (ڤاسیلی) بیوەستێنێت، بەهۆی ئەو ئیڤایەوە ڕادەکەین، لە ڕێگەی وشکانییەوە دەچینەوە ناو ئەڵمانیاوە. سەرنج بەوەی کە لەو ماوەیەدا من بێکار دەبم و هیچ ئەرکێکم لەسەر شان نەبوو، بۆیە بڕیاربوو لەگەڵ (لوبا) لە ماڵی (پارانۆف) دا بمێنمەوە، چاوەڕوان بم. (ڤاسیلی) لەسەر جێگەکەی پاڵکەوتوو یەکسەر خەوی لێکەوت و من جۆزێف لەسەر زەوی پاڵکەوتین و نووستین.

کاتێک لای نیوەڕۆ خەبەرم بووەوە، (جۆزێف) ڕۆیشتبوو، هیچ شوێنەوارێکی (پارامانۆف)ی بازرگانی فەرشفرۆشیش نەدەبینرا، بەڵام دوای چەند خولەکێک پیرەمێرد هاتەوە،

مۆڵەتێکی ڕەنگزەردی نیشاندام و وتی: بەدەستهێنانی ئەو مۆڵەتە هەزار ڕۆبڵ لەسەر من کەوت.

سەعات دووی دوانیوەڕۆ (ڤاسیلی)مان لە خەو هەستاند و لە کاتێکدا بزەیەکی لەسەر لێوان بوو، بەوپەڕی ئاسوودەییەوە مۆڵەتنامەی چوونەژوورەوەی کۆشکی لە (پارامانۆف) وەرگرت. نە من و نە (لوبا) هیچکامان هەستمان بە بەرسییەتی نەدەکرد، بەڵام کاتێک پیرەمێرد خواردنی لەسەر مێزەکە دانا، (ڤاسیلی) بەوپەڕی ئیشتیاوە بەرچایی کرد و دوای تێرخواردنی، بەدیقەتەوە دەمانچەکەی پشکنی و لە جێی خۆی هاویشتەوە، لەژێر چاکەتەکەی شاردییەوە. پاشان ئامادەی ڕۆیشتن بوو، لە جێگەی خۆی هەستا. لە کاتێکدا توند دەستیم دەگوشی، بە زمانی ئەڵمانی وتم: بە هیوای یەکتربینینەوە. (ڤاسیلی) سەری لەقاند و (لوبا)ی خوشکی بە خۆیەوە گوشی، ئەو کچە وێڕای ڕەنگپەڕین و هەڵلەرزینی، لەگەڵ ئەوەشدا شاردییەوە و تێگەیشت، کە شۆکی لەناکاو و نیگەرانکەری ئەو بەسەرهاتە، لەوانەیە براکەی تووشی کێشە بکات. دوای کەمێک دەرگاکە لەپشتەوەی (ڤاسیلی) داخرا و من و (لوبا) بۆ ماوەی پازدە خولەک چاوەڕوانمان کرد، پاشان لە ماڵی پارانۆفەوە بەڕێکەوتین و (لوبا) لەجیاتی ئەوەی لە ماڵی خۆیان بچێتە ژوورەوە، بەرەو کێڵگەیەکی گچکەی بردم، کە

هەر لەو نزیکە و کەوتبووە پشت حەوشەی ماڵەوەیان، لەو کێڵگەیە خانوویەکی دارینی گچکە هەبوو، کە (لوبا) نیوەی دەرگاکەی کردەوە، تا بەباشی چاومان لە حەوشە و ماڵەکە بێت و پاشان منی بەتەنیا بەجێهێشت و بۆ خۆی ڕۆیشت.

لەمێژ نەبوو دنیا تاریک ببوو، لەپڕ تەپەی پێ بەرگوێم کەوت و دەرگای کوخەکە کرایەوە، (لوبا) بەگریانەوە وەژوورکەوت.

بەحەپەسانەوە دەستیم گرت و وتم: لوبا بۆچ دەگریت، ئایا هیچی خراپ ڕوویداوە؟

(لوبا) بە هەنیسکدانەوە وەڵامی دایەوە: بەڵێ، تەواوی نەخشەکەمان بووە بڵقی سەر ئاو، (ڤاسیلی) نەیتوانیوە بەسەرکەوتوویی ئەرکەکەی ئەنجامبدات، هەرچەند نەیتوانیوە ڕابکات و خۆی بگەیەنێتە ئێرە، لەگەڵ ئەوەشدا بریندارببووە و سینگی پێکراوە، توند توند چاکەتەکەی لە خۆی وەرپێچاوە. وتم: ئێستا (ڤاسیلی) لەکوێیە؟

- لە ماڵی (پارامانۆفە).

خێرا لەفافەکەی سەرم لێکردەوە و یەکسەر فڕێمدا، چونکە لەمەودوا پێویستی بەوە نەبوو سەرم بەوە ببەستم. هەردووکمان بەپەلە لە کوخەکە هاتینەدەر، ڕامانکرد و سەرئەنجام گەیشتینە ماڵی پارانۆف. پیرەمێرد بەگومانەوە چاوی بە سەرتاپامدا گێڕا و زانیم، کە لەبەرئەوەی لەفافەکە

بە سەرمەوە نەمەوە، نەی ناسیمەوە، بەڵام (لوبا) پاڵەستۆی دا و هەردووکمان چووینە ژووری نووستنەوە.

(ڤاسیلی) لەسەر تەختە خەوەکە ڕاکشاوە، کراسەکەی لە بەریدا داکەندبوو، برینێکی قووڵ و ترسناک لەسەر سینگی دەبینرا. گۆشتی سەر سینگی هەڵتەکاندووە، ئێسکەکانی دەرکەوتبوون و من سەرم سوڕما ئەو برینە سەیرە چۆن بووە، بە چوونە ژوورەوەمـان (ڤاسیلی) لەژێر لێوانەوە وتی: جۆزێف، تۆی؟ لەناکاو بیرم کەوتەوە کە جۆزێف تا ئەو سەعاتە نـەگـەڕاوەتـەوە، لە خۆمم پرسی کە ئایا توانیویەتی ئەرکەکەی خۆی جێبەجێ بکات، یان ڕووسەکان دەستگیریان کردووە.

(ڤاسیلی) بە ناڵە و هاوارەوە لە شوێنی خۆی هەستا و لەسەر تەختە خەوەکە دانیشت، وتی: پێویستە ئێمە هەر ئێستا بڕۆین، ئەگینا درەنگمان لێ دادێت.

(لوبا) بەترسەوە ڕووی لە من کرد، وتـی: ئـەو زۆر نەخۆشە و بەو حاڵە ناتوانێت ڕێ بکات.

(ڤاسیلی) بەزەحمەت و زمانگیرانەوە وتی: ئەو برینە زۆر لەوە خراپترە، کە دیارە ژانەکات.

(ڤاسیلی) دوای ئـەوەی، ئـەوەی وت، بە لـۆژەلـۆژ لە جێگەکەی هەستا و چاکەتە سەربازییەکەی کردەبەر، خۆی توندکرد، ددانەکانی لەچیڕەوە برد و بەرەو دەرگاکە چوو.

من و (لوبا) هەردووکمان چووینە بن قۆڵەکانی (ڤاسیلی)، چووینە سەر شەقامەکە و بەهێمنی ڕۆیشتین. (ڤاسیلی) زۆر هیلاک و نەخۆش دەهاتە بەرچاو، تا بڵێی بارودۆخی ترسناک بوو، من دۆش دادەمام کە بۆچی تووشی ئەو بارودۆخە بووە، چۆن نەیتوانیوە ستالین بکوژێت، بەڵام دەمزانی دەبێت ماوەیەک دان بە خۆمدا بگرم تا وەڵامی ئەو پرسیارانەم وەربگرمەوە.

زۆر زوو گەیشتینە دەرەوەی شار و ئەو کاتە نزیکەی نیو میل لە ماڵەوە دوورکەوتبووینەوە، (ڤاسیلی) بەزەحمەت وتی: دەبێت ئێمە ئەوەندەی دەتوانین لە ماڵەوە دووربکەوینەوە، تا هەواڵێکی جۆزێفمان پێ بگات و بزانین توانیویەتی ئۆتۆمۆبێلەکە بدزێت، یان نا. من کە نەمتوانیوە کاری خۆم جێبەجێ بکەم، ئەگەر ئەویش نەیتوانیبێت، بێگومان دەکەوێتە دەستی پۆلیس و لەوانەیە ئاشکرامان بکات. کەوایە ئەوەندە سەبر دەگرین تا بزانین چی بەسەرهاتووە، لە ماڵەوە دووردەکەوینەوە. ئێمە تا نیوەشەو لە کوخێکی کەلاوەدا سەبردەگرین، ئەگەر ئەو تا ئەو کاتە نەگەڕایەوە، نەخشەیەکی تر دەکێشین و هەرسێکمان لە جادەیەک پەڕینەوە و بەرەو کێڵگەیەکی گەورەو فراوان ڕێمانکرد، زۆر زوو گەیشتینە کوخێک کە شووشەی پەنجەرەکانی شکاوە،دەرگاکەی لەسەر لایەک

بەهەڵواسراوی مابووەوە و (لوبا) لەچکەکەی لەسەر زەوی ڕاخست، بە هاوکاریی یەکتری (ڤاسیلی)مان لەسەر پاڵخست و لەو کاتەی، کە هەموومان چاوەڕوانی سەعات 12ی شەو و جێبەجێکردنی قۆناغی داهاتووی نەخشەکە بووین، (ڤاسیلی) بەهێمنی باسی ڕووداوەکەی کرد و وتی:

دوای ئەوەی لە ماڵی (پارامانۆف) چووینەدەرەوە، من و جۆزێف لە یەکتری جیابووینەوە تا هەریەکەمان بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکەی خۆمان بڕۆین، واتە من بۆ کوشتنی ستالین و (جۆزێف) بۆ دزینی ئۆتۆمۆبێلێک، کە بتوانین پێی ڕابکەین. من بەرەو کۆشکی (لیوادیا) ڕۆیشتم و هەستمکرد هەر کیلۆمەترێکی ڕێگەکە پڕە لە ئێشکگر و پۆلیس، بەڵام لەبەرئەوەی یونیفۆرمی سەربازیم لەبەردابوو، هیچ کەس هەقی بەسەرمەوە نەبوو.

هەرچۆنێک بێت، کە گەیشتمە کۆشەکەکە و مۆڵەتنامەی چوونەژوورەوەم نیشاندا، سەرەتا پاسەوانەکان پشکنیانم و تەنانەت دەمانچەکەشیان لێوەرگرتم و تێگەیشتم پێویستە کارەکەم بەبۆمبە بچووکەکە جێبەجێ بکەم، کە لەسەر سینگم شاردبوومەوە، بڕیارمدا ئەوەندەی دەتوانم لە ستالین نزیکببمەوە، ئەوجا دوگمەکەی دابگرم تا بۆ خۆم و ستالین و تەواوی ئەوانەی، کە لە هۆڵی کۆشکەکە ئامادەبوون، بکوژم.

بەو خەیاڵەوە چوومە ناو هۆڵی دەرەوە و لەوێ دوو ئەفسەری پۆلیس کارتی بانگهێشت و مۆڵەتنامەی چوونەژوورەوەی منیان بەدیقەتەوە بە لیستێک بەراوردکرد، کە لەسەر مێزی بەردەمیان بوو، بەڵام ناوی من لە لیستەکەدا تۆمار نەکرابوو، زانیم ناتوام بچمە ناو کۆشک و هۆڵی کۆنفرانسەکەوە، مۆڵەتنامەکەم ساختەیە.

هەر ئەو کاتە کە دوودڵ و بێ هیوا مابوومەوە، ئۆتۆمبێلێکی سواری گەورە لە بەردەم کۆشکەکە وەستا و چەند ئەفسەر و سیاسەتکارێک دابەزین، پاسەوانەکان ڕێزیان نواند و هەڵبەتە نەیانپشکنین و منیش هەلەکەم قۆستەوە و خێرا لە هۆڵەکە چوومەدەرێ و بە لای ئۆتۆمۆبێلەکەی دیکەدا سووڕامەوە و دوای ئەوە، ئێستا جارێکی دیکە چوومەوە ژوورەوە، ئەم جارەیان هیچ کەس داوای هیچی لێ نەکردم، لەڕاستیدا هەر ئاگایان لەوە نەبوو، کە ببینن نامۆیەک بەو دۆخەوە دەچێتەناو هۆڵەکەوە، یان نا. دوای چەند ساتێک بە هۆڵی دەرەوەدا تێپەڕیم و چوومە ناو حەوشەیەکی گەورە و زلەوە، ئینجا بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم و لە ئاکامدا پێم نایە هۆڵە گەورەکەوە.

من لە قسەی ئامادەبووانەوە زانیم، کە دواکۆنفرانس نەبەستراوە و بڕیارە ئەمڕۆ بڕیاری سەرانی دەوڵەتان بە دنیا ڕابگەیەنرێت. ژمارەیەکی زۆر لە سیاسەتمەداران

و ئەفسەران لە هۆڵەکە دەبینران، من بەهێمنی دەستمکرد بە هاتن و چوون، بەڵام نە ڕۆزفلێتی سەرۆککۆماری ئەمەریکام بینی، نە چەرچڵی سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا.

پازدە خولەک بەم شێوەیە تێپەڕی و لەناکاو ژاوەژاوەکە بێدەنگ بوو، ژمارەیەک بەرپرس لەسەر پلیکانەکان دەرکەوتن و لە بەرامبەر ئەو ژمارەیە، پیاوێکی کورتەباڵا و بەتەمەن دەبینرا، دەستبەجێ ستالینم ناسی و لەجیاتی پایپەکەی خۆی، جگەرەی بەدەمەوە و ڕووی کراوە و گەش بوو.

کاتێک ستالین لە پلیکانەکان هاتەخوارەوە، من ڕێک دە پێ لێی دووربووم و ستالین  بۆئەوەی ڕێگەی بۆ بکەنەوە وەستا، من وەک دەرزییەک کە موگناتیس ڕایبکێشێت، پاڵم بە ئامادەبووانەوە ناو بەرەوپێش چووم و تا ڕاددەیەک توانیم دەست لە ستالین بدەم، پاشان لەسەرخۆ دەستم بردە ناو چاکەکەتەکەم بەرەو سینگم، واتە بۆ هەمان شوێن درێژکرد، کە بۆمبە گچکەکەی تێدا شاردراوەتەوە، دەستم بە ماشەی بۆمبەکە کەوت کە لەسەر سینگم بوو.

دڵم وەک بیی ناو ئاو دەلەرزی، دەمزانی کە کەمتر لە پێنج چرکە، ئەو هۆڵە بەسەریەکدا دادەڕمێت و هیچ کەس تەنانەت بۆ خۆشم، دەکوژێت و من زۆر نیگەران نەبووم لەوەی دەکوژرێم و تەنانەت هەستم بە دڵخۆشیش

دەکرد، چونکە بەو شێوەیە تۆڵەی بکوژی باوکم و براکانم وەردەگیرایەوە.

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و پاشان یەکسەر ماشەی بۆمبەکەم ڕاکێشا و چاوەکانمم نووقاند.

تا مرۆڤ کارێک ئەنجام نەدات، ئەو کارە لەبەرچاوی سادە و هیچ نییە، بەڵام کاتێک کارێکی ئەنجامدا، پەشیمان دەبێتەوە و دەترسێت. بە هەمان شێوەش کەسێک کە بڕیاری خۆکوشتن دەدات و خۆی هەڵدداتە ناو ئاوەوە، جگە لە مردن بیر لە هیچی دیکە ناکاتەوە، بەڵام کە کەوتە ڕووبارەکەوە و زانیی تا چەند چرکەیەکی دیکە دەمرێت، پەشیمان دەبێتەوە، لە بیری ژیاندا داوای فریاکەوتن دەکات.

منیش لەو کاتەدا ئەو دۆخەم هەبوو، دوای فشاردانی دوگمەی بۆمبەکە، چاوەڕوان بووم پێنج چرکەی دیکە بکوژرێم و هەموو ئەوانەی ئەوێش لەناوبەرم، بەڵام لەناکاو لە سینگمدا هەستم بە ئازارێکی زۆرکرد، وای دەنواند ئەو ئازارە بەهۆی بیرکردنەوەی نیگەرانکەر و لە تەقینەوەیەکدا ڕوودەدات. ئازارەکە بەدەگمەن زیادیکرد و وردە وردە دەورووبەری تەنییەوە، کەچی هیچ تەقینەوەیەک ڕووی نەدا، بەڵام خۆ بۆخۆت دەزانی فشارکردن لە دوگمەی بۆمبێکی گچکە، کەپسولە مسییەکەی پێکهاتەی ئەسید دەشکێت و ئەسیدەکە بەهۆی بۆڕییەکی باریکەوە

بڕژێتەسەر تەقینەوەکە و بۆمبەکە بتەقێنێتەوە و دنیا وێرانبکات، بەڵام من لەو کاتەدا بە ترس و لەرزەوە زانیم هەرچەند هەڕەمەکە کەپسولەکەی شکاندووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەبری ئەوەی ئەسیدەکە لە بۆڕییەکەوە بڕژێت، لە هەرچوارلای بۆمبەکەوە هاتووەتەدەرەوە و بەسەر سینگمدا دەڕژێت.

نیگەرانی و ترسم بەهۆی ئازار و برینی سینگمەوە نەبوو، بەڵکو لەوە هەستم بە نارەحەتی دەکرد نەمتوانیبوو ستالین بکوژم. هەرچۆنێک بێت، هەموو گیانم دەسووتا و من بە ڕووناکاییە کەمەکەی ناو تاریکییەکە هەستمکرد ستالین تۆقە لەگەڵ پیاوێکی دیکە دەکات و پێدەکەنێت و ڕوخساری لە بەرچاوم لێڵبوو، پەیتا پەیتا هۆڵەکە بە دەوری سەرمدا خولایەوە، ئەوەندەی نەمابوو لەهۆش خۆم بچم. هەمووشتێک کۆتایی پێهاتووە و ماندوبوون و هیلاکی و نەخشەکەمان بووە بڵقی سەرئاو.

(ڤاسیلی) لێرەدا بێدەنگ بوو، ناوچاوانی گرژکرد و من بەنیگەرانییەوە لەژێر لێوەوە وتم: چەند خراپ بوو ئەو هەموو ماندووبوونەمان، بە تێکچوون و خراپبوونی بۆمبەکە بەفیڕۆ چوو: دەی، بەردەوام بە.

(ڤاسیلی) ناڵاندی و سەری ڕاوەشاند و وتی: من دوای ئەوەی هەستم بە سووتانەوە کرد، هەنگاوێک هاتمە دواوە

و وەها گێژبووم، کە بۆ دواوە کشامەوە توند خۆم بە یەکێک لە ئەفسەرە بەریتانییەکاندا دا و لەژێر لێوانەوە داوای لێبوردنم لێکرد و بە لۆژەلۆژە ڕێگایەکم بەناو ئامادەبوواندا کردەوە، لە هۆڵەکە هاتمەدەرەوە. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بە دەستم توند سینگمم دەگوشی، بەڵام کەس هەستی پێنەکردم و هەموویان چاویان لە ستالین بڕیبوو. دەمزانی ئەسیدەکە وردە وردە پێست، گۆشت، ئێسکانمی خواردووە، شەبەقێک لە سینگمدا دەکاتەوە، لە پشتەوەڕا دەکرێتەوە، ئەو شوێنەوارە ئاکامی نابێت جگە لە مردنی مسۆگەر.

من بەبێ سەرنجڕاکێشانی هیچ کەسێک لە دەرگاکە چوومەدەرەوە، بەڵام ئازاری سینگم وا توند ببوو، هەستم دەکرد ناتوانم تەنانە هەنگاوێک هەڵبێنم.

لە بەردەمی کۆشکەکە ئۆتۆمبێلێکی سواریی گەورە پارککرابوو، بە لۆژە لۆژ لە شوفێرەکەی نزیکبوومەوە و وتم: تووشی دڵەکوتە و بوورانەوە بووم و ئەگەر دەکرێت بمگەیەنێتە (بالنا).

شوفێرەکە بە نیگەرانییەوە داوای لێبوردنی کرد و وتی: بڕیارم پێکراوە ئێرە بەجێنەهێڵم.

خەیاڵم بەتەنیا لەسەر دوورکەوتنەوە بوو لەو دەورووبەرە، وەک دەمزانی ئەگەر هێزم لەبەر ببڕێ و

بکەومە سەر زەوی، پۆلیسەکان دەمبەنە نەخۆشخانە و پاشان بۆمبەکەی سەر سینگم ئاشکر دەبێت و لەبەرئەوە بە گرانی و کوتەکوت بە پێچەوانەی جادەکە ڕێم کرد، بەڵام لەناکاو لە پشتمەوە دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمۆبێلێکم بیست و ئۆتۆمۆبێلێک لەتەنیشتم وەستا، شوفێرەکەی، وتی قوربان شوفێری ئەو ئۆتۆمۆبێلە سەربازییە پێیوتم، کە تۆ پێویستت بە دکتۆرە، سەرکەوە بتگەیەنمە نەخۆشخانە.

من سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بووم و شوفێرەکە بێئەوەی پرسیاربکات، گەیاندمییە شاری یالتا و لە بەردەم نەخۆشخانەیەک وەستا و منیش بەسوپاسکردنەوە لە ئۆتۆمۆبێلەکە دابەزیم و چوومە ناو نەخۆشخانەکە، بەڵام لەجیاتی چوون بۆ ژووری پزیشک، بە ڕاڕەوەکەدا ڕۆیشتم و لە دەرگای دواوە چوومەدەرەوە و هیچ کەسیش پێشی پێ نەگرتم و بێئەوەی ڕووبەڕووی هیچ مەترسییەک ببمەوە، خۆم گەیاندەوە ماڵی (پارامانۆف)(.

بەسەرسامییەوە گوێمان لە قسەکانی (ڤاسیلی) دەگرت، بەڵام خەیاڵم لە شوێنێکی دیکە بوو، بۆچی بۆمبەکە نەتەقیوەتەوە، ئایا دەکرێت کەسێک دەستکاری کردبێت، یان بۆچی جۆزێف نەگەڕاوەتەوە؟

هەموو ئەو پرسیارانە لە خەیاڵمدا بێوەڵام مانەوە، پاشان دەستم بردووەتە ژێر کراسەکەم و تێپەکەی لە چوار دەوری

بۆمبەکەی سەر سینگم هاڵێندرابوو، کردمەوە و بۆمبەکەم هێنایەدەرەوە، لە بەر تیشکی دەنکەشقارتەیەک تەماشام کرد، بەڵام لە دەرەوەوە هیچ کەموکوڕییەکی نەبوو.

(ڤاسیلی) بەرزەپێ لە جێگەکەی هەستا و بۆمبەکەی لێوەرگرتم و بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت و دوگمەکەی ، کە ئەوەندەی تاڵەشقارتەیەک بوو، ڕایکێشا و بە هەموو هێزی خۆیەوە هەڵیدایە دەرەوە.

ئێمە هەموومان لەپشت دارڕایەڵەکان خۆمان بە زەویەوە نووساند، بەڵام هیچ ڕووی نەدا و بۆمبەکە نەتەقییەوە، تێگەیشتین بۆمبەکەی منیش خراپبووە.

سەعاتێک لە نیوەشەو تێپەڕی، بەڵام جۆزێف هیچ هەواڵێکی نەبوو، (ڤاسیلی) بەنیگەرانییەوە وتی: من بە پارانۆفم وتووە، کە جۆزێف گەڕایەوە، بۆ ئێرەی بنێرێت. بێگومان فەقیرە لە کاتی دزینی ئۆتۆمۆبێلێکدا کوژراوە.

من دڵنیابووم جۆزێف (عەدەد دۆشکەکەی فڕۆکەکە)، نە کوژراوە، نە ڕووسەکان بە دیلیان گرتووە، بەڵکو لەو کاتەدا، لە ژوورێکی ڕێکوپێک و جواندا لەسەر تەختەخەو دانیشتووە و دەخواتەوە، دەمزانی ئەگەر ئەو ئاشکرای کردبین، بێگومان هەرزوو پۆلیس و سەربازەکان لە بەدواداگەڕانی ئێمە، هەمووشوێنێک هەڵدەگێڕنەوە.

دەبووایە چەندی زووە لەوێ دووردەکەوتینەوە، کەچی

هیچ کاممان نەماندەزانی بۆ کوێ بچین. تاکە ڕێگای چارەسەر، گەڕانەوە بوو بۆ ئەڵمانیا. هەرچەند (ڤاسیلی) ئارەزووی نەدەکرد خێزان و هاوڕێکانی و (پارامانۆف)، بەجێ بهێڵێت. لەگەڵ ئەوەشدا زانی مانەوە لەوێ بارتەقای مردنە و لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین خوشک و دایکی لەگەڵ خۆمان بەرین، بۆیە ماڵاواییمان لێکردن و دوو بەدوو کەوتینەڕێ.

بەو شێوەیە سەفەری پڕ ئازار و دڵتەنگمان بەرەو ئەڵمانیا دەستپێکرد. ئەو شەوە تا بەیانی بەلاڕێیاندا ڕێمانکرد و بۆ بەیانی لە بیشەڵانێکدا خەوتین و هەفتەیەک بەم شێوەیە تێپەڕی، شەوانە دەڕۆیشتین و بە ڕۆژیش پشوومان دەدا و خۆمان دەشاردەوە. تا سەرئەنجام گەیشتینەوە شاری (سواستوپول). لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا (ڤاسیلی) تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆری بەسەربردبوو. سەرما کرێوەی دەکرد و برینپێچی دەوری سینگی و کێم و زووخاوی (ڤاسیلی) سست بووە، برینەکەی هەڵاوسا بوو، بۆگەنی کردبوو، تاکە کارێک کە لە دەستمان دەهات، برینەکە بە ئاوی سارد و پاک بشۆینەوە. نە لەفافمان پێبوو، نە دەرمان، لانیکەم ڕێ بە چوونەناوەوەی میکرۆب بگرین و ڕێگەنەدەین برینەکە بۆگەن بکات، بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیە تەنانەت جارێکیش (ڤاسیلی) زمانی بە پرتەوبۆڵە و ناڕەزایی و نیگەرانی نەکردەوە.

چەند ڕۆژێک لە کەلاوەکانی لەنگەرگاکاندا خۆمان شاردەوە و چاوەڕوان بووین بەشکم ئەوە خوایە کەشتییەک بێتە دەریای سپی ناوەڕاستەوە، پارە بدەینە کرێکارێکی تا بەنهێنی سەرمان بخات و لە گەنجینەکەی، یان لە شوێنێکی دیکە بمانشارێتەوە، ئەوەندەی پێنەچوو چاوەڕوانیمان کۆتایی پێهات، من بڕێک پارەم بە کرێکاری کەشتییەک دا و من و (ڤاسیلی) سەرخست و لە کەناری (ئۆدیسا) دایبەزاندین.

لەوێ بە پێیان کەوتینەوەڕێ. جلوبەرگەکەمان چڵکن و دڕابوو، لەبەرئەوە سواری ئیڤایەکی سوپا بووین، کە بەردەوام بە جادەکەدا دەهات و دەچوو. بەم شێوەیە گەیشتینە شاری (بساربایا)، کە پێشتر لە شارەکانی (ڕامالی) بوو، ئێستا بە سۆڤێتەوە لکاوە.

برینەکەی سینگی (ڤاسیلی) بە شێوەیەکی ترسناک بۆگەن و چڵکی کردبوو، ئەو پیاوە تایەکی بەتین دایگرتبوو، هەرچەندی دەکرد، نەیدەتوانی بڕوات و ئەو ڕۆژەی چووینە ناو شاری (سادباریا)وە، من لە دەرگای کوخی پیرێژنێکی جوتیارم دا و داوای یارمەتیم لێکرد، ئەو پیرێژنە میهرەبانە بە ڕوویەکی خۆشەوە، پێشوازی لێکردین و برینەکەی ڤاسیلی پاککردەوە، دوای دەرمانکردنی پێچای. هەندێک پارەمان پێدا تا ڕێگە بدات بۆ ماوەی هەفتەیەک،

واتـە تـا کاتی چاکبوونـەوەی (ڤاسیلی)، لـە کوخەکەیدا بمێنینەوە، بەڵام دوای دوو ڕۆژ، ژنە دەستی بە پرتەوبۆڵە و پرسیارکردن کـرد، ناچاربووین ئـەوێ بەجێبهێڵین و درێژە بە ڕێگەی خۆمان بدەین.

بە بێ هیچ جۆرە کێشەیەک بە سنووری (ڕۆمانیا)دا تێپەڕین و دوای چەند هەفتەیەک ڕێکردن بە پێ، گەیشتینە زنجیرە چیاکانی (کـارپـات). لـەوێ کوێستانێکی کپ و بێدەنگی تایبەت باڵی کێشابوو، بـەڵام جادەکان بەهۆی دەبابەی وەرگەڕاو و سووتاو و تۆپی پارچە پارچە بوو، ئاوەژووببووەوە، تێگەیشتین ئەڵمانییەکان بە شێوەیەکی ترسناک، بە پـەلامـاری ئاسمانی ئەوێیان وێرانکردووە. بۆئەوەی تووشی سەربازانی سۆڤێتی نەبین، زیاتر بەناو دار و بیشـەڵانەکاندا دەڕۆیشتین.

ئەو جادەیەی، کە لە لای زنجیرە چیاکانی (کارپات) گرتبوومانەبەر، بە وڵاتی (چیکۆسلۆڤاکیا) کۆتایی پێدەهات و وەک سەربازە ڕووسەکان تازە داگیریان کردبوو، بۆیە هەمووشوێنێک لەژێر چاودێریدا بوو، ئێمە جگە لە کاتەکانی شەو، نەماندەتوانی ڕێ بکەین.

هەموو جارێک گوندنشینەکان یەکسەر ئێمەیان دەبردە کوخەکانیان و ئاو و خواردنیان پێدەداین، شەومان لە کوخەکانی ئەواندا بەسەردەبرد. من و ڤاسیلی ڕازی بووین

جلوبەرگی ئەو سەربازانە بپۆشین، کە لەسەر جادەکان کووژرابوون و جارێکی دیکە ڕواڵەتێکی باشمان هەبێت.

سەرەتای مانگی ئادار ئێمە گەیشتاینە دەورووبەری شاری (پراگیو). شاری (پراگیو) کە لە شارە گرنگەکانی چیکۆسلۆڤاکیا بوو، ڕۆژێک پێشتر لەلایەن سەربازە ڕووسەکانەوە داگیرکرابوو. هێشتا دووکەڵ لە بینا خاپوورکراوەکانەوە بەرزدەبووەوە، ئێمە بەئەستەم بەناو خشت و داروپەردووی ماڵە ڕووخاوەکاندا ڕۆیشتین و لاشەی سەربازە ئەڵمانییەکانمان بەجێهێشت.

خەڵک لە شەقامەکاندا سەمایان دەکرد و گۆرانییان دەوت و دەیانشیراند.

ئێمە لە یەکێک لە گۆڕەپانەکانی شار، چەند سەربازێکی دیلی ئەڵمانیمان بینین، کە دەستیان بە ئاماژەی تەسلیمبوون لەسەر سەریان دانابوو، خەڵک بەردبارانیان دەکردن.

بە بینینی ئەو دیمەنە دڵم داخورپا و زانیم کە تێکشکان و توانەوەی ئەڵمانیا حەتمی و بەم نزیکانەیە. چمان بەسەرهات؟ دەچینە کوێ؟ هەموو ئەو پرسیارانە لە زەینمدا بێوەڵام مانەوە.

ئێمە بۆ خۆ بەدوورگرتن لە بەرکەوت بە خەڵک، بە یەکێک لە شەقامە لاوەکییەکانی شاردا ڕێمانکرد، من هەستمکرد کە ئۆتۆمبێلێکی جیبی ئەڵمانی ڕەنگاوڕەنگی

نوێ و هێمای یەکێتیی جەماوەریی سۆڤێت لەپێش ئێمەوە دەڕوات، دوای کەمێک لە بـەردەمماڵێک وەسـتا، دوو سەرباز و پیاوێکی مەدەنی لێی هاتنەخوارەوە و چوونە ناو خانووەکەوە، کاتێک لە ئۆتۆمبێلەکە نزیکبووینەوە، بە خۆشی و سەرسامییەوە دیتم سویچەکەی لەسەرە و یەکسەر بیرۆکەیەک وەک کارەبا لە مێشکمدا درەوشایەوە، ئاماژەم بە (ڤاسیلی) کرد سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بێت، پاشان بۆ خۆشم لـەدوای سوکانەوە دانیشتم و سویچکەم بادا و برێکەکەم دادایــەوە، پاشان بەخێرایی ئۆتۆمۆبیلەکەم خستەڕێ. لێکدا لێکدا هۆڕنم لێدەدا تا خەڵک بڵاوبن، ڕێگاکە چۆڵ بکەن و ئینجا بەوپەڕی خێرایی ئۆتۆمۆبێلەکەم بەرەو دەرەوەی شار ئـاژۆت، خێرا شارەکەمان بەجێهێشت و چاوم بە ژمارەی کیلۆمەتری جادەکە کەوت، زانیم کە ئێمە لەو کاتەدا لەسەر ملەی (پیلزەن)، واتا دوو سەد کیلۆمەتر دوورتر لە سنووری ئەڵمانیا داین.

کە چووینە ناو یەکەم گوندەوە، خەڵک پێشوازیان لێکردین، چونکە خەڵکەکە تابڵێی دڵخۆش بوون بەوەی، کە وڵاتەکەیان واتـە چیکۆسلۆڤاکیا لە ئەڵمانییەکان پاککراوەتەوە و بە دیتنی ئێمە کە یونیفۆرمی سەربازانی سۆڤێتمان لەبەردابوو، سواری ئۆتۆمۆبێلی سەربازی بووین، بەو خەیاڵەی ئەفسەری سۆڤێتین، خواردن و خواردنەوەیان پێداین.

ئەڵمانیا خۆی دابوو بە دەستەوە و شەڕ کۆتایی پێهاتبوو!

ئێمە بەسەرگەردانییەوە بەرەو خۆرئاوا ڕۆیشتین و من بە (ڤاسلی)م وت، کە پێویستە ئەوەندەی دەتوانین لە دەستی ڕووسەکان دووربکەوینەوە، چونکە ئەگەر بڕیاربێت دەستگیربکرێین و ببینە دیل، وردە وردە وا باشترە بکەوینە بەردەست ڕووسەکان، دەبێت خۆمان بگەیەنینە ناوچە و شارەکانی بندەستی هێزە ئەمەریکییەکان، تا ببینە دیلی ئەوان.

(ڤاسیلی) بێئەوەی هیچ وەڵامێک بداتەوە، لەناو ئۆتۆمبێلەکە دانیشتووە، لە دەرەوە ڕادەما.

چەند کیلۆمەترێک دوورتر، کە گەیشتینە دارستانێک، (ڤاسیلی) داوای لێکردم ئۆتۆمبێلەکە بوەستێنم و پاشان دابەزی و بەرەو شوێنێکی پڕ لە دار ڕۆیشت، من پێموابوو چووە دەست بە ئاو بگەیەنێت، لەسەر بەنزین پێوەکە داهاتمەوە، بە هەمان جۆر کە چاوەڕوانم دەکرد، بەنزینەکەمان تەواو بووە و تەنیا دوو گاڵۆن مابووەوە، کە ئەویش نەیدەتوانی سووتەمەنیی جیبەکە تا سنووری ئەڵمانیا دابینبکات.

هەر ئەو کاتە ویزەی گوللەیەک بەرگوێم کەوت، خێرا ئاوڕم دایەوە و چاوم بە دووچاوی دەرپەڕیو لە قەپێلکیان کەوت، کە (ڤاسیلی) لەسەر زەوی کەوتووە و ڕێک ئەو

کاتەی خۆم پێگەیاند، گیانی لەدەستدا. دەمانچەیەک بە دەستییەوە دەبینرا و سەری هەڵتەکابوو، زانیم لەتاو ئازاری برینەکەی و نائومێدی خۆی کوشتووە.

هەرچەند نەمدەویست لاشەکەی لەو دارستانەدا بەجێبهێڵم، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ چارەیەکی دیکەم نەبوو، بە دوو چاوی فرمێسکاوییەوە سواری ئۆتۆمبێلەکە بوومەوە و دوورکەوتمەوە. وردە وردە شەو دەگەیشتە نیوەشەو، کە لەناکاو شەوقی گڵۆپی ئۆتۆمۆبێلێکی دیکە جادەکەی ڕووناککردەوە. ئیڤایەکی گەورە لە ناوەڕاستی جادەکەدا وەستا و چوار سەربازی چەکدار لەپەنای ڕاوەستابوون و بە دیتنیان لەخۆشییان جێم بەخۆم نەدەگرت، چونکە ئەو سەربازانە یونیفۆرمی سەربازی ئەمەریکییان لەبەردابوو، کاتێک ئەو سەربازانە ئەستێرەی یەکێتیی سۆڤێتیان بە ئۆتۆمبێلەکەوە بینی و یونیفۆرمی منیان ناسی، بەشادییەوە هاتەپێش و تەوقەی لەگەڵ کردم و بەو خەیاڵەی منیش لە هاوپەیمانان (واتا ڕووس و ئەمەریکی و بەریتانییەکان) م، پێکەنین و پێش ئەوەی تەنانەت بتوانم بجووڵێم، بتڵێک ویسکی و پاکەتێک شوکولاتەیان پێدام.

ئۆتۆمبێلە جێبەکەم بردە پێشەوە و ئیڤایەکەم لە چاڵەکە دەرهێنایەوە.

ئەو ئەمەریکییانە مۆڵەتنامەی من بوون بۆ ئازادی و

زانیم ئەوەندەی بۆم دەکرێت نابێت لێیان جیاببمەوە، بە ئەفسەرەکەم وت: بە ڕێگەیەکی هەڵەدا هاتوون و من بۆ خۆشم دەچم بۆ (میونیخ) و ئەگەر ئارەزووبکەن ڕێنماییان دەکـەم، پاشان خۆم بە شوفێری فەرماندەیەکی سوپای سۆڤێتی لە ئەڵمانیا ناساند، ئینجا وتم کە زۆر دڵخۆش دەبم ئەگەر ئەفسەری ئەمەریکی سواری ئۆتۆمبێلەکەی من بێت بۆ میونیخ.

ئەو پیاوە یەکسەر قبووڵی کرد و سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بوو، سەربازەکانیش سواری ئیڤایەکەی خۆیان بوون و لەدوای جێبەکەی منەوە هاتن. بە هەمان شێوە کە دامنابوو، لە مـاوەی کەمتر لە سەعاتێک جیبەکە کەوتە تەکان و بەهۆی تەواوبوونی بەنزینەکەی کوژایـەوە، من کەوتمە شتهەڵبەستن و بەبێ گوێدان بە ئەفسەرە ئەمەریکییەکە، دەستم بە جوێندان بە خۆم کرد، بۆچی بیرمچووە بەنزین لە ئۆتۆمبێلەکە بکەم، بەو دۆخە هەرگیز ناتوانم بگەمە میونیخ.

ئەفسەرە ئەمەریکییەکە تەنەکەیەک بەنزینی ئیڤاکەی پێدام و بە تێپەڕینی شەو، ئێمە سەعات شەشی بەیانی گەیشتاینە شاری (میونیخ)ی پایەختی ئەڵمانیا و ئەفسەرە ئەمەریکییەکە سووربوو لەسەر ئەوەی بمگەیەنێتە شوێنی مەبەست و منیش یەکەم ناوێک، کە بە خەیاڵم داهات ناوی هۆتێلێک بوو لەوێ، مالاواییم لە ئەمەریکییەکان کرد.

زیاتر له سەعاتێک بەبێ ئیش بە شەقامەکاندا خولامەوە، ژمارەیەکی کەمی ڕێبواران بە ترسی ئاوێتە بە ڕێز لە یونیفۆرمەکەم ڕادەمـان، بڕیارمدا هەرچەند زووە ئەو یونیفۆرمە لەبەرمدا دابکەنم، جارێکی دیکە ببمەوە ئەڵمانی، بۆیە وازم لە ئۆتۆمبێلە جێبەکە هێنا و ملی ڕێگام گرت و بەرەوپێش ڕۆیشتم.

پیرەمێردێکی بەڕێز لە بەردەم دەرگای ماڵێک وەستابوو، جگەرەی دەکێشا و من لێی نزیکبوومەوە، وتم سەربازێکی ئەڵمانیم، لە گرتووخانەی ڕووسەکان ڕامکردووە، زۆر پێویستم بە قاتێک جلوبەرگە، تا بتوانم خۆم بگەیەنمەوە ماڵەوە.

پیرەمێردەکە یەکسەر بردمییە ژوورەوە و کاتێک لە تەلارەکە هاتەمەدەرەوە، قاتێکی خۆڵەمێشی و کراسێکی سپیم لەبەردابوو، ڕاستەوخۆ بەرەو هوتێل چووم و تێروپڕ نانم خوارد.

دەمـزانـی بوومەتەوە ئەڵمانی، ئەڵمانییەکی بێئەوەی پۆستی سیاسیم هەبێت، ئازاد و سەربەخۆ.

دەمزانی پێویستە بتوانم کاری ئەندازیاری بکەم و درێژە بە ژیانێکی ئارام بدەم.

من هەموو شتێکم دەزانی، بەڵام (ڤاسیلی) داماو بوو، کە تەنیا لە شتێک زانیاری نەبوو، ئەویش خیانەتی جۆزێف،

واتـا عـەدەد دۆشکەکەی هەلیکۆپتەرەکە کە بۆمبەکانی تێکدابوون.

ڕۆژێک ڕۆژنامەکان نووسییان: سیخوڕێکی بەریتانی لە ڕووداوێکی ئاسمانی کوژراوە، وێنەکەیان بڵاوکردبووەوە، دەستبەجێ (جۆزێف)م ناسییەوە، ئەو کاتە بوو کە لە مەسەلەکە گەیشتم.

هەرچەند (جۆزێف) سیخوڕی بەریتانییەکان بوو، بەڕواڵەت ئیشی بۆ ئەڵمانییەکان دەکرد. بە هاوڕێی ئێمە ئەژماردەکرا و بە فەرمانی حوکومەتی بەریتانیا، بەبێ ئـەوەی ڕێگـەبدات حوکومەتی سۆڤێت سـووسـەی ئەو مەسەلەیە بکات، نەیزانی کە سیخوڕانی ئەڵمانی نیازی کوشتنی ستالینی هاوپەیمانیانی هەیە، فەرمانیان بە جۆزێف کردبوو بە شێوەیەک دەستکاری بۆمبەکان بکات، کە نەتەقنەوە و ئەو پیاوە لە ئەرکەکەی سەرکەوتووبوو، من تێگەیشتم مەبەستی حوکومەتی بەریتانیا لە سیخوڕەکانیان لەو هەنگاوە، کە سەریکێشایە ڕزگارکردنی گیانی ستالین، شتێکی دیکە بووە، ئەوان دەترسان کە نەوەک لە کاتی تەقینەوەی بۆمبەکە، زیان بە چەرچڵ سەرۆکوەزیرانی بەری

تانیا، کە لە هۆڵی کۆنفرانسەکە ئامادەبوو، بگات.

(هایدریخ کوژراوه و ئەفسەرە ئەڵمانییەکان نیازیان وایە بە فەرمانی هیتلەر تەواوی خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا، لە کاتێکدا خۆ لە ئاشکراکردنی دوو کەسی بکوژی ئەو خاوەن پۆستە نازییە بپارێزن، لەناوبەرن.)

(کارڵ کوردا) لە پشت پەردە کۆن و دووکەڵاوی و گنجاویەکە، کە بەسەر شووشەی پەنجەرەی خۆرهەڵاتی تەلارەکە دا درابوو، تاماشای سەربازانی نازی دەکرد، سەرقاڵی پشکنینی ماڵەکان بوون. هەرچەند لەو ڕۆژەدا، واتە سیی حوزەیرانی ساڵی 1942، تینوتاوی گەرما زاڵەی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا (کارڵ) دەلەرزی و بە دیتنی دوو ئەفسەرە ئەڵمانییە، کە یەخەی پیاوێکیان گرتبوو، ڕاکێش ڕاکێش لە تەلارێک دەیانبردە دەرەوە، هەموو مووی سەری گرژ ببوون.

ئەڵمانییەکیان، پیرەمێردەکەی پاڵەستۆ دا و پاشان دەمانچەکەی لە کیفەکەی دەرهێنا و بە خوێنساردییەوە فیشەکێکی لەنێوان هەردوو شانانی دا. ئەفسەرە نازییەکەی دیکەش بەرەو قوربانییەکە ڕۆیشت و گوللەی ڕزگاربوونی لە دووریی سێ بست، لە سەریدا بەتاڵکرد.

(کارڵ کوردا) تەواوی ئەو دیمەنەی لەپشت پەنجەرەی نهۆمی سێیەمی باڵەخانەی بەرامبەر خۆی بینی و نەیوێرا دەمبکاتەوە، جارێک بە چاوی دەرپۆقیوەوە هەستیکرد،

کە ژنێکی گەنجی منداڵ بەئامێزەوە بە ڕاکەڕاک لەکۆتایی شەقامەکە دەرکــەوت و ڕێـک لـە بــەردەم ماڵی (کـارڵ) دا وەستاو چاوی لە دوو ئەفسەرەکە، کە لەسەر سەری قوربانییەکەی خۆی وەستابوون، بڕی.

ئەفسەرێکیان بە زمانی نازی وتی: دەستگیری بکەن.

ژنەگەنجەکە شێرەژنانە و زراوتۆقیو تەماشایەکی دەورووبـــەری خـۆی کـرد، تـا مـەگـەر ڕێـگـای ڕاکـردن بدۆزێتەوە، بەڵام کە زانی هیچ چارەیەکی نییە، منداڵەکەی توندتر بەخۆیەوە نووساند و چەند هەنگاوێک چووەپێش و چۆکی دادا و قژی سەر ڕوخساری دەرکەوت و پاڕایەوە و ڕۆ ڕۆ گریا، بەڵام (کارڵ)، کە لەپشت پەنجەرەکە وەستابوو، لەو دوورەوە نەیتوانی لە قسەکانی بگات.

ئەفسەرێکیان خێرا دەمانچەکەی دەرهێنا و لێکدا لێکدا پەلەپیتکەکەی داگرت. گوللەی یەکەم بەر ناوچاوانی کەوت، لە ماوەی دە چرکەی تەواودا، لە جێی خۆی ساردوسڕبوو، پاشان سووڕی خوارد و کەوتە سەر لاشەی منداڵەکەی،بە فیشەکی دووەم کوژرابوو.

سەری (کارڵ) لە دیتنی ئەو دیمەنە سووڕا و پەردەیەکی ڕەش بەری چاوەکانی گرت، لە پشتەوەی هەستی بە جووڵانەوەیەک کرد، بە ترس و لەرزەوە ئاوڕی دایەوە.

دەنگی ناسکی ژنێک وتی کارڵ مەترسە منم ناتاشا.

کارڵ توند قۆڵی خوشکە شازدەساڵەکەی خۆی (ناتاشا) ی گرت، بەپاڕانەوەوە وتی: ناتاشا نابێت ئەوانە تۆ ببینن. من هەر ئێستا دەچمە پۆلیسی گشتاپۆ و ڕاستییەکە ئاشکرا دەکەم، تا کۆتایی بەو کوشتارە بێویژدانانەیە بێت.

لەو کاتەدا دایکی (کارڵ) هاتەژوورەوە و بەتووڕەییەوە وتی: نابێت تۆ ئەو کارە بکەیت و من ڕێت پێنادەم، لە ماڵەوە بچیتەدەرەوە.

(کارڵ) بە پاڕانەوە و کوڵەوە وتی، بەڵام ئێمە ناتوانین ڕێبدەین ئەو کوشتارە بەردەوام بێت!

ئـەو بێویژدانانە ژن و منداڵی منیش دەدۆزنــەوە، منداڵەکانم دەکوژن و ژنەکەم دەبەنە شوێنی لەشفرۆشی.

پیرێژن سەری لەقاند و وتی: خوا چی بووێت هەر ئەوە دەبێت و تۆش نابێت خیانەت لە نەتەوەی خۆت بکەیت، هاوشارییەکانت ئاشکرابکەیت. تێگەیشتی؟ نابێت تۆ بکوژی ئەو بەرازە پیسە، واتە (هایدریخ) ئاشکرابکەی.

(کـارڵ) جارێکی دیکە بۆ لای پەنجەرەکە گـەڕایـەوە. نازییەکان ڕۆیشتبوون، بەڵام لاشەی ژن و پیاو و منداڵەکە هەر لەسەر جادەکە بوون و کەمێک پەردەکەی ڕاکێشایە دواوە و لەسەرخۆ، بەڵام ناخۆش وتی سەیر بکەن! ئەو خەڵکە داماوە هەموویان بەو شێوەیە کوژراوون، دەکوژرێن، وەک (کابلیتس) و (گابلز) نایانەوێت لە پەناگاکانی خۆیان

بێنەدەر و دانبنێن بە کوشتنی (هایدریخ). دواکوشتاری بێویژدانانە تا کەی بەردەوام دەبێت؟

پیرێژن بە تۆنێکی خەماوییەوە وتی: ئەوانە هاوڕێت بوون و هەرسێکیان بەیەکەوە نەخشەی کوشتنی (هایدریخ) یان کێشا، باش دەزانی کە درکاندنی دەبێتەهۆی مردنت.

(کارڵ) بێدەنگ بوو، گەڕایەوە ژووری دانیشتن. نزیکەی سەعات حەوتی دوای نیوەڕۆ، ژمارەیەک لە خەڵکی تازیەباری چیکۆسلۆڤاکیا بە بێڵ و پاچەوە دەرکەوتن، لە ناوەڕاستی جادەکە، چاڵێکیان ڕێک لە بەرامبەر ماڵی (کارڵ) هەڵکەند، پاشان هەر سێ لاشەکەیان لەو چاڵە هاویشت و گڵیان بەسەردا کردن، ئینجا یەکێکیان دوو پارچە تەختەی وەک خاچ بەیەکەوە بەست و لەسەر قەبرەکەی چەقاند، پاش ماوەیەک، چییکۆسلۆڤاکییە ترساوەکان لە کاتێکدا بە سەرباز دەورە درابوون، لاشەکانی دیکەیان بەخاک سپارد.

(کارڵ) دوای ئەوەی ئەو دیمەنەی بینی، لەسەر نووکی پەنجە بەرەو دەرگای ژوورەکە ڕۆیشت و گوێی هەڵخست. دەنگی دایک و خوشکەکەی نەدەبیست و لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە، کە بێگومان بەدوای خواردندا چوونەتە دەرەوە، بۆیە بەهێواشی دەرگاکەی کردەوە، چووە دەرەوە و دوای کەمێک پێی نایە سەر شەقامەکە و لە کاتێکدا بەپارێزەوە دەورووبەری خۆی دەگەڕا، تا نەوەک

سەربازە ئەڵمانییەکان لەو دەورووبەرە بن، ڕێیکرد. تاکە چەکێک کە پێیبوو، کێردێک و خەنجەربۆکسێک بوو، لە بەکارهێنانیان زۆر شارەزابوو. چونکە پێشتر کاری دزی بوو.

ئەو گەڕەکەی بە (باخی بەهەشت) ناسرابوو، کەوتبووە وێرانەکانی تۆپبارانی شارەوە و (کارڵ) بەئەستەم بەناو داروپەردووی وێرانەکاندا تێپەڕی، بەرەوماڵی خۆی، کە لەنزیک وێستگەی بەنزینی شەقامی (پرمی سلووا) بوو، ڕێیکرد و دوای ساتێک بەسەر بانیژەیەکدا بازیدا و چووە ناو حەوشەی ماڵی هاوسەرەکەی خۆیەوە.

سەرەتا هیچ دەنگێک نەدەبیسترا، بەڵام کاتێک کە (کارڵ) گەیشتە بن پەنجەرەی مەتبەخ، دەنگێکی تێکەڵاوی بیست و هەرچەند تێی نەدەگەیشت، لەگەڵ ئەوەشدا یەکسەر زانی دەنگی هاوسەرەکەیەتی. یەکێک بە شێوەزاری ئەڵمانی قسەی لەگەڵ هاوسەرەکەی دەکرد، دەنگێکی پیاوانەی هەبوو. کاتێک (کارڵ) دەنگی ئەو پیاوەی بیست، دەستبەجێ زانی کە ئەڵمانییەک لای هاوسەرەکەیەتی، هەردوو چاوی چوونە پشتەسەری و سەری سووڕا، لەسەرخۆ دەسکی دەرگاکەی بادا، بەڵام دەرگاکە داخرابوو، (کارڵ) کەمێک لە جێی خۆی وەستا و پاشان پاڵی بە پەنجەرەکەی مەتبەخەکەوە نا. پەنجەرەکە بەهێواشی بەرەو

ژوورەوە کرایەوە، (کارڵ) بەزەحمەت پێیەکانی خستە سەر لێوارەکەی و سەرکەوت و دوای کەمێک، خۆی لە ناوەڕاستی مەتبەخەکەدا دۆزییەوە. دڵی بەتوندی لێیدەدا و لەشی وەک مێژۆک هەڵدەلەرزی. کێردەکەی توند بە دەستەوە گرت، کوتە کوت لە تاریکییەکەدا بەرەو دەرگاکە چوو، سەبر دەسکەکەی بادا.

ئەو دەرگایە کە بەرەو ژووری نووستن دەکرایەوە، بەهۆی فشاری دەستەڕاستی بەهێواشی کرایەوە، (کارڵ) کێردەکەی لە دەستی چەپیەوە بۆ دەستەڕاستی دەستاودەستکرد، یەکسەر خۆی هەڵدایە ناو ژووری نووستنەوە و بە دوو چاوی دەرپۆقیوەوە دیتی هاوسەرکەی، وەک کاتی لەدایکبوونی ڕووتوقووت لەسەر تەختە خەوەکە پاڵکەوتووە، پیاوێکی ڕووتیش لە تەنیشتییەوە پاڵکەوتووە.

بێئەوەی ئەو پیاوە فریای خۆی بکەوێت و هەست بە مەترسییەکە بکات، (کارڵ) دەستی کێردەکەی بەرزکردەوە و توند هێنایەخوارەوە و لە ئاکامدا جەستەی ئەو پیاوە نەناسەی بەر چەقۆیان دا.

هاوسەرەکەی لەترسان قیژاندی و کشایە دواوە، بەرەو لایەکەی دیکە ڕۆیشت و لەپشت مێردەکەیەوە وەستاو بە پاڕانەوە داوای لێکرد، کە وازی لێبهێنێت، بەڵام (کارڵ)

بە بێ گوێدان لەسەر کێرد دان لە جەستەی خوێناوی پیاوەنەناسەکە بەردەوام بوو، تا توورەیی دامرکایەوە، پاشان هەستایەوە و تەماشای هاوسەرە جوان و سەرنجڕاکێشەکەی کرد.

ژنەی زراوچوو، بەپاڕانەوەوە وتی: تو بەشکی خوای مەمکوژە. من ناچاربووم ئەو کارە بکەم، بێجگە لەمە لەبرسان دەمردین و لەبەر خاتری بە زیندوویی مانەوەی خۆم و منداڵەکان، ئەو کارەم کرد. ئایا تۆ ڕازی دەبیت منداڵەکانت لەبرسان بمرن؟

(کارڵ) هاواری کرد: تۆ خۆت خستووەتە بەر دەستی پیاوێکی ئەڵمانیی پیس و بۆگەنەوە.

- نا، بە خوای دەستی بۆ نەبردووم، زۆر ماندووبوو، نەیدەتوانی هیچ کارێک ئەنجامبدات، دڵنیابە.

(کارڵ) بەتووڕەییەوە هاوسەرەکەی هەڵدایە سەر تەختە خەوەکەوە و توند قژی گرت و ژنە لە ترسان، بەپاڕانەوەوە وتی: کارڵ گوێم بۆ بگرە. بۆچی ناتەوێت هاوکاری ئەڵمانییەکان بکەیت؟ بکوژەکان ئاشکرابکە و پاداشتی خۆت وەربگرە و بەم پێیە ئێمە ژیانێکی خۆشمان دەبێت.

(کارڵ) لە جێگەکەی هەستا و چاوەکانی لە ڕوخساری ڕەنگپەڕیوی هاوسەرەکەی بڕی و وتی: دەزانی گەر من کاری وا بکەم، پاشان کە ئەڵمانییەکان لەم شارە

چوونەدەرێ، خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا چیم پێدەکەن؟ پارچە پارچەم دەکەن.

ژنەجوانەکە لەسەر تەختەخەوەکە دانیشت و وتی: هەرگیز ئەڵمانییەکان ئەم شارە بەجێ ناهێڵن و تا هەتایە لێرە دەمێننەوە.

(کارڵ) بەدوودڵییەوە لە جێی خۆی وەستا و ژنە بەردەوام بوو: ئەگەر تۆ لەگەڵ ئەڵمانییەکان کار بکەیت، ئیدی ببڕای ببڕ ترسی ئەوەت نابێت بکوژرێین و بە برسێتی بمێنینەوە. بۆچی ناچی کاریان لەگەڵ بکەیت؟ ئەڵمانییەکان بڕی پەنجا هەزار مارک بە خەڵات دەدەن بەو کەسەی، بتوانێت زانیارییان لەبارەی بکوژانی (هایدریخ)ەوە پێبدات. تۆ دەتوانی بەئاسانی ئەو پارەیەت چنگبکەوێت...

ژنە جوانەکە بە قسەکردنەوە هەستا و توند خۆی بە مێردەکەیەوە نووساند، (کارڵ) بەگەرمییەوە دەستی بە دەوری پشتێنیدا کردە ئەڵقە و وتی: پێویستە ئەو لاشەیە لێرە لابەرین. خێراکە یارمەتیم بدە ئێرە پاک بکەینەوە و کاتێک لە کارەکەمان بووینەوە، من سەردانی پۆلیسی گشتاپۆ دەکەم و ڕاستییەکەیان پێدەڵێم. نەخێر نابێت ئیدی ڕێگەبدەم ئەو کوشتارە دڕندانەیە بەردەوام بێت.

ژن و مێرد هەردوو بەگەرمییەوە خەریکی ئیشەکە بوون و لە ماوەی کەمتر لە سەعاتێک، ئەو ناوەیان پاککردەوە

و لاشەکەیان بردە کاولە خانوویەکەوە و ناشتیان. (کارڵ) دوای ئەوەی لە کارەکەی بووەوە، جارێکی دیکە ژنەکەی لە باوەش گرتەوە و پاشان بە بیرکردنەوەوە لە ماڵەوە چووە دەرەوە،بەرەو فەرمانگەی گشتیی گشتاپۆ ڕۆیشت و دوای ئەوەی سەعاتێک ڕێیکرد، لە کاتێکدا هەوڵیدەدا بە ناو سێبەر و تاریکییەکەدا ڕێبکات، لە بەردەم دەرگای فەرمانگەکە وەستا و پاسەوانەکان بردیانە ژووری سەرۆکی کۆماندۆ مقەدەم (سیدلی. )

(کارڵ) دوای ئەوەی چووە ناو نووسینگەکەوە، لە بەردەم مێزی مقەدەم وەستا و وتی: قوربان دەمەوێت هاوکاریی هێزەکانی نازی بکەم و شوێنی بکوژانی (هایدریخ) ئاشکرابکەم.

دوای چەند خولەکێک، نهێنییەک کە بۆ ماوەی سێ هەفتەی تەواو بە نهێنی ماوەتەوە، بووەتەهۆی ڕشتنی خوێنی سەدان هەزار کەسی سڤیل، ئاشکرابوو (کارڵ) وتی: ئەوانەی (ڕاینهارد هایدریخ)یان کوشت، (جۆن کابلز) و (جۆزێف گابلیتس) بوون و هەردووکیان لە سوپای چیکۆسلۆڤاکیا مقەدەمن.

سەرهەنگ (سبدل)ی ئەفسەری ئەڵمانی پرسی: ئێستا ئەو دوو کەسە لەکوێن؟

(کارڵ) دوودڵانە وتی: ئایا ئێوە ڕێگەم پێدەدەن، کە

دوای ئاشکراکردنی ئەو نهێنییە بچمەوەماڵی خۆم لای ژن و منداڵەکانم؟

سەرهەنگ بەرزەپێ لە شوێنەکەی هەستا و بەرەو مێزەکەی دیکە ڕۆیشت و دەستێکی لە شانی (کارڵ) دا، بە شێوەیەکی هاوڕێیانە وتی: جەنابی کارڵ کوردا، بەڕاستی تۆ پاڵەوانیت و گیانی میللەتی خۆت ڕزگارکردووە. سەرئەنجام ڕۆژێک وڵاتی چیکۆسلۆڤاکیا ڕێزوحورمەتی تۆ دەزانێت و ڕێزت دەگرێت و لەبارەی ئەو پرسیارەی کردت، پێویستە بڵێم بێگومان دوای ئاشکراکردنی پەناگەی تیرۆریستان، دەتوانیت بۆ ماڵی خۆت و بۆ لای ژن و منداڵەکانی خۆت بگەڕێیتەوە. جەنابی (کوردا) ئێمە پێویستمان بە بوێرانی وەک تۆ هەیە تابتوانن خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا وانە و پەند دادەن، تێیان بگەیەنن، کە حوکومەتی ئەڵمانیا مەبەستی چاکەیە و بە هاتنەناوەوەی سوپای ئەڵمانیا بۆ ئەم وڵاتە، وردە وردە بارودۆخ لە پێشتر باشتر دەبێت.

(کارڵ) سەری چەماندەوە و وتی: لە ئێستادا تیرۆریستەکان لە ژێرزەمینی کڵێسای ئەرسەدۆکسی چیکۆسلۆڤاکیا، خۆیان حەشارداوە، کە دەکەوێتە شەقامی (ڕنزل) و ژمارەیان حەوت کەسە، دوانیان بکوژی (هایدریخ)ن و پێنجەکەی دیکە بەرپرسانی حزبی ژێرزەمینین.

سەرهەنگ سبدل بەحەسرەتەوە پرسیی: کوێ؟

ناوەندی کۆبوونەوە و دەزگای حیزبی پیلانگێڕان و نیشتمانپەروەرانە؟

(کارڵ) ناوەندی حیزبی ئاشکراکرد و هەر ئەو کاتە، بەبێ بەفیڕۆدانی کات دەستبەجێ بڕیاردەرکرا، نزیکەی شەشسەد سەربازی نازی، بەرەو ئەو شوێنە چوون کە بەرپرسان و ئەندامان لێی کۆببوونەوە، لە ماوەی کەمتر لە پازدە خولەک، ترسناکترین و گوماناویترین حیزبی ئەورووپا هەڵوەشێنرایەوە و بەرپرسانی دەستگیرکران و کۆتایی بە کوشتاری بێویژدانانە هێنرا.

***

ئەو کوشتارە لە 28ی مانگی ئاداری 1942، کاتێک دەستی پێکردبوو، کە دوو ئەفسەری سوپای چیکۆسلۆڤاکیا بە ناوەکانی (کابلز) و (گابلیتش)، ئەژدیهای ترسناکی ئەڵمانی، واتە ڕاینهارد هایدریخیان کوشت.

(هایدریخ) هەمان (هیملەر)ی سەرۆکی گشتیی دەزگای گشتاپۆ بوو، بۆ جێگرتنەوەی شوێنی بارون فون نیوراتی، فەرماندەی (بوهەم) و (موراویا) نێردراوە، لەگەڵ دانیشتنی لەسەر کورسیی سەرۆکایەتی، دەستی بە هەنگاوی ترسناک و دڕندانە کردووە و وەک میرغەزەبی خوێنخۆر لە چیکۆسلۆڤاکیا دەرکەوتووە.

(هایدرخ) جەنەراڵێکی زۆر هەوەسباز بوو، مێبازی لەگەڵ کچانی چوارده بۆ هەژدە ساڵ دەکرد و دەی ناردنە شوێنی لەشفرۆشی و هەر لەبەر ئەوە کابلز و گابلیتس، ئەفسەرانی چاونەترس و نیشتمانپەرست بڕیاری کوشتنیان دا، چونکە دەیانبینی ئەو پیاوە پۆستەکەی خۆی قۆرخکردووە، بە خەیاڵی خۆی دەتوانێت هەرکارێکی بیەوێت ئەنجامی بدات و لە 20/6ی مانگی ئادار، ئەو دوو مقەدەمە، لە شوێنێکی چۆڵەوانی، دەستڕێژیان بەرەو میرغەزەبی خوێنخۆر کرد و برینداریانکرد، هەڵاتوون و (هایدریخ) دوای چەند سەعاتێک گیانی سپاردووە. تیرۆریستان ڕاپانکردووەتە شارۆچکەی (لبدیی) و پۆلیسی گشتاپۆ بە بڕیاری هیتلەر ڕایگەیاندبوو، کە ئەگەر تیرۆستەکان تا 24 سەعات خۆیان نەدەن بە دەستەوە، شاری (لیدیس) لە لاپەڕەی مێژوودا، لەسەر نەخشە دەسڕێتەوە.

هیچ کەسێک لە خەڵکی ئەو شارە، ئەو ئاگادارکردنەوەیان بە جیددی وەرنەگرت، هەرگیز خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا لەبارەی ئاشکراکردنی بکوژان هەنگاویان نەنا و هەر لەبەرئەوە بەیانی ڕۆژی 8ی حوزەیرانی 1942، زیاتر لە 500 سەربازی نازی چوونە ناو شاری (لیدیس) و ئەو شارە دانیشتووان دوو هەزار کەسیەیان وەها تەوقکرد، تەنانەت مێشیش نەیدەتوانی بجوولێتەوە. ژن و منداڵانی

کەمتر لە 14ساڵ، بەکۆمەڵ گوللەباران دەکران، لاشەکانیان بە داشقە دەبردە دەرەوەی شار تا بسووتێنرێن، پیاو و کوڕانی لە 14ساڵ بۆ سەرەوە، ژنان و کچانیشیان بە شێوەی سەد کەسی دەبردنە دەرەوەی شار و دەیانکوشتن، بەڵام خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا هێشتاش خۆیان لە ئاشکراکردنی تیرۆریستان بەدوورگرت.

ئەڵمانییەکان کە بارودۆخەکەیان بەو شێوەیە بینی، هەنگاوی توندتریان نا، کچان و ژنانیان خستە شوێنی لەشفرۆشییەوە و پیاوانیشیان بە شێوەیەکی نامۆ سزادا و لە خوارەوە باسی بەشێک لە کارەکانیان دەکەین:

سەرهەنگ (سبدل) بە بڕیاری هیتلەر بۆ کوشتنی پیاوەکان، ( ژنانی ناشیرین و پیر)، ڕێبازێکی سەرسوڕهێنەریان گرتەبەر، (ئایشمان) ئەو ڕێبازەی بەکاردەهێنا.

کاتێک ئەڵمانییەکان پیاوەکانیان دەستگیردەکرد و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردن، پێیانوابوو لەوانەیە سووسەی شوێنی بکوژانی جەنەراڵی ئەڵمانی بکەن. کە دەیانبینی دەستگیرکراوەکان قڕوقەپیان کردووە و بێئاگایی خۆیان ڕادەگەیەنن، دەیانبردنە دەرەوەی شار و یاریگاکان.

لەو بەشەی دەرەوەی شار زەویەکی پانوپۆڕ هەبوو، هەر چوارلای بە ئەندازەی کیلۆمەترێک ڕووتەن بوو، نە دارێک بۆ چاوەزاریش دەبینرا، نە بەردێک بۆ چاوئێشە.

جەنەراڵ (ساشا مونیالخ)، کرایە بەرپرسی چالاکیی بیابانی ئەو ناوچەیە و ئەرکەکانی سەرشانی خۆی، بە شێوەیەکی سەیروسەمەرە ئەنجامدەدا. لە بەشی باکووری ئەو زەوییە پانوپۆڕە، چوار کۆڵەکەی داری بە شێوەیەکی چوارگۆشەیی دانابوو، بە خشتە دیوارێکیان بە دەوریاندا درووستکردبوو، کە لە کوخێکی چوارگۆشەیی دەچوو، تەنیا سێلای دیواربێت و هێشتا دیواری بەردەمی درووست نەکرابوو. جەنەراڵ (مونبالغ) لەگەڵ 10 سەرباز و بەرپرسانی ئەڵمانی، بە ئۆتۆمۆبێلی زرێپۆش گیراوەکانیان دەبردە ئەوێ، پاشان جلوبەرگەکانیانی دادەکەند، پاشان سەربازێکی نازی دەهات و دینامیتی لوولەیی باریکی دەهێنا، کە هەر دوو سەری وەیاری پێوەبوو، ئەو دینامیتەیان لێ دەبەست و وایارەکەیان لە کەمەریان دەئاڵاند، ئەوکاتە بە دەستی کەلەپچەکراو لەپێشەوە و لاقەکانی دەگووشن، پاشان کارمەندێکی دیکە بەپێکەنینەوە دیلەکەی دەبردە ناوەڕاستی ئاداردانەکە و ئاگری لە فتیلەیەکی درێژ بەردەدا و بۆخۆی دەگەڕایەوە سەر سەکۆی تەماشاکردن و دەستگیرکراوی بەدبەخت، چاوەڕوانی تەقینەوەی دینامیتەکەی دەکرد، بە ترس و لەرزەوە ڕایدەکرد، خۆی لە خۆڵێ وەردەدا و شێتانە بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە تا لەناکاو دینامیتەکە دەتەقییەوە و کوت کوتی دەکرد، نازییەکان بە

خۆشی و شادی و پێکەنینەوە سواری تانکەکانیان دەبوون و بۆ شار دەگەڕانەوە و ئەو کارە ئەوەندە درێژەی کێشا، کە تەنانەت ڕاگەیەنراوە هەڵواسراوەکانی سەر دیوارەکان، ئەگەر بکوژانی (هایدریخ)ی یاریدەدەری دەزگای سیخوڕی خۆیان تەسلیم نەکەن، خۆیان نەناسێنن لە ماوەی دوو ڕۆژدا، شارەکە تۆپباران دەکرێت و جوقەواری تێدا ناهێڵنەوە.

ڕۆژی 12ی حوزەیران، دانیشتوویەکی دیکەی ئەو شارەیان دەستگیرکرد، کە ئاگای لە مەحمودی بێ زەواد نەبوو لە ماڵی خۆی نووستبوو، ئەو پیاوە شوفێری گەلابە و سمێڵبابڕ و پێستسپی بوو، هەرچەند ڕایگەیاند بکوژانی (هایدریخ) ناناسێت، سەرهەنگ (مۆنیالخ) قەناعەتی نەکرد، وەک دەیانویست بە کوشتنی بێگوناهان، بکوژان ناچاربکات خۆیان بەدەستەوە بدەن و ئەو پیاواشیان وەک ئەوانی دیکە سواری زرێپۆش کردو بردیانە دەرەوەی شار.

دەسەڵاتدارانی نازی و سەربازەکان هەموویان لە ئۆتۆمبێلەکان دابەزین و لەو ژوورە گچکەیەدا کە لە بنەمادا سەکۆی تەماشاکردن بوو، لەسەر کورسییە دارەکان دانیشتن و پاشان (فریدریک خانسل)ی شوفێریان ڕووتوقووت کردەوە.

(هانسل) تـەواو هێمن بـوو، نە نقەی  لێوەدەهات، نە جووڵە دەکات و تەنیا لەبنەوە سەیری دەورووبـەری ئەو زەوییە پانوپۆڕە دەکات، کە لە دوورە تەلدڕووی لە دەور دەبینرێت. کەمپی دەستگیراوەکان لەودیو تەلدڕووەکە بوو.

کاتێک جلەکانی (هانسل)یان داکەند، سەرهەنگ (مۆنیالخ) بەدوو چاوی دەرپۆقیوەوە لە لەشی نارێک و ناقۆڵای ئەو پیاوە ڕاما و ڕووی لە هاوڕێیانی کرد، بە زمانی ئەڵمانی وتی: بەڕێزان دەزانن من بیر لەچی دەکەمەوە؟ بیردەکەمەوە کە ئەو پیاوە لە نەوەی دێوەکان بێت و بێگومان باوکی عەرەب بووە.

ئەڵمانییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا و (مۆنیالخ) بڕیاری ئەنجامدانی کـارەکـەی دەرکــرد، کـارمـەندێـک دینامیتە تایبەتییەکەی هەڵگرت، لە لەشی (هانسلی) بەست و پاشان بردییە ناوەڕاستی زەوییە پانوپۆڕەکە، چەرخێکی لە گیرفانی دەرهێنا و ئاگری لە دینامیتەکە بەردا و ئینجا بە ماتۆڕە گچکەکەی بۆ سەکۆی تەماشاکردن گەڕایەوە. (هانسل)ی پیر کاتێک دیتی فتیلەکە ئاگری گرتووە، بەم نزیکانە بۆمبەکە دەتەقێتەوە، لە جێگەی خۆی هەستا و بە خوێنساردییەوە دەستی بە هاموشۆ کرد. کاتێک گەیشتە بیست هەنگاو دوور لە سەکۆی تەماشاکردنەکە، لەناکاو بازێکی دا و ڕایکرد و سەرەتا بەدەوری خۆیدا خولایەوە، پاشان بە خێراییەکی

سەیر، قەڵەمبازێکی دا و ڕێک خۆی هەڵدایە ناوەڕاستی سەکۆی تەماشاکردنەکە و سەر سەرهەنگ (مۆنیالخ). ئەوە بە جۆرێک خێرا و چاوەڕواننەکراو ئەنجامدرابوو، کە لە ماوەی چەند چرکەیەک هەموویان مات و سەرگەردان لە جێی خۆیان وشکبوون، پاشان یەکسەر هەر دە کەسە ئەڵمانییەکە کەوتنە جموجووڵ و یەکێکیان خەریکی کردنەوەی وایەری دینامیتەکە بوو لە پشتاینی (هانسل) و ئەوی دیکە، کە دەیزانی دینامیتەکە زوو دەتەقێتەوە، قۆنداغە تفەگێکی توندی بە سەری (هانسل) دا کێشا و (مۆنیالخ)یش هەوڵیدەدا خۆی لە دەستی ئەو پیاوە زیرەک و فێڵبازە ڕزگاربکات، چونکە (هانسل) دەستە کەلەپچەکراوەکانی بەسەر سەری سەرهەنگدا بردبوو، توونـد لە ملی هاڵاندبوو.

ئەڵمانییەکی دیکە دەستی درێژکرد تا فتیلەی دینامیتەکە بینێتەدەرەوە، بەڵام بەهۆی قەرەباڵغییەوە کە سەگ خاوەنەکەی خۆی نەدەناسییەوە، دەستی ئەو پیاوە بەسەری فتیلەکە کەوت و ئەو ئاگرەی لەناو فتیلەکەوە بۆ دەرەوە زمانەی دەکێشا دەستی بسووتێنێت، دوای کەمێک دینامیتەکە تەقییەوە و پێش هەموان هانسل و (مۆنیالخ) پارچە پارچە بوون و ئەوانی دیکەش، بەهۆی دارمانی میچ و دیوارەوە بریندارببوون.

ئەوە وایکرد کوشتن بە دینامیت لە بەرنائادار نازییەکان لابېرێت.

کوشتاری شاری (لیدیر)ی چیکۆسلۆڤاکیا، سێ ڕۆژ درێـژەی کێشا، بە شێوەیەک کە لـەو مـاوەیـەدا تەنانەت پیاوێکیش تا نزیکەی بیست ساڵ، بەزیندوویی نەمایەوە و تەواوی پیاوەکان کوژران و ئەوانی دیکەش، کە خۆیان شاردبووەوە، دەستگیرکران و بیانووی نازییەکان بۆ ئەو کوشتارە کارەساتبارە ئەوەبوو، کە خەڵکی شاری (لبدیس) دەبێت باجی کوشتنی (هایدریخ) بدەن و لەجیاتی بکوژان، تۆڵەیان لێبکرێتەوە.

تـەواوی ژنانی تەمەن کەمتر لە بیست و پێنج ساڵ، نـێـردرانـە شوێنەکانی لـەشـفـرۆشـی، ئـەوانـی تـریـش بۆ کەمپەکانی کـار و نـاوەنـدەکـانـی بـە ڕواڵــەت فێرکاری گـوازرانــەوە، پیرێژنە پەککەوتەکانیش لـە ساڵۆنەکانی گـاز دەکـوژران، یـان لە کوورەکانی مـرۆڤ سووتاندندا دەسووتێران، تەواوی ئەو کوشتار و تاوانانە نەیانتوانی ناسنامەی بکوژان ئاشکرابکەن و سەرئەنجام، (پێش ئەوەی "کارڵ کودا" تیرۆریستەکان ئاشکرا بکات)، نزیکەی پەنجا هەزار سەربازی نازی نێردرانە چیکۆسلۆڤاکیا، یان بکوژان بدۆزنەوە، یان تەواوی دانیشتووانی ئەو وڵاتە بکوژن.

هیچ گومانی تێدانەبوو، کە تیرۆریستەکان لە شوێنێکی ئاساییش و ئەمین و ئامان خۆیان حەشارداوە، نازییەکان دەیانزانی، تەنها ڕێگەی دەستگەیشتن بە ئەوان، درێژەدانە

به كوشتنی خەڵكی سڤیل، چونكە بەو شێوەیە لەوانەبوو ئـەوان خۆیان بناسن تا گیانی تـەواوی هاوشارییەكانی خۆیان نەجات بدەن.

ڕۆژانـە لە پارێزگای (پـراگ) لەنێوان 200 تا 300 نازی، ماڵەكانیان تەوقكردووە، دانیشتووانی زراوتۆقیویان دەهێنایەدەر و لە وردەوە تا پیریان لەپەنا یەك ڕیزدەكرد و بە بڵندگۆ دەیانوت: ئەگەر بكوژانی (هایدریخ) تا 5 خولەك خۆیان نەناسێنن، ئەو خێزانە هەموویان دەكوژرێن، ڕێك بە تەواوبوونی ماوەی دیاریكراو، كلاشینكۆفەكان دەتەقێنران و ئەندامانی خێزانەكە دەكەوتنە سەر زەوی.

لەنێوان مێژووی 26ی مانگی ئادار (واتە ئەو ڕۆژەی هایدریخ كوژرا)، تا 3ی حوزەیران ڕێك هەزار و دووسەد و نـەوەدونۆ كەس كـوژران، تا بەشكوو بكوژان خۆیان بناسێنن.

بە مێژووی 10ی حوزەیران، ڕادیۆی پراك ڕایگەیاندبوو، كە تەواوی پیاوەكانی شاری (لیدیس) كوژراون و ژنەكان لەوێ بردراون و شارەكەیان لەگەڵ زەوی تەختكردووە و ئەوەی خوارەوە دەقی هەواڵی ڕادیۆی پراگە، كە سەعات 8ی شەوی 10ی حوزەیران پەخشكرا:

حوكومەتی ئەڵمانیا لە تۆڵەی خوێنی ڕاینهارد هایدریخی یـاریـدەدەری دووەمـی هیملەر، بۆ ناسینی بكوژانی

ناوبراو، تەواوی پیاوەکانی شاری (لیدیس)ی کوشتووە، کە کوژرانەکە لەوێ بووە، ژنەکانیان بۆ شوێنی دیکە گواستووەتەوە، ئەو شارە بە بۆردومانی ئاسمانی لەگەڵ خاک تەختکراوە و لەسەر تەواوی نەخشەکانی جیهان سڕدراوتەوە.

خەڵاتێک بە بڕی 20 ملیۆن (چیک) (یەکەی پارەی چیکۆسلۆڤاکیا) زێڕ، بۆ کەسێک کە بتوانێت زانیاری لەبارەی حەشارگەی بکوژانەوە بدات، دیاریکرا ! ژمارەیەک کە دەیازانی (کالز) و (گابلیتس) بکوژانی میرغەزەبی خوێنخۆر (هایدریخ) لەکوێ خۆیان پەناداوە، بێدەنگییان هەڵبژارد تا (کارڵ کوردا)، بە فریوخواردنی  هاوسەرەکەی و لەژێر گوڕوتینی عیشق و شەهوەت، گرێی ئەو نهێنییەی کردەوە، کە خوێنی سەدان کەسی لەسەر ڕژێندرابوو.

کاتێک (کارڵ) زانیاریی خۆی بە ئەڵمانییەکان گەیاند، توانییان ناوەندی حیزبی پیلانگێڕان ئاشکرابکەن، کردیانە فەرماندەی تیپێک و خواردن و پارەی زۆریان پێدا، خەڵاتەکە بۆ ئەو کاتە دواخرا، کە بکوژان دەستگیربکرێن.

پێش دەرکەوتنی خۆر، کڵێسای (سانت سبریل) و (سانت دیوس)، لەلایەن سەربازانی نازییەوە دەورەدرا، بەرپرسانی حزب، لەلایەن کەشیشێکەوە لە ژێرزەمینێکدا حەشاردرابوون، کە تەنیا ڕێگەیەکی چوونەژوورەوە و

هاتنەدەرەوەی هەبوو. ئەویش بە چیمەنتۆ و کۆنکریێت گیرابوو، تەنیا کلاورۆژنەیەکی گەورە لە دیواری ئەو گۆڕەدا هەبوو کە کاری هەواگۆڕکێی دەکرد، گۆڕەکەی بەکەڵکی تێداژیان دەکرد. بە شێوەیەک سەر ئەو گۆڕە و دەورووبەری کۆنکریێت کرابوو، هیچ کەس نەیدەتوانی بزانێت لە ژێرزەمینەکە، ژوورێکی گچکە هەیە، حەوت کەس بە ئازووقەی پێویستەوە تێیدا دەژیان و ئەو گۆڕەش هەواکێشێکی گەورەی هەیە. کەشیشەکە لە کاتی پێویستدا بە پەیژە بە کلاورۆژنەکەدا دەچووە خوارێ و پەیوەندی پێوەدەکردن و پێداویستی وەک نان و ئاو و میوەی بۆ دەبردن. کەشیشی نیشتمانپەروەر زۆربەی کات دەچووە سەر منارەی کڵێساکە و ئێشکی دەگرت، دەیتوانی بەباشی چاودێریی ئەو دەورووبەرە بکات.

بەیانی 18ی مانگی حوزەیران، سێ لە پەنابەران، کە بۆ پشوودان لە هەواکێشی گۆڕەکەوە چووبوونە سەر منارەکە، لە کاتی هاتنەخوارەوە بە پەیژەکەدا، یەکسەر سێبەری سەربازانی نازیان بینیبوو کە کڵێساکەیان گەمارۆ دابوو، یەکێکیان ناسراو بە (ئیوان جۆروسلاڤ) لەسەرخۆ خۆی خزاندە گۆشەیەکی کلێساکە، تەماشایەکی خوارەوەی کرد، پاشان یەکسەر ئاماژەی بۆ هاوڕێکانی کرد، هەرسێکیان تفەنگەکانی خۆیان بەدەستەوە گرت و بەدیقەتەوە سێرەیان

گرت و پەلەپیتکەیان کێشا، شەش سەرباز لە نازییەکان پێش ئەوەی تەنانەت بزانن چ ڕوویداوە کوژران. هاڕەی دەستڕێژی گوللەکان پەنابەرانی گۆڕەکەی تێگەیاند، کە پەناگەکەیان ئاشکرا بووە.

دەستبەجێ لە خوارەوە دۆشکەکان بەکارهێنران، سێ پەنابەر لەسەر منارەی کڵێساکەوە بە لەشی وەک بێژینگیانەوە کەوتنە سەر زەوی. یەکێک لەو سێ پیاوە، کە لەسەر منارەی کڵێساکە کوژرابوون، هەمان (کابلز) بوو.

لە گۆڕەکەی ژێرزەمینەکەدا، چوار نیشتمانپەروەر مابوونەوە، خۆیان بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمن ئامادەکردووە، هیچ دەریچەیەکی ڕاکردن و چوونەدەرەوەیان نەبوو، ئاو و خواردن بەشی ڕۆژێکی دەکرد، بەڵام تەقەمەنییان کەم بوو. چوار پیاوی نائومێد، چەکەکانی خۆیان تاوداوەتێ و لەپشت پەنجەرەی کلاوڕۆژنە گچکەکەوە، کە وەک پەنجەرە بە کاردەهێنرا و بەرەو سەر شەقامەکە دەکرایەوە، نیشانەیان گرت و تەقەیانکرد. سەربازانی گشتاپۆ چەند نارنجۆکێکیان بەرەو لای پەنجەرەکە گچکەکە هەڵدا، لەبەریەکیان هەڵوەشاند، بەڵام هەرچەند دوو لەو کەسانەی ناو گۆڕەکە کوژرابوون، ئەوانی دیکە بەردەوام بوون لەسەر دەستکردنەوە و هەرکاتێک نازییەک تۆسقاڵێک دەردەکەوتن، دەبوونە ئامانجی گوللەی تفەنگی دوو کەسە پەنابەرەکە.

هـەروەک ئەو بەرگرییە بـەردەوام بوو، دوای شەش سەعات و سی خولەک، کە ئەڵمانییەکان لە هەموو لایەکەوە نائومێدبوون و تەنیا هیوایان بەوەبوو، برسیەتی یاخییان ناچاردەکات خۆیان تەسلیم بکەن. لەناکاو سەربازێکی نازی پێشنیارێکی ترسناکی کرد و وتی: نوقمکردنی یاخیبووان لە گۆڕەکەدا، باشترین ڕێگەیە.

ناو کڵێساکە پڕبوو لە سەربازانی ئەڵمانی و دەرزیت هەڵدابا نەدەکەوتە سەر زەوی، لەو لایەوە هیچ دەرەتانێکی ڕاکردن نەبوو، سەربازەکان هەر ئەوەندە چاوەڕوان بوون لەگەڵ جێگۆڕکێ پێکردنی تاتەبەردێکی سەر تەختایی زەوییەکە، پەلاماریان دەدا.

لەسەر داوای فەرماندەی سەربازەکان، ئۆتۆمبێلێکی ئاگرکوژێنەوە نێردرایەناو کڵێساکەوە، سۆندەی ئاوەکەیان خستەناو کلاوڕۆژنەی گۆڕەکەوە، کە بەدەرەوەدا دەکرایەوە و پلەی فشاری ئاوەکەیان تا دوائاست کردەوە، ئاوەکە بە فشارێکی زۆرەوە وەک تاڤگە لە کلاوڕۆژنە گچکەکەوە هەڵدەڕژایە ناوەوە.

نزیکەی سەعاتێکی تریش تەقە بەردەوام بوو، فەرماندەی نازییەکان کوژرا، دوای نیوسەعات، کاتێک ئاو لەناو گۆڕەکەوە هەڵڕژایە دەرەوە، ئەڵمانییەکان زانییان گۆڕە چیمەنتۆکە پڕبووە لە ئاو و بەهۆی بێدەنگی ترسناکەوە، زانییان بێگومان بەرگریکاران خنکاون.

دوای نیوسەعات، لە لای سـەرەوە دەرگـای گۆڕەکە کـرایـەوە، لاشـەی چـوارکـەس، کـە هـەریـەکـەیـان سـەری بە گوللە هەڵتەکابوو، لەسەر ئاوەکە دۆزرایـەوە، (کارڵ کوردا) بۆ دیاریکردنی ناسنامەی لاشەکان برایە شوێنی ڕووداوەکە، لاشەی (کابلز) و (گایلیتی) بکوژانی (هایدریخ) ی نیشاندان.

ئەڵمانییەکان یەک لەسەر سێی ئەو خەڵاتەیان بە (کارڵ) دا، کە وادەیان پێدابوو، پاشان پلەیان بەرزکردەوە، و وەک یاریدەدەری یەکێک لە بەرپرسانی گشتاپۆ دایانمەزراند.

***

دوای دوو ساڵ، کار و ئەرکی (کارڵ) تەنیا دەستەبەرکردنی زانیاری بوو لەبارەی حەشارگە و حزبەکانی چیکۆسلۆڤاکیا، بەڵام سـەرەڕای ئەوەی هەموودەمێک ژیانی لە مەترسی دابوو، چونکە ئەڵمانییەکان خۆیان لە پاسەوان بۆ دانانی دەدزییـەوە، بۆیە هاوسەرەگەنجەکەی (کـارڵ)، وازی لە مێردەکەی هێنا و سوور دەیزانی خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا بە خائینی دەناسن و هەوڵدەدەن لەناوی بـەرن. (کارڵ) دوای ئەوەی هاوسەرەکەی بەجێیهێشت، گۆشەی تەنیایی هەڵبژارد و کەس نەیزانی چی بەسەرهات، نە ئەڵمانییەکان دەیانزانی ئەو پیاوە بۆ کوێ سـەری خۆی هەڵگرتووە، نە هاوڕێکانی و ئاشنایانی. کاتێک (کارڵ) ژیانی خۆی لە

مەترسیدا بینی، جارێکی دیکە جلوبەرگی چیکۆسلۆڤاکی کردەوەبەر و سەری خۆی بۆ شارێکی دوور هەڵگرت، بەڵام خەڵکی ئەو شارە، چونکە لە ژیان لەگەڵ خەڵکی غەریبەدا دەترسان، بۆیە لە سەرەتاوە لەگەڵی گەرموگوڕ نەبوون.

چیکۆسلۆڤاکییەکان نازناوی (یەهودایان)، بە (کارڵ) دا. (یەهودا قوتابییەکی حەزرەتی مەسیح بوو، حەزرەتی لەپێناوی پارەدا بۆ یەهودییەکان ئاشکراکرد، بووەهۆی لەخاچدانی و کوشتنی. (و.ف)

هاوسەری (کارڵ) دوای دیارنەمانی مێردەکەی، دەستی لەگەڵ ئەفسەرێکی ئەڵمانی تێکەڵاوکرد و لێی دووگیان بوو، کاتێک ئەو ئەفسەرەش زانی ژنی گەنج دووگیان بووە، وازی لێهێنا و شەوێکیان، کچە نۆ ساڵەکەی بە هاتوهاوارەوە لە ماڵ هاتەدەر و چووە سەرشەقام، کە خەڵک چوونە ناو ماڵی ئەو ژنەوە، لەوپەڕی ترسەوە ژنەی گەنجیان بە لەشی دابیژراو و کون کون وەک بیێژینگ، بەهۆی گوللەوە لەسەر تەختە خەوەکەی بینی و لە هیچ کەس شاراوە نەبوو، کە خەڵکی چیکۆسلۆڤاکیا تۆڵەیان لێکردووەتەوە.

کاتێک هاوپەیمانان ئەورووپایان داگیرکرد، (کارڵ کوردا) زەندقی چوو، هەرچەندە ناوی خۆی گۆڕیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسا دیسانەوە کۆمەڵێکی لێدەرکەون،

بیناسن. چەند مانگێک دوای ئـەوەی ئەڵمانییەکان لە چیکۆسلۆڤاکیا دەپەڕێندران، (کارڵ) هەستی بەرگەنەگری بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵ و زێدی خۆی دەنواند، ئارەزوی دەکرد جارێکی دیکە هاوسەرە گەنجەکەی ببینێتەوە، لەگەڵیدا بۆ ئیتالیا ڕابکات،( ئەو پیاوە هەواڵی کوژرانی هاوسەرەکەی نەبوو)، هەستیدەکرد عیشقێکی ئاگرینی بۆ هاوسەرەکەی هەیە و سـەرەنـجام دوانـیـوەڕۆی ڕۆژێـک، بە گۆڕینی سەروفیسالّی، بۆ شاری (لیدیس) گەڕایەوە، کە گەیشتە خانووەکەی پیشووی خۆی، بینی تاریک، کپ، بێدەنگە و لەسەر شەقامەکە وەستا و نوقمی دنیای خەیاڵ بوو، لە هەمان کاتدا دوو پیاوی نزیکەی بەتەمەن بەلایدا تێپەڕین و دوای ئەوەی چەند هەنگاوێک ڕۆیشتن، بزمارکوت وەستان و هەردووکیان ئاوڕیان دایەوە.

(کارڵ) کە بە شێوەیەکی لەناکاو هەستی بە مەترسی کردبوو، گەڕایەوە تا ڕابکات. دەیزانی بە هاتنەناوەوەی هاوپەیمانان جارێکی دیکە جڵەوی دەسەڵات کەوتووەتەوە دەست چیکۆسلۆڤاکییەکان و کاتی تۆڵەکردنەوە هاتووە. یەکێک لەو دوو پیاوانە، کە سیخوڕ بوو، بۆلای (کارڵ) ڕایکرد و دەستگیری کرد، بردی بۆ گرتووخانە. هەرچەند ئەو پیاوە لە سەرەتادا ناسنامەی خۆی ڕەتدەکردەوە، بەڵام ژمارەیەک لە هاوڕێیان و ئاشنایانی ناسنامەکەیان

پشتڕاست کردەوە، بە تاوانی هاوکاریکردنی دوژمن، لە سەردەمی داگیرکرانی وڵاتدا، دادگایی کرا.

بابەتی تاوانەکەی ئاشکراکردنی دوو کەس لە هاونیشتمانانی خۆی، هاوکاریکردنی دوژمن بوو، بەبێ هیچ جۆرە مشتومڕێک بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکرا، بۆ بەیانی سواری ئۆتۆمبێلیان کرد و بەرەو گۆڕەپانی لەسێدارەدانیان برد. (کارڵ) بە درێژایی ڕێگەکە هاواری دەکرد و داوای بەخشین و بەزەیی دەکرد، بەڵام گوێی کەس قەرزداری نەبوو، دوای نیوسەعات، لە دارێکیان بەست و فەرمانی تەقە درا و دەیان گوللە سینگیان دابێژت، کۆتاییان بە ژیانی هێنا.

بەسەرهاتی ڕاستەقینە و سەرسامکاری پیاوێک، کە بە ئازایەتی و کارە سەیرەکانی خۆی، سەرکەوتنی شەڕی دووەمی جیهانی کردە نسیبی هاوپەیمانان.

**سەبارەت بە ئەریك ئەریکسۆنی سیخوڕی گەورە**

کە جەنگی دووەمی جیهانی دەستیپێکرد، خاوەن کۆمپانیایەکی نەوتی سوید ناسراو بە ئەریک ئەریکسۆن، پەیوەندی بە حیزبی نازییەکانەوە کرد، بەڵام هیچ کەس نەیدەزانی پێدەچێت ئەو پیاوە یەکێک بێت لە سیخوڕەکانی هاوپەیمانان. ئەریکسۆن ناچاربوو لە دنیای ترس و لەرزدا و لەگەڵ ئەو پیاوانەدا بژیت، کە لە خوارەوە ناویان دێت:

**هاینریخ هیملەر:**

پیاوێک ئەوەندە کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەخلاق و ڕەفتاری ئەریکسۆنەوە، کە بڕیارێکی تایبەتی بەرپرسییەتی یاسایی بۆ دەرکرد.

**هاریان:**

ژنی جوان و سەرنجڕاکێش، کە لە دژی نازییەکان چالاکی دەکرد، بەنهێنی هاوکاری لەگەڵ ئەریکسۆن هەبوو.

**کلارا:**

ژنێک، زۆر لەبارەی نازیزمەوە دەمارگیر بوو، وەها بیری دەکــردەوە ئەریکسۆن ئـەرکـی گرنگی لـە ڕێگەی بەرزکردنەوەی ئەو هەیە و عاشق و ئەویندار بووە.

**ئۆلریخ:**

سیاسەتکاری ئەڵمانی، لە ئەریکسۆن بە گومان بوو، دڵنیابوو سیخوڕە، بەڵام هیچی لە دەست نەدەهات.

ڕوونکردنەوەیەکی کورت لەبارەی شکستی ئەڵمانیا

ستۆکهۆڵم، سوید، دووی حوزەیرانی 1945 – چۆن هاوپەیمانان بەسەر هاینریخ هیملەردا زاڵبوون، بە لەناوبردنی پیشەسازیی نەوتی خاو لە ئەڵمانیا، سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا. زۆر زوو ئەو نهێنییە ئاشکرادەبێت. گرنگترین هۆکارێک کە بووەهۆی ئەو سەرکەوتنە و ڕێنماییکردنی فڕۆکە و تۆپە دوورهاوێژەکان، ئەریک ئەریکسۆن دەبێت. نیویۆرک تایمز حوزەیرانی 1945.

تێکوپێدانی یەکجارەکیی چاڵەنەوتەکان، زەربەیەکی کوشندەبوو، لێماندرا، چونکە پاشەکەوتی سووتەمەنی ئێمە، هەمووی لەسەر ئەو دامەزراوەیە بونیادنرابوو.

**جەنەراڵ هاینزگۆدریان**

سەرۆکی ڕاوێژکاریی ئەڵمانیا

فەرمانکرابوو تۆپە دوورهاوێژە بەهێزەکان، تەواوی سەرچاوە نەوتییەکانی ئەڵمانیا لەناوبەرن، ئەو تاکتیکە نەک تەنیا زیان بە تەواوی هێزە شەڕکەرەکانی دەگەیەنێت، بەڵکو شکستیشیان پێدەهێنێت.

**دوایت. د ئایزنهاوەر**

تەفروتووناکردنی چاڵەنەوتییەکان، هۆکارێکی گرنگ و کاریگەربوو لە شکستی ئەڵمانیا و ڕزگارکردنی گیانی ملیۆنان خەڵکی سڤیل.

**ڕاگەیەنراوی هێزە ئاسمانییەکانی وڵاتەیەکگرتوەکان**

پێشەکیی نووسەر

پیاوانێکی کەم لە مێژوودا هەن، ئەرکیان بەپێی خێزان بە باش زانیوە و یەکێکیان بووەتەهۆی سەرهەڵدانی کارەساتێکی نێودەوڵەتیی سەیر.

ئەم بیۆگرافییە، بەسەرهاتی پیاوێکە کە خۆبەخشانە سیخوڕی کردووە، ئەرکەکەی ئەوەبووە لەبارەی پاڵاوگای نەوتی نازیی ئەڵمانیاوە زانیاری دەستەبەربکات، بەڵام ئەوەی لە هەمووان گرنگترە ئەوەیە، ئەوساڵانێک لەنێوان ژیان و

مردندا لینگەفرتێی کرد، ژیانی خۆی لە ڕێگەی بەجێگەیاندنی ئـەرک لەدەستدا و لە ئاکامیشدا بـووەهـۆی ئـەوەی، کە هاوپەیمانان لە شەڕی دووەمی جیهان سەربکەون.

(ئەریک ئەریکسۆن)، کە لە سەردەمی گەنجێتیدا یاریزان بـووە، پاشـان بـووەتـە یەکێک لـە نـاودارانـی کۆمپانیای نەوتی تەکساس، بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەرکەکەی خۆی، ناچاربوو هەموو ژیانی خۆی بگۆڕێت، دەست لە کارەکەی بکێشێتەوە، هاوسەرەکەی لەبیرخۆی بەرێتەوە، خێزان و هاوڕێکانی فەرامۆش بکات. بێجگە لەوانە، ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە و ئازادیی خۆی لەدەستبدات. ئەریکسۆن نەک تەنیا سەروسەکوتی گۆڕی، بەڵکو بیریشی گۆڕی.

(ئـەریـکسـۆن) بـۆ دەسـتـەبـەرکـردنـی زانـیـارییـەک، کە هاوپەیمانان پێویستییان پێی بوو، چەندین جار سەفەری کردووە بۆ بەرلین، هامبۆرگ و شارەکانی دیکەی ئەڵمانیا.

(ئەریکسۆن) بۆ مـاوەی چـوار ساڵی تـەواو دەزگـای سیخوڕیی ئەڵمانیا و گشتاپۆی فریودا و توانیی پارێزەرانی بەدەسەڵاتی وەک سەرۆکی گشتاپۆ (هاینریخ میلەر)، کە لە نزیکەکانی ڕایشی سێیەم واتە (هیتلەر) بوو، بدۆزێتەوە.

ئەریکسۆن زۆر لە شار و ناوچە قەدەغەکراوەکانی ئەڵمانیا هاتوچۆی دەکـرد، لەلایەن خـودی (هیملەر)ەوە مۆڵەتنامەی تایبەتی بۆ دەرکرا، کە دەقەکەی بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

### سەرۆکایەتیی دەزگای ئاساییش و پۆلیس و سوپا

شایەتی دەدرێت جەنابی ئەریک ئەریکسۆن، بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی پێویست و گرنگ، کە جێ هۆگری ڕایشن، هەمیشە لە سەفەردا دەبێت. بەو هۆیەوە مۆڵەتی ڕۆیشتنی بۆ تەواوی شوێنەکانی ناوهێنراودا پێدەدرێت، داوا لە تێکڕای پێگە سەربازییەکان دەکرێت، بە هیچ جۆرێک لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی جەنابی (ئەریکسۆن)، سەرپێچی نەکەن و خۆیان نەدزنەوە.

ئەو زانیارییەی (ئەریکسۆن) دەستەبەری کرد، لەگەڵ تەواوی هەواڵ و ڕاپۆرتەکانی هەموو سیخوڕەکان، وایکرد هاوپەیمانان شەڕەکە بەرنەوە، بەپێی نەخشەکانی ئەو سیخوڕە نهێنییە، ناوەندەکانی پیشازیی نەوتی نازی تۆپباران بکەن، خودی ئایزنهاوەر لەو بارەیەوە ڕایدەگەیاند، کە بەبێ بوونی (ئەریکسۆن)، سەرکەوتن مسۆگەر نەبوو.

کاتێک هاوپەیمانان لە 8ی حوزەیران (ئەمەریکا- بەریتانا و ڕووسیا) فەڕەنسای داگیرکراویان لە سەربازانی نازی پاککردەوە، بێجگە لە چەند فڕۆکەیەکی ئەڵمانی بۆ هێرشکردنە سەر ئەو هێزانەی، کە نێردرابوونە کەناراوەکانی نۆرماندی نەفڕین، بۆچی؟

لێکۆڵینەوە سەربازییەکان نیشانیانداوە، کە هۆکاری ئەو کارە بە پلەی یەکەم بۆردومانکردنی ناوچەکانی چاڵە نەوتییەکان بوو.

چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی هاوپەیمانان بچنە ناو فەڕەنساوە، پەلاماری قورس و تۆقێنەری هێزە ئاسمانییەکان بۆ سەر ناوچەی چاڵە نەوتییەکان وایکرد، کە لەلایەن هێزە ئاسمانییەکانی (لوفت واف)ەوە ژمارەیەکی زۆر فڕۆکە بۆ پاراستنی پاڵاوگە گەورەکان، بنێردرێت (هەرگیز لە هەموو پەلامارە ئاسمانییەکان سوود لەو فڕۆکانە وەرنەگیرابوو، چونکە گۆرینگ، سەرۆکی هێزە ئاسمانییەکانی نازی، فەرمانی کردبوو تەنیا کاتێک سوود لەو فڕۆکانە وەربگیردرێت، کە ئەگەری پەلاماری هاوپەیمانان، لە ئان و سات دابێت.)

ئەو کارە وایکرد فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لە جێگەیەک و بە شیوەی بەکۆمەڵ، فڕۆکەکانی (لۆفت ولف) تێکبشکێنن. لە مانگی ئادار 1944، نزیکەی دوو هەزار و پێنج سەد فڕۆکەی شەڕکەری ئەڵمانیا تێکوپێک دران.

هەموو پەلامارەکانی هێزەکانی هاوپەیمانان بۆ ناوچەنەوتییەکان، وایکرد گۆرینک، بەناچاری فڕۆکە زیان پێنەگەیشتوەکان بنێرێتە کەناراوەکانی فەڕەنسا.

دوای چەند هەفتەیەک (ئەدۆلف هیتلەر)، پێشەوای نازیی ئەڵمانیا نامایەکی لەلایەن (ئەلبێرت سپەیر)، سەرۆکی کەلوپەلی سەربازییەوە پێگەیشت، کە دەقەکەی لە خوارە هاتووە:

بەڕێز: ئەگەر نەتوانین بەرگری لە ناوچەی چاڵە نەوتییەکان بکەین، کەلێنێکی قووڵ لە پاشەکەوتی سووتەمەنی و پیشەسازیی نەوتمان بۆ دروستدەبێت، تا مانگی ئەیلوول، ئێمە ناتوانین پاشەکەوتی پێویست بۆ (ورماخت) ئامادەبکەین. هایل هیتلەر!

**ئەلبێرت سپیەر**

(ئەریک ئەریکسۆن)، کە ڕێک شوێنی پاڵاوگەکانی بۆ هاوپەیمانان ئاشکرادەکرد، هەروەک پێشوو لە شارەکانی ئەڵمانیا تەراتێنی بوو، تا بەڕووکەش لە بارودۆخی وڵات و خەڵک بکۆڵێتەوە.

هەر لەو ساڵانەدا، ڕۆژنائادار نیۆیۆرک تایمز پەردەی لەسەر ئەرکەکەی (ئەریکسۆن) لادا و من (نووسەر) بە خوێندنەوەی ئەو هەواڵە، کە دوای ساڵانێک دەستم کەوت، بڕیارمدا بەسەرهاتی ئەریکسۆن ڕێکبخەم و بیکەمە کتێبێک و خۆشبەختانە بە سوود وەرگرتن لە یاداشتەکانی خودی خۆی و پرنس کارڵ و دۆسێکانی پۆلیس، توانیم ئەو کارە بکەم.

ئەوەی وایلێکردم بەسەرهاتی (ئەریکسۆن) بگێڕمەوە، تەنیا کارە سەیر و ناوبانگییەکەی نەبوو، بەڵکو ئەو خاڵانە بوو منیان سەرسام کرد، توانا، ئیرادە،، هێز و شارەزایی

مرۆڤێک. ئەریکسۆن بۆ خۆی خاوەن کۆمپانیای نەوت بووە، هەرگیز لە کاری سیخوڕی شارەزا نەبووە، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کەسێکی ئەوتۆ ببێتە شارەزاترین سیخوڕی سەرکەوتووی دنیا، کە لە ماوەی خزمەتکردنیدا هیچی وەرنەدەگرت و تام و چێژیشی لە کارەکەی نەدەبینی.

لێرەدا پرسیارێک دێتەپێش، کە بۆچی ئەو پیاوە بەو ماوە دووررودرێژە، ئەرکێکی وەهای هەڵبژارد؟

زۆرکەس لە دنیادا هەن، کە خۆبەخشانە چەک هەڵدەگرن و دەچن بۆ شەڕی دوژمن، ئەو هۆگرییە جگە لە ئارەزوویەکی دەروونی و شکستی ڕۆحی، یان دانەوەی قەرز بە نیشتمان، ناتوانیت بە هیچ شتێکی دیکەی لێکبدەیتەوە.

(ئەریک ئەریکسۆن) و پرنس (کارڵ بێردنارت) (هاوڕێ و هاوکاری دڵسۆزی ئەریکسۆن)، پاڵەوانانی سەرەکیی ئەو بەسەرهاتەن و ناوەکانیان هەر ئەو ناوانەن، کە نووسراوە، بەڵام لە زۆربەی سەرچاوەکاندا، بێجگە لە کەسایەتیی مێژوویی، ناوێکی زۆر بە هۆکاری سیاسی، یان بەهۆی لە ژیاندابوون، یان پەیوەندیی دەستەبەر نەکردنی ئیزنی خزمەکانیان، گۆڕاوە و هەر بەو هۆیەشەوە، لە بڵاوکردنەوەی هەر جۆرە وێنەیەک خۆ بەدووردەگیردرێت. لەناو ئەو وێنانەی دەستکەوتوون، وێنەی ژنێک هەیە، کە پەیوەندیی بە (ئەریکسۆنەوە) هەبووە.

من ئەو بەسەرهاتەم بە دەستەبەرکردنی مۆڵەتی دەسەڵاتدارانی حوکومەت، سیاسی، لەسەر بنچینەی دۆسیە و بەڵگەی هەبوو ڕێکخستووە بەو شێوەیەی نووسراوە، بێجگە لە گۆڕینی ناوی چەندکەسێک، هیچ جۆرە گۆڕانکارییەکی دیکە لەم کتێبەدا نەکراوە و ڕەسەنێتییەکەی پارێزراوە.

**ئەلێکساندەر کلین**

**-1 هاتنەئاراوەی سیخوڕێك**

ئەم بەسەرهاتە لە مانگی کانونی یەکەمی 1936 ڕوویداوە، لەو مێژووەدا (لارنس شتاین – هارت، باڵوێزی گەورەی ئەمەریکا لە ڕووسیا) بە بڕیاری پرێزدنت ڕۆزفلێت بە فڕۆکە بەرەو (ستۆکهۆڵم) ڕۆیشت.

سێی مانگی تتشرینی دووەم، سەربازەکانی سۆڤێت (فنلەندا) یان داگیرکرد، دەیانویست ئارەزووەکانی خۆیان بسەپێنن و ئەرکی نهێنیی (شتاین هارت ئەوەبووە لە (ستۆکهۆڵم) چاوی کەوتووە بە باڵوێزەکانی سۆڤێت و فنلەندا، کە بێلایەن بوون و پێشنیازی کۆنفرانسی ئاشتی بکات، تا هەرچی زووترە کۆتایی بە شەڕ بهێنرێت. شکستی (شتاین هارت) لەم ئەرکەدا بڕیاری مردنی هەبووە، بەڵام لەو ماوە کەمەی مانەوەی لە پایتەختی (سوید)، ئەرکێکی دیکەشی بە ئەنجام گەیاند، کە لە هەندێک لایەنەوە لە یەکەمیان گرنگتربوو.

سێیەم شەو کە (شتاین هارت) لە (ستۆکهۆڵم)ی پایتەختی سوید بەسەری برد، بانگهێشتکردنی هاوڕێی دێرینی (ئەریک ئەریکسۆن) بوو، تا نانی ئێوارە لە گراند ئوتێل بەیەکەوە بخۆن. شتاین هارتی باڵوێزی گەورەی ئەمەریکا ئەو شەوە لەگەڵ (ئەریکسۆن) باسی هەمووشتێکیان کرد. لەو کاتەدا، تۆپە دوورهاوێژەکان بە ناوی – (لوفت واف) و دەبابەکانی (پانزەر)ی ئەڵمانی، لە ماوەی کەمتر لە سێ هەفتە، پۆڵەندایان لەگەڵ زەوی تەختکردووە،میللەتێکیان بەدیل گرتبوو، کە ئەڵمانیا دوای ئەمە سەرنجی زۆری خۆی تایبەت دەکات بە مەغریب، فەرەنسا و بەریتانیا.

(شتاین هارت) لە کاتی نانخواردندا، ڕووی لە (ئەریکسۆن)ی هاوڕێی دێرینی خۆیکرد، وتی: ئەوەی مسۆگەرە ئەوەیە، کە ئێمەی ئەمەریکییش درەنگ یان زوو، ناچاردەبین بچینە شەڕەوە. (ئەریکسۆن) کە باڵای بەرز بوو، سەری لەقاند و وتی: هیچ گومانێک لەوبارەیەوە نییە، بێجگە لە ئەرکی ئەخلاقی، ئەمەریکا ناتوانێت ڕێگەبدات نازییەکان تەواوی ئەورووپا داگیربکەن. (شتاین هارت) لە کاتی قسەکردندا بەئەنقەست وتبووی (ئێمەی ئەمەریکی)ش درەنگ، یان زوو دەچینە شەڕەوە و ئەم دەستەواژەیە (ئێمەی ئەمەریکی)، (ئەریکسۆن) ناگرێتەوە. چونکە هەرچەند ئەو پیاوە ساڵی 1888 لە ئەمەریکا لەدایکببوو، لەگەڵ ئەوەشدا نیوەی ئەو

وڵاتە گەڕابوو، لەو کاتەدا بە خاوەن گرنگترین و پڕداهاتترین کۆمپانیای نەوتی سوید ئەژماردەکرا. (ئەریکسۆن) لە کاتێکدا بزەی لەسەر لێوبوو، پرسیی: جەنابی شتاین هارت بڵێ بزانم ئایا میللەتی ئێوە بڕیاری شەڕی داوە، یان وەکو جاری پێشوو، تەنیا بانگەشەی ئەو کارە دەکەیت؟

(شتاین هـارت) وەڵامـی دایـەوە: ئـاخ، ئـەم جارەیان ئـەو بابـەتـە بەتێکڕا لـەگـەڵ پێشوو جیـاوازە و منیش دەمەوێت لەوبارەیەوە قسەت لەگەڵ بکەم؟(ئەریکسۆن) بەسەرسامییەوە پرسیی: ئایا تۆ بەڕاستی دەتەوێت ڕاوێژ بە من بکەیت؟

ئەریکسۆن بەسەرسامییەوە وەڵامـی دایـەوە: بەڵێ هەڵبەتە، بـەڵام پێموانییە بـەو تەمەن و سـاڵـەوە بتوانم بەکەڵکی سوپای ئەمەریکا بێم، چونکە بێگومان ئێوە پێویستتان بە سەربازانی پەنجاساڵە نییە. (شتاین هارت) بە بیرکردنەوەوە وتی: ئەریک، لەوانەیە تۆ بتوانیت خزمەتێک ئەنجامبدەیت، کە هەرگیز بە خەیاڵتدا نەهاتبێت. تۆ زمانی ئەڵمانی بـاش دەزانـیـت و پێشتریش مامـەڵـەی نەوتیی گرنگت لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی ئەڵمانیا ئەنجامداوە، بێجگە لەمانە، تۆ هەمیشە لە کارەکانت زیرەکی و وریاییت بەکارهێناوە و هەر بەو هۆیانەوەش من داوات لێدەکەم، خۆبەخشانە خزمەتێک ئەنجام بدەیت .

(شتاین هارت) لێرەدا بێدەنگ بوو، دوای کەمێک بەردەوام بوو، ئەرکێک کە پێویستە ئەنجامی بدەیت، ئەوەیە جارێکی دیکە گرێبەستەکەت نوێ بکەوە و بە ناوونیشانی بازرگانی، پاسپۆرتی چوون بۆ ئەڵمانیا دەستەبەربکە و برۆ بۆ ئەو وڵاتە. لەوانەیە بتوانیت زانیاریی بەسوود بەدەستبهێنیت، ئەو زانیارییە یارمەتیی ئینگلیز و ئەمەریکییەکان دەدات تا سووک و ئاسان، پاڵاوگەی نەوتی نازییەکان بۆردومان بکەن. (ئەریکسۆن) بە بیرکردنەوەوە لە پەرداخە مەشروبەکە ڕاما و وەڵامی دایەوە: دەزانیت ئەو کارە ئەوەندەش ئاسان نییە، هیچ کەس وەک یەکێک لە پەیڕەوانی هیتلەر ناناسن، چونکە بەڕەگەز ئەمەریکیم، بۆیە وەک تاکێکی سویدی ناتوانم کاریگەریم بەسەر ئەڵمانییەکانەوە هەبێت.(شتاینهارت) وەڵامی دایەوە: تۆ پیاوێکی بازرگانی و پەیوەندیت بە مامەڵەی پڕداهات و گرنگەوە هەیە و لە ئێستا بەدواوەش وردە وردە ڕواڵەتی نازییەک بگرەبەر.

(ئەریکسۆن) ناوچاوانی گرژکرد و وتی: بەڵام پێموانییە ئەگەر من ببمە نازییەک و پەیڕەوی هیتلەر، خێزانەکەم لە ئەمەریکا و هاوڕێیانم لە سوید، شانازیم پێوەبکەن.

(شتاین هارت) سەری ڕاوەشاند و وتی: بەڵێ ڕاستە، بەڵام ئەریک ئەوەی ئێمە لە تۆی داوادەکەین ئەنجامی بدەیت، تۆ ناتوانیت ڕاستییەکان لای هاوڕێکانت بدرکێنیت،

ئەگەر ڕازیبیت لەگەڵماندا کاربکەیت، پێویستە خۆت بۆ زۆر لە ناموراديیەکان ئامادە بکەیت. بێجگە لەوانە، کاری سیخوڕی وەک قومار وایە، بردنەوە و دۆڕانـی هەیە و ئەگەر... (ئەریکسۆن) خێرا قسەی باڵوێزی بڕی و وتی: زۆرباشە لارنس، من لە مەبەستەکەت دەگەم، ڕازیم لەگەڵ ئێوە کاربکەم.

– زۆر باشە. بە باوەڕی من باشترە تۆ داوی خۆت بە دەوری نازییەکاندا ڕایەڵە بکەیت،من کارمەندانی سیخوڕیی خۆمان لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا ئاگادار دەکەمەوە، کە تۆ بۆ خۆت داوای ئەنجامدانی ئەو کارەت کردووە و پاشان کە کاتی هات، ئەوان پەیوەندیت پێوەدەکەن و بڕیاری پێویست دەردەکەن. من ئێستا ناوی کەسێکت پێدەڵێم، بەڵام هەوڵبدە تا کاتی زۆر پێویست پەیوەندی پێوە نەکەیت. ئەو کەسە (مـازۆر ریچارد برادلی) نـاوە، سەربە بەشی سەربازی باڵوێزخایە.

(ئەریکسۆن) بۆئەوەی ئەو ناوەی لەیاد بمێنێت، لەژێر لێوانەوە دووبارەی کردەوە.

(شتاین هارت) بە جەختکردنەوە وتی: ئەگەر بابەتێکی زۆر پێویست هاتەپێش، تۆ پەیوەندی بە ماژۆر (برادلی) یەوە بکەی، پێویستە هێمای ڕەمزێک بڵێی و ئەوەندە بەسە، لە تەلەفۆنەکەدا بڵێیت (من هاوڕێی لارنسم) و بێجگە لەمانە،

لە کاتی پەیوەندیکردن پێوەی، تەنیا سوود لە تەلەفۆنی گشتی وەربگرە، کە لەسەر شەقامەکاندا زۆرن ، خودی (برادلی)، چاوپێکەوتنەکە ڕێکدەخات.

- زۆر باشە.

شتێکی دیکە، من دەزانم تۆ پارەت بەلاوە گرنگ نییە، بەڵام هەڵبەتە ئێمە بودجەی پێویستت بۆ دابیندەکەین.

- زۆر باشە ڕازیم.

(شتاین هـارت) دریـژەی پێدا: بـەڵام لەوانەیە زۆری پێبچێت تا جەنابی (برادلی)، یان کارمەندەکانی دیکەی ئێمە پەیوەندیت پێوە بکەن.

هێشتا ئەمەریکا نـەچووەتـە شــەڕەوە و لـە ئێستادا هەموو هێزەکانمان لە بەرەی خۆرئاواوە کۆبوونەتەوە. بێجگە لەمانە، هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا و فەڕەنسا لە دۆزینەوەی شوێنی چاڵە نەوتەکانی ئەڵمانیا، تووشی کێشە بوون و ناتوانن بەئاسانی بۆردومانی بکەن. لەوانەیە کاتێکی زۆر بخایەنێت تا تۆ ڕواڵەتی خۆت بگۆڕیت.

(ئەریکسۆن) سـەری لەقاند و وتـی: بەڵێ ئـەو کارە هەندێک کاتی دەوێـت، بـەڵام ئایا مەبەستی ئێوە ئەوەیە جەنابی (برادلی)، تا ئەمەریکا نەچێتە شەڕەوە، پەیوەندی بە منەوە ناکات؟

- نەخێر، نەخێر، پێویستیش ناکات تۆ چاوەڕوان بیت

پەیوەندیت پێوە بکات. کارمەندانی ئێمە یارمەتیی دەزگای سیخوڕیی (دەزگـای ئەنتلیجێس)ی بەریتانی دەدەن، هاوکارییان دەکەن و وەک بەریتانیا لە ئێستادا چووەتە شەڕەوە، کەوایە هەر هەنگاوێکی سیخوڕی ئەنجامبدەین، تەنانەت ئەگەر ئێمە پەلکێشی شەڕیش نەکرێین، بە قازانجی حوکومەتی هاوڕێکەمان بەریتانیا تەواودەبێت. تۆ دەبێت زانیاری سیخوڕیی خۆت بۆ ئێرە، واتە ستۆکهۆڵم بنێریت و ئەو زانیارییە لێرەوە دەنێردرێتە بەریتانیا.

- زۆر باشە.

(شتاین هـارت) هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: ئەوەشت پێبڵێم، تۆ پێویستە تا لەلایەن (برادلی)یەوە فەرمان وەرنەگری، سەفەر بۆ ئەڵمانیا مەکە و تا ئەوکاتەش، لێرە هاوکاریی حیزبە نازییەکان بکە و نەخشەی هاوڕێیەتی بڕێژە، تەنانەت ئەگەریش کرا، ببیتە ناسیاوی دەسەڵاتدارە باڵاکانی باڵوێزخانەی ئەڵمانیا، بەڵام ئەگەر بارودۆخەکە پێچەوانە بوونەوە، سەفەری تۆ بۆ ئەڵمانیا بەپەلە و بەم نزیکانە بێت، یەکسەر تەلەفۆن بۆ (برادلی) بکە و فەرمان لەو وەربگرە.

(ئەریکسۆن) سـەری ڕەزامـەندی لەقاند و وتـی: زۆر باشە و تۆ چیت وت، من جێبەجێی دەکەم.

(شتاین هارت) پەرداخەکەی پڕکرد لە مەشرووب و لە

کاتێکدا پەرداخەکانیان بە هیوای سەرکەوتنی (ئەریکسۆن) بە سەرەوەدەنا، باڵوێزی گەورە وتی: باشە ئەریک ئیزنم بدە بڕۆم، چونکە پێویستە کارەکانم بکەم.

- تکا دەکەم.

لە کاتێکدا هەردووکیان دەستی یەکتریان دەگوشی، (شتاین هارت) وتی: ئەریک جارێکی دیکە لە ناخی دڵمەوە سوپاست دەکەم و هیوادارم سەرکەوتووبیت.

***

(شتاین هـارت)، باڵوێزی گـەورەی ئەمەریکا لە دوو ڕووەوە بە هۆکاری شیاو (ئەریکسۆن)ی بۆ ئەنجامدانی ئـەرکی سیخوڕی دیـاریـکـردبـوو. (ئـەریـکـسۆن) بەهۆی خاوەن بوونی چەند کۆمپانیای نەوت و هەبوونی پاڵاوگەی جیاجیا لە سەرتاسەری جیهان، نازناوی سەرمایەداری سەرکەوتووی وەرگرتبوو. (ئەریکسۆن) دوای تەواوکردنی قۆناغی دواناوەندی لە ئەمەریکا، سەفەری دوورودرێژی کردووە، لە تەکساس لە چەند کۆمپانیای نەوتی کاریکردووە، پاشان وەک ئەندازیاری ڕاکێشانی بۆری نەوتیی ناسراو (ستاندارد)، ئەرکی پێسپێردرابوو، وردە وردە پلەی بەرز بـووەوە، پەیتا پەیتا لە پاڵاوگەی نەوت دەستبەکار بوو، بووە یاریدەدەری سەرۆکی پاڵاوگە.

(ئەریکسۆن) بەو کارە ڕازی نەبوو، بەهۆی هەبوونی

بڕێک پارە، بەشی ئەندازیاری نەوتی خوێند، بەڵام شەڕی یەکەمی جیهانی ڕوویدا، بانگهێشتی سەربازی کراو دوای تەواوبوونی شەڕ، جارێکی دیکە دەستیکردەوە بە خوێندن. ئەریکسۆن یاریزانێکی زۆر بەناوبانگ بوو، لە تەمەنی 33 ساڵیدا (واتە تەمەنێک، کە پیاوەکان تێیدا سەوڵی لاقەکانیان لێدەدەن و لە داهاتەکانی خۆیان دەخۆن)، کۆلێژی نەوتی تەواوکرد، لەلایەن کۆمپانیای نەوتی (ستاندارد)، وەک نوێنەری فرۆشتن ڕەوانەی چین کرا، چەند ساڵ لەو وڵاتە و لە کریساهای شانگهای ژیا و لەکۆتاییدا بۆ سوید گوازرایەوە، بووە سەرۆکی چالاکیی کۆمپانیای نەوتی تەکساس و هەر لەو وڵاتەدا بوو، کە ئەریک ساڵی 1920 بۆ خۆی خەریکی کار بوو، کۆمپانیای نەوتیی بۆ خۆی دامەزراند، بۆئەوەی مامەڵەی نەوتی ئەنجامبدات، چەندین جار بۆ تاران، لەندەن، بەرلین، بەغداد، بووخارست، هۆنگ کۆنگ، شانگهای و تۆکیۆ سەفەری کرد. لە سەرەتای ساڵی 1930، کاتێک سۆڤێت تەکنیکار و ئەندازیارانی نەوتی ئەمەریکی و بەریتانی دادەمەزراند، (ئەریکسۆن)یش سەفەری بۆ ڕووسیا کرد و لەوێ چاودێریی دروستکردنی پاڵاوگەی کرد لە (باکۆ).

(ئەریکسۆن) وردە وردە تێگەیشت، کە سوید ناوەندی سەرەکیی چالاکییەکانی دەبێت و لەبەرئەوە داوای لە

حوکومەتی سوید کرد، ببێتە هاووڵاتیی سوید و ئەوەندەی نەبرد، بووە هاووڵاتی سوید و بەو شێوەیە ساڵی 1939 کاتێک (لارنس شتاین هارت) داوای لێکرد سیخوڕی بۆ ئەمەریکا بکات، یەکسەر قبووڵیکرد، چونکە وڵاتی ئەسڵی و نیشتمانی خۆی خۆشدەویست، ئامادەبوو هەموو قوربانییەک لەو ڕێگەیەدا بدات.

***

هەفتەیەک دوای ئەوەی باڵوێزی گەورە بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، (ئەریکسۆن) پەیتا پەیتا ڕواڵەتی خۆی گۆڕی و بە شێوەیەک وای نواند، کە مەرامی گۆڕاوە و بەلای نازییەکاندا دەکەوێت و هەرکەس کە گاڵتەیەک و نموونەیەکی دژی نازییەکان هێنابایە سەرزمان ئیدی پێنەدەکەنی، بەڵام لە هەمووی گرنگتر هەودای مامەڵەی لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەڵمانیا کردەوە، وردە وردە بووە ئاشنای خودی باڵوێزی گەورەی ئەڵمانیا لە سوید.

بۆ ماوەی سێ مانگی تەواو درێژەی بەو کارەی دا، هیچ کام لە کارمەندانی سیخوڕیی ئەمەریکا پەیوەندیان پێوەنەکرد، تا لە کۆتایی 5ی مانگی ئادار 1940، بە هۆی کەسێکەوە یاداشتێکی بۆ بردە ماڵەوەیان، دەقی ئەو یاداشتە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

ئەو بەڵێنەی بە لارنست دا، بەوپەڕی دیقەت و بەباشی جێبەجێت کرد، مافی ئەو ماندوبوونەی خۆت وەردەگریتەوە. هەرکاتێک پێویستی کرد، تەلەفۆنم بۆ بکە. بە هیوای سەرکەووتن.

**ڕیچارد**

ئەریکسۆن کە بە وەرگرتنی ئەو پەیامە لەلایەن (ڕیچارد ردلی)، سەر بە بەشی سەربازیی ئەمەریکا دڵی درابووەوە، درێژەی بە ڕواڵەتی نازیبوونی خۆی دا.

ئەڵمانییەکان لە سەرەتای نیسانی ساڵی 1940، دانیمارک و نەرویجیان داگیرکرد، سوپای نازی دزەی کردووەتە فەرەنساوە، لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیران، وڵاتانی هۆڵندا و بەلجیکا شکستیان هێنا و ئیتالیاش بە لایەنگری کردنی ڕایشی سێیەم (هیتلەر)، چووە شەڕەوە.

لە سەرەتای ساڵی 1941 دەنگۆ بڵاوبووەوە، کە سویدیش بەزوویی داگیردەکرێت. (ئەریکسۆن) هەروەک درێژەی بە ڕواڵەتسازی دەدا، بە شێوەیەک لەناو کۆمەڵدا ڕەفتاری دەکرد، کە هەموان وەک نازییەکی دەمارگیر بیناسن. ئەو ناوە ناوە نامەی لە (ڕیچارد)ەوە پێدەگەیشت و دووجاریش (ڕیچارد برادلی) تەلەفۆنی بۆ کرد، بە هەمان تۆنی ناڕوونی نامەکانی، ڕایگەیاند کە بەم زوانە ڕۆژی کارکردنی دەگات، پێویستە ئەو، بەری ئەو دارە ببینێت، کە ڕواندوویەتی.

(ئەریکسۆن) لە سەرەتای ساڵی 1940، عاشقی ژنێکی سویدی بوو بە ناوی (ئینگرید هۆلنورم)، بەڵام (ئینگرید)، کە بە جیاوازیی مەرامی خۆی لەگەڵ ئەو پیاوە زانی، خۆی لە هاوسەرگیریکردن لەگەڵی بەدوورگرت. (ئەریکسۆن) دەیویست ڕاستییەکانی پێ بڵێت، بەڵام دیسانەوە ئەندرژ (شتاین هارت)ی بیردەکەوتەوە و بێدەنگ دەمایەوە. تەنانەت چەندجارێک بڕیاریدا تەلەفۆن بۆ باڵوێزخانە بکات و (برادلی) لە وازهێنانی خۆی ئاگاداربکاتەوە. لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوە، کە لە پەیوەندیکردنی بە جەرگەی سیخوڕان تێدەپەڕی، هیچ سیخوڕێکی ئەمەریکای نەدیتبوو.

### 2- بڕیارێکی یەکجارەکی و گران

ڕێک ساڵێک و حەوت مانگ لە یەکەمین جارێک کە (ئەریکسۆن) باڵوێزی گەورەی بینی تێدەپەڕی، لەناکاو زرەی زەنگی تەلەفۆنی ماڵەوەیان هەستا، دەنگی (ڕیچارد برادلی)، کە بە زمانی سویدی قسەی دەکرد، بەرزبووەوە و وتی: ئەلۆو، من لەبارەی بەڵێنەکەی (لارنس)ەوە قسەدەکەم، ئایا دەتوانیت بەیانی سەعات 10ی شەو سەردانمان بکەیت؟

0(ئەریکسۆن) بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، ناوونیشانی شوێنی چاوپێکەوتنەکەی پرسی.

(ڕیچارد) ئەدرەسی ماڵەوەی پێدا و پاشان گوشییەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە. ئەو کەسانەی کە شەوی داهاتوو (ئەریکسۆن) چاوی پێیانکەوت، دوو کەس بوون و هەردووکیان بە ئەندامی باڵای دەزگای سیخوڕیی ئەمەریکا ئەژماردەکران، لەبەر ئەوەی ناوەکانیان لێرە گۆڕاوە بە ناوی خوازراوی مازۆر (ڕیچارد برادلی) و سەرهەنگ (تۆماس مانسفێلد)ەوە دەناسرێن.

ئەو شەوە لە کاتی قسەکردندا (برادلی) ڕایگەیاند: جەنابی ئەریکسۆن ئێمە زانیاریمان هەیە کە جەنابی باڵوێز (شتاین هارت) چاوی بە تۆ کەوتووە، تۆ خۆبەخشانە ئامادەبووی چالاکیی سیخوڕی ئەنجامبدەی. هەڵبەتە ئەو گفتوگۆیەی تۆ لەگەڵیانتدا کردووە، پێش دوو ساڵ، واتە ساڵی 1939 ئەنجامدراون، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا، ئێمە بەوردی چاودێریی تۆمان کردووە، تەواو دڵنیابووین لە ئەنجامدانی ئەرکی خۆت سەرکەوتودەبیت. کارمەندانی ئێمە ڕایانگەیاندووە تۆ بەباشی ڕۆڵی خۆت دیتووە، لە بەرچاوی خەڵکدا، نازییەکی دەمارگیریت.

(ئەریکسۆن) سوپاسی کرد، بەڵام من نازانم تۆ دەتەوێت چ ئەرکێکم پێ بسپێریت.

(برادلی) بزەی هاتە سەرلێوان و وتی: ئەو زانیارییەی ئێمە لە تۆ دەمانەوێت، هەرگیز لە ستۆکهۆڵم دەستەبەرناکرێن،

پێویستە تۆ ڤیزای چوونە خاکی ئەڵمانیاوە ئامادە بکەیت.

(ئەریکسۆن) سەری لەقاند و وتی: یەکەم جار کە قسەم لەگەڵ (شتاین هارت) کرد، ئەوان ئەو بابەتەیان پێ وتم.

(برادی) بەردەوام بوو: ئەریکسۆن، کاتێک پێت خستە خاکی ئەڵمانیاوە، بێشک ژیانت دەکەوێتە مەترسییەوە، ئەگەر پەی  بە مەبەستی سەرەکیی تۆ ببرێت، بێگومان وەک سیخوڕ لەسێدارەت دەدەن.

سەرهەنگ (مانسفیڵد)، کە لە سووچێک دانیشتووە و بێدەنگ جگەرە بە بادا دەکات، چووەتە ناو قسەکانەوە و جەنابی ئەریکسۆن ئێمە هەرگیز ناچارت ناکەین، ئەو  ئەرکە ئەنجامبدەیت و هەر هێندە دەڵێم هەر جۆرە زانیارییەک،  کە ڕێنمایی فڕۆکەکانی بەریتانیا بکات، لە بۆردومانکردنی پاوڵاگە نەوتییەکانی ئەڵمانیا، سوودی لە تێکشکانی ئەو وڵاتەدا دەبێت. نەوت لە گرنگترین هۆکارەکانی شەڕە و سەرنج بەوەی، کە ئەڵمانیا نەوتی زۆر نییە و بۆیە بە بۆردوومانکردنی پاڵاوگەکانی، هیتلەر چۆک دادەدات. هەڵبەتە تۆ ئەو زانیارییەی دەستەبەری دەکەیت، بۆ ئێرە، تەلەفۆن بۆ ستۆکهۆڵم دەکەیت و ئێمەش دەزگای سیخوڕیی بەریتانیای لێ ئاگاداردەکەینەوە، ئێمە لە تۆمان دەوێت بڕیاری خێرا و یەکجارەکیی خۆت بدەیت. تۆ ئارەزومەندانە هاتوویتە ناو دنیای سیخوڕان و ئەگەر

دەزانیت لە داهاتوودا واز لەو کارە دەهێنیت، وا باشترە هەر ئێستا بەپەلە و بەبێ پەردە بیلێیت. لەبیرتان نەچێت ئەو کارە مردن و لەناوچوون و بێجگە لەمانە ڕق و بێزاریی هاوڕێیانی بەدواوەیە.

(ئەریکسۆن) پێکەنی و وتی: بەڵێ، ئێستا ژمارەیەک لە هاوڕێیانم، کە دەزانن پەیوندیم بە حیزبی نازییەوە کردووە، دڕدۆنگن.

(ئەریکسۆن) بەنیگەرانییەوە لە خەیاڵ ڕاچوو. کاتی بڕیاری کۆتایی و یەکجارەکی هاتبوو. ئەگەر ئەو کە هاووڵاتی سوید بوو، (سویدیش لە شەڕدا بێلایەن ئەژمار دەکرا) درێژەی بە هەمان کاری بازرگانیی خۆی دەدا، نەک تەنیا هاوڕێکانی، بەڵکو تەنانەت کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەڵمانیاش پەیوەندییان لەگەڵدا دەبوو، بەڵام بێجگە لەوە، ئەگەر ڕەزامەندیی خۆی بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەو وڵاتە ڕادەگەیاند، بێگومان هاوڕێیانی سویدی و ئەمەریکی، لێی دڵگیردەبوون. (چونکە ئەو پیاوە بەڕواڵەت ببووە نازی.) پاشانیش ئەگەر ئەڵمانییەکان دەزانن ئەو سیخوڕە، مامەڵەکەی خۆیانی لەگەڵ تێکدەدەن. (ئەوەش لە کاتێکدابوو کە دەستگیردەکرا و ناکوژرێت.)

(ئەریکسۆن) دوای کەمێک بیرکردنەوە، سەرەنجام وتی: بێگومان من مەبەستمە لەگەڵ ئێوە کاربکەم و لەسەر

بەڵێنی خۆمم، کە بە (شتاین هارت)م داوە، بەڵام ئەگەر ئاگاداربیت دوو ساڵ بەسەر گفتوگۆی من لەگەڵ جەنابی باڵوێز تێدەپەڕێت و لەو ماوەیەدا ژیانی من لەگەڵ پێشوو، بە تێکڕایی گۆڕاوە و ئێستا بڕیارمداوە هاوسەرگیری بکەم. کەوایە ئەگەر کێشە نەبێت، من لەوبارەیەوە قسە لەگەڵ دەزگیرانەکەم دەکەم.

سەرهەنگ مانسفیڵد قسەکەی پێ بڕی و وتی، قسەکەت لۆژیکییە، بەڵام نابێت دەزگیرانەکەت ڕاستییەکە بزانێت.

– بەڵام تەواو لێی دڵنیام و ئەگەر پێیبڵێم ئەرکێکی ئەوتۆم هەیە، لە هیچ شوێنێک لەو بارەیەوە نقەی لێوەنایەت.

(برادلی) بیرکەرەوانە شانەکانی هەڵتەکاند و وتی، ئێمە نامانەوێت ئەو کارەی تۆ بە لاڕێدابەرین و ئەگەر دڵنیای دەزگیرانەکەت ژنێکە سەری خۆتی پێ بسپێریت، دەتوانیت لای ئەو دەردەدڵ بکەیت، بەڵام هەڵبەتە وردەکاریی کارەکە، ناو و ناوونیشانی ئەو خانووەی پێ مەڵێ و بەنهێنی بیهێڵەرەوە.

(مانسفیڵد) بەردەوام بوو: حوکومەت ئەوەی دەوێت، کە هیچ کەس لە وردەکاریی ئەو کارە ئاگادارنەبێت.

(برادلی) کۆکەیەکی بۆ کرد و وتی: ئێمە دووبەیانی تەلەفۆنت بۆ دەکەین، وادەی چاوپێکەوتنی داهاتوو دیاریدەکەین، بەڵام ئەو خاڵەت پێدەڵێین زۆر گرنگە،

که تەلەفۆنت بۆ دەکـەم و دەڵێم بەیانی وەرە شوێنی چاوپێکەوتنەکە، بزانە دەبێت ڕۆژێک درەنگتر لەو وادەیە بێت، کە بۆت دیاریدەکەم، واتا لەجیاتی گریمان دوو شەممە، سێشەممە وەرە و ئەگەر لە تەلەفۆندا وادەی چاوپێکەوتنم دوای سەعاتێک دیاریکرد، تۆ دوای دوو سەعات ئامادە بە، ئەو خۆپارێزییە بۆئەوەیە نـەوەک کەسێک گوێی لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەمان بگرێت.

(ئەریکسۆن) سەری لەقاند و وتی: بەڵێ. دەزانم.

(برادلی) ئەو کارتەی بە ئەریکسۆن دا، ناوونیشانی ئەو خانووەی لەسەر نووسرابوو، کە کەوتبووە شەقامی (ئارساگانان) و ڕایگەیاند یەکتربینینی داهاتوومان لەم شوێنەدا ئەنجامدەدریت.

(ئەریکسۆن) هەروەک چۆن هاتبوو، بەو جۆرە ئەوێی بەجێهێشت و لە کاتێکدا لەو خانووە دووردەکـەوتـەوە، بـەردەوام لە هەر چـواردەوری خۆی دەڕوانـی، تا نەوەک کەسێک لەو دەوروبەرە بێت، بیبینێت و بەو کارە هەستیکرد یەکەم هەنگاو دەهاوێت لە ڕێگەی کارێکی سیخوڕانە.

***

بۆ شـەوی داهاتوو، (ئەریکسۆن) دەزگیرانەکەی بۆ نانی ئێوارە بردە چێشتخانەیەک و دوای نانخواردن، هەردووکیان لەژێر تریفەی مانگەشەودا پیاسەیان کرد، (ئینگرید) دوای

بێدەنگییەکی دوورودرێژ وتی: لەوانەیە هێشتا من هەستی ڕۆمانسی هاوشێوەی کچانی قوتابخانەم هەبێت، چونکە چێژ لە سووڕانەوە لێرە لەگەڵ تۆ دەبینم.

(ئەریکسۆن) بزەیەکی بۆ کرد و بە تۆنێکی هێمنەوە وتی: ئینگرید منیش هەر ئەو هەستەم هەیە و لە پیاسەکردن لەگەڵ تۆ چێژوەردەگرم.

- ئەریک، سەرەنجام یەکێک لەو ڕۆژانەی ژیانی، ڕابردوو و ئاڵۆزمت بۆ باسدەکەم.

(ئەریکسۆن) لە دەزگیرانەکەی هەڵڕوانی و وتی: ئینگرید من پیاوێکی بەتەمەنم و گرنگی بەو شتانە نادەم.

(ئینگرید) کە قژێکی قاوەیی و دوو چاوی شینی هەبوو، بە سەنگەوە وتی، منی بە هەمان شێوە تۆم خۆشدەوێت.

هەردووکیان لەسەر کورسییەکی تەنیشت شەقامەکە دانیشتن. (ئەریکسۆن) بەئەسپایی باسی ئەرکەکەی خۆی کرد. (ئینگرید) بە دوو چاویی مۆلەق و ڕەنگ و ڕووی پەڕیوو تێوەی ڕاما و قسەی نەدەکرد، کاتێک (ئەریکسۆن) قسەکەی تەواوکرد، ئینگرید بە دەنگی هەڵلەرزیوەوە وتی: ئاخ ئەریک، زۆر سەیرە، کە تۆش وەکو من هۆگری (ئەمەریکا)ی، بەڵام ئاخر پێم بڵێ ئەوان بۆچی تۆیان بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە دیاریکردووە؟ مەگەر کەسێکی دیکە نەبوو؟

– نا ئازیزەکەم. بەو پێشینەیە و پەیوەندییەی کە من هەمە، هیچ کەس نەیدەتوانی وەک... (ئینگرید) قسەی دەزگیرانەکەی بڕی و وتی: بەڵام ئاخر ئەمەریکا هێشتا نەچووەتە شەڕەوە، بێجگە لەمانە، تۆش هاووڵاتیی سویدیت؟

– بەڵێ دەزانم، بەڵام ناچارم. چونکە دەچمە کاروباری نەوتەوە.

– ئاخ، خوایەگیان، بۆچی نابێت دەزگیرانەکەی من ئیشێکی باش و دڵنیای هەبێت؟

(ئەریکسۆن) دەزگیرانەکەی لەباوەش گرت، کەوتە لاواندنەوەی. دوای چەند ساتێک، (ئینگرید) سەری هەڵبڕی و وتی: خۆشەویستەکەم، ئێستا بڕیارتداوە چ کارێک بکەیت؟

– ئەگەر ڕەزامەندیت لەسەر بێت، هاوسەرگیریەکەمان بۆ ماوەیەک دوادەخەم و من لە ...

– نەخێر، نەخێر.

– بەڵام من هەمیشە لە مەترسیدا دەبم،تۆش کە دەبییە هاوسەری من، دەکەویتە مەترسییەوە.

(ئینگرید) بەهێمنی وتی: من دژی ئەو کارە نیم و ژیانی من پەیوەستە بە ژیانی تۆوە.

– بەڵام ئەگەر بتەوێت لەگەڵ من هاوسەرگیری بکەیت، پێویستە ڕواڵەتت وەک (نازی) بوون بنوێنیت، بەم شێوەیە

هاوڕێیان و ناسیاوانی خۆت لەدەستدەدەی و تەنانەت زۆر دووریش نییە، خیزانەکەشت لێت لووتەلا بن.

– تەنانەت خێزان؟

– بەڵێ و هەر لەبەرئەوە بوو، کە داوام لە تۆ کرد هاوسەرگیری...

– بەڵام لەوانەیە شەڕ ساڵانێک بخایەنێت و من...

(ئەریکسۆن) قسەی (ئینگرید)ی بڕی و وتی ئێمە بەردەوام یەکتری دەبینین، تۆ وا دەنوێنیت، چونکە بوومە نازی، بۆیە ئامادەنابیت هاوسەرگیریم لەگەڵ بکەیت، بەڵام نامەوێت بەیەکجاری من لەدەست بدەیت، ماوە ماوە یەکتری دەبینین.

– نەخێر. من بە باشی دەزانم شان بە شانی تۆ بەرەو مەترسی بچم و دووریش نییە سوودم هەبێت.

(ئەریکسۆن) دەزگیرانەکەی ماچکرد، وەڵامی دایەوە: زۆر باشە گیانەکەم. سەرەنجام بردتەوە.

***

دوای دوو شەو، (ئەریکسۆن) چاوی بە (برادلی) و سەرهەنگ (مانسفیڵد) کەوتووە، پێیڕاگەیاندبوون کە دوای دوو هەفتە، واتە دوای تەواوکردنی مانگی هەنگوینی و گەڕاندنەوەی هاوسەرەکەی بۆ ستۆکهۆڵم، ئامادەی سەفەرکردن و ئەنجامدانی ئەرکەکەی دەبێت، سەرەڕای

ئـەوە وتـی: کـە بـۆ جێبەجێکردنی خزمەتی خـۆی، هیچ حەقدەستێک وەرناگرێت.

(برادلی) کە پێشنیازەکەی (ئەریکسۆن)ی بیست، وتی: زۆر باشە. ڕازین بە مەرجەکانت و هیوادارم بەختەوەر بیت.

(مانسفیلد)یش وتـی: پیرۆزباییت لێدەکەم. تۆ لەگەڵ کچێکی باش و ژیر هاوسەرگیری دەکەیت، هاوسەرەکەی تۆ زۆر بەختەوەرە، کە لەگەڵ پیاوێکی نیشتمانپەروەر و مرۆڤدۆست هاوسەرگیری کردووە.

**بە گومانی پاشکۆی سەربازی**

زەمـاوەنـدەکـەی (ئەریکسۆن) زۆر کش و مات و بێ هەراوهۆریا بەڕێوەچوو، بێجگە لە چەند کەسێک لە خزم و کەسانی بووکەخان، لەو شاییە ئامادە نەبوون.

ئەو دوو کەسە مانگی هەنگوینیان لە باخەکەی خودی (ئـەریـکـسـۆن)، کـە نـزیـک شـارۆچـکـەی (کـروکـک) بـوو، بەسەربرد و دوای دوو هەفتە بۆ (ستۆکهۆڵم) گەڕانەوە، (ئەریکسۆن) سەری باڵوێزخانەی ئەڵمانیای دا و داوای ڤیزای ئەو وڵاتـەی کرد، لە داواکارییەکەیدا نووسی کە مەبەستی مامەڵەکردنی نەوتی هەیە لەگەڵ کۆمپانیاکانی ئەو وڵاتە.

(برونواولریخ) پاشکۆی بازرگانیی ئەڵمانیا لە (ستۆکهۆڵم)، پیاوێکی سەرڕووتاوە و بەتەمەن بوو، کە داواکارییەکەی (ئەریکسۆن)ی خوێندەوە، بەڕاشکاوی وتی: قوربان من باوەڕم بە ئەمەریکییەکان نییە، هەرچەند سەلمێنراوە تۆ نازییەکی دەمارگیری، لەگەڵ ئەوەشدا ڕازی نیم بچیتە ناو خاکی ئەڵمانیاوە. ئەریکسۆن بە ناڕەزامەندییەوە وتی، بەڵام جەناب، خۆ من ئەمەریکی نیم، من سویدییم.

(ئۆلریخ)ی پاشکۆی بازرگانی بەساردییەوە وتی: ئەوەندەی من بزانم، بەڕەگەز ئەمەریکی، بۆ هەمیشە ئەمەریکی دەبیت.

(ئەریکسۆن) بەتووڕەییەوە لە نووسینگەی (ئۆلریخ) هاتەدەرەوە، گەڕایەوە ماڵ و بە هاوسەرەکەی وت: من ڕێگەنادەم ئەو (ئۆلریخ)ە گەمژەیە ڕێ لە چوونم بگرێت بۆ (ئەڵمانیا)، دەبێت بیربکەمە ڕێگەیەک بدۆزمەوە بۆئەوەی گومانەکەی بڕەوێتەوە، کارێک بکەم، (کۆرتز) نوێنەری (هیملەر) سەرۆکی دەزگای ئێس ئێس لێرە، قەناعەتی پێبکات.

لە ڕۆژێکی هەمان هەفتەدا دەرفەتێک هاتەپێشەوە، کە (کۆرتز) و (والریخ) هەردووکیان کەوتنە ژێرکاریگەری (ئەریکسۆن)ەوە. (ئەریکسۆن) لەگەڵ بازرگانێکی ئەڵمانی لە ڕیستۆرانتێک نانی نیوەڕۆیان دەخوارد، کە لەناکاو دەنگێکی

ئاشنای بیست و وتی: سەلام ئەریک، بارودۆخت چۆنە؟

(ئەریکسۆن) ئاوڕی دایەوە و چاوی بە هاوڕێیەکی کۆنی خۆی ناسراو بە (والنبێرگ) کەوت، کە لەو کاتەدا سەرۆکی هەرێمێکی سویدی و بەڕەگەز جوولەکە بوو.

(ئەرکسۆن) لەبەرئەوەی پەیوەندی لەگەڵ (والنبێرگ) بڕیبوو، چونکە بە جوولەکە ئەژماردەکرا، مەرامی ئەڵمانییەکانیش دژی یەهودییەکان بوو، بەڵام (والنبێرگ) سەرەڕای گوێ پێنەدانی (ئەریکسۆن)، بەردەوام سڵاوی لێدەکرد و ڕێزی دەگرت.

(ئەریکسۆن) کە دەیزانی (ئۆلریخ) و (کۆرتز)، واتە پاشکۆی بازرگانی و نوێنەری هیملەر لە نزیکیانەوە دانیشتوون، دەرفەتەکەی قۆستەوە و خێرا لە جێگەکەی هەستا و بە دەنگێکی بەرز، ڕوو لە (والنبێرگ)، هاوڕێ جوولەکەکەی خۆی وتی: والنبێرگ چەندین جار ئاگادارم کردییەوە، کە هەراسانم نەکەی و حەزناکەم لەگەڵ یەهودییەک مامەڵە بکەم. تێگەیشتی؟ خێراکە لەبەر چاوانم ون بە و ئەگینا خراپ چاوت بە خۆت دەکەوێت.

(والنبێرگ) واق و وڕماو بەمۆلەقەوە لە ڕوخساری (ئەریکسۆن) ڕاما و پاشان بێ ئەوەی نقەی لێوەبێت، گەڕاوەتەوە و بەپەلە لە دەرگای ڕیستۆرانتەکەوە چووەتە دەرەوە.

بەیانی زووی ڕۆژی داهاتوو، نامایەک بەم ناوەڕۆکەوە بە دەستی ئەریکسۆن گەیشت:

من پێموانەبوو هاوڕێکانم بەو ئاستە ڕواڵەتیان گۆڕیبێت. لە هەڵسوکەوتی دوێنێ شەوی تۆ تێگەیشتم کە مەبەستێکی تایبەتیت هەیە،بۆیە هاوڕێیەتیم لەگەڵ تۆ تێک نادەم. ئەگەر گومانەکەم ڕاست بێت و تۆ بەناچاری وا هەڵسوکەوتت کردبێت، کەوایە هیوادارم یەکتری ببینینەوە. ئەگەر هیچم لەدەست بێت، ئاگادارم بکەرەوە.

**والنبێرگ**

(ئەریکسۆن) دوای خوێندنەوەی نامەکە، نامەکەی بۆ هاوسەرەکەی ڕاداشت و وتی: ئینگرید، هانێ ئەو نامایە وەربگرە و بیخوێنەوە، دەمەوێت بیدڕێنم و وردی بکەم.

(ئینگرید) نامەکەی خوێندەوە و سەری لەقاند و وتی: پیاوێکی سەیرە!

- بەڵێ دەڵێی ئاوێنەی بیری منی خوێندووەتەوە، هیوادارم نەڕەنجابێت.

گومانەکەی (ئەریکسۆن) نەیپێکا، چونکە بە پێچەوانەی چاوەڕوانی، هەڵسوکەوتەکەی کاریگەری نەبوو بەسەر (والریخ) و (کۆرتز)ەوە. دوای چەند ڕۆژێک سەرهەنگ (مانسفێڵد) تەلەفۆنی بۆ کرد، وادەی چاوپێکەوتنی ڕێکخست

و کاتێک هەمووان، واتە مانسفێڵد، برادلی، پاشکۆ سەربازی و ئەریکسۆن لەدەوری یەک کۆبوونەوە، ئەریکسۆن وتی: دامەوێت هاوڕێیەکم لەو کارەدا بەشداری پێ بکەم، بە هاوکاریی یەکتری نەخشەی خۆمان جیبەجێ بکەین.

سەرهەنگ مانسفێڵد ناوچاوانی گرژکرد و پرسی: ئەو هاوڕێ و هاوکارەی تۆ کێیە؟

- پرنێس کارڵ برنادۆت.

برادلی بە سەرسامییەوە پرسی: خوشکەزای پادشا؟

ئەریکسۆن سەری بە ئاماژەی بەڵێ لەقاند و وتی: من و کارڵ ساڵانێک بە یەکەوە هاوڕێ بووین، لە مامەڵەی نەوت و کڕین و فرۆشتنی نەوت یەکتریمان ناسی و گومانم نییە، کە کارڵ لە هاوکاریکردنم درێغی ناکات.

سەرهەنگ مانسفێڵد بیرکەرەوانە پرسی: تۆ بڕیارتداوە لە چ بارەیەکەوە هاوکاری لێ وەربگریت؟

ژمارەیەک لە بەرپرسانی نازییەکان، لە تبیل کرتزی نوێنەری حیزبی نازی لەم شارەدا، لە چینی مام ناوەندی ئەژماردەکرێن و زۆر دڵخۆش دەبن ئاشنایەتی لەگەڵ پلەداران و چینی باڵاتر پەیدابکەن، وەک پرنس کارڵ خوشکەزای پادشای پێشووی سویدە و لە دەرباران ئەژماردەکرێت بۆیە ...

سەرهەنگ سەری لەقاند و وتی: بەڵێ تێگەیشتم.

ئەریکسۆن بەردەوام بوو، من دڵنیام کارڵ ڕازی دەبێت، ڕای کۆرتز بگۆڕێت و کارێک بکات، من ڤیزا بۆ چوونە ناو خاکی ئەڵمانیاوە وەربگرم.

**پەیوەندیی پادشایەتی**

پێرنس کارڵ بێرناردت، پیاوێکی باڵابەرزی سی ساڵە، کە هەموو خەڵکی سوید خۆشیاندەویست.

ئەریکسۆن بەبێ ئەوەی کات بەفیڕۆبدات، سەردانی کارڵی کرد و داوای هاوکاری کرد و وتی: کارڵ، لەوانەیە ئەو هاوکارییەت بۆ تۆ ئەنجامی ترسناکی هەبێت. من سەربازێکی ون بم، بەڵام تۆ یەکەم کەسایەتیی ئەو وڵاتەیت و وەک سویدیش بێلایەنە، بۆیە ئەڵمانییەکان ڕێزی تۆش دەگرن.

ئەریکسۆن دوای ئەوەی ئەو قسانەی کرد، تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ باسکرد. پرنس کارڵ وتی: هەڵبەتە من لە هاوکاریکردنی تۆ لەو کارەدا دڵخۆش دەبم، بەڵام ئەوەی نیگەرانی کردووم، ئەوەیە کە حەزناکەم مامم، جەنابی گۆستاڤ، بەو مەسەلەیە بزانێت.

ئەریکسۆن سەری لەقاند و وتی: دەزانی چی؟ بێگومان تۆ ناتوانیت بابەتەکە بە خێزانەکەی خۆت بگەیەنیت و تەنیا کەمێک هاوکاریم بکە.

پرنێس کارڵ بەهێمنی وتی: لە مەبەستەکەت تێدەگەم و لە هەمووی گرنگتر، پێموانییە لە ڕوانگەی ئەخلاقییەوە ڕێپێدراوبم، کە بابەتەکە بە جەنابی بڵێم و داوای هاوکاری لیَ بکەم بۆ وەرگرتنی ڤیزا بۆ تۆ، وەک بێگومان ئەگەر ئەوان بزانن من لەگەڵ تۆ، واتە هاوکاریی کەسێکی دژەنازی دەکەم، یەکسەر من تەسلیمی ئاسایش دەکات، بەڵام چونکە من بۆ خۆم باوەڕم وایە، هەنگاوی تۆ دەبێتەهۆی کۆتایی پێهێنانی شەڕ، بۆیە ئامادەم کارت لەگەڵدا بکەم.

***

بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی، ئەریکسۆن بە (کۆرتز) نوێنەری هیملەر لە سویدی وت، کە پرنێس کارڵی برازای جەنابی گۆستاڤ پەیوەندی تایبەتی لەبارەی مەرامی نازییەکانەوە هەیە و وتی: ئەگەر کۆرتز ئارەزووبکات، بۆ هەفتەی داهاتوو شازادە داوەتی ماڵەوە دەکەن، بۆ نانی ئێوارە.

کۆرتز تامەزرۆیانە وەڵامی دایەوە: من بە زیارەتی شازادە زۆر دڵخۆش دەبم.

لەڕاستیدا پرنێس (کارڵ گۆستاڤ ئۆسکار فریدریک کریستیان بێرنادۆت) (ئەوە ناوی ئەو پیاوە بوو). برازاکەی جەنابی گۆستاڤ و زاوای پادشا. بەلژیک واتە لیۆپۆلد، ناوبانگی تایبەتی هەبوو، وەک هەمووان بەتایبەت ئەڵمانییەکان دڵنیابوون ڕۆژێک پرنێس کارڵ وارسی تاج

و کورسیی سوید دەبێت، بۆیە دەتوانێت لە ئامادەبوونی بۆ بانگەشەکردن و بەرەوپێشەوەبردنی ئامانجەکانی هیتلەر سوودوەربگرن. هەر ئەو ڕۆژە ئەریکسۆن چووە سەردانی شازادە و وتی: قسەم لەگەڵ کۆرتیزی ئەڵمانی کرد، تێگەیشتم کە بەباشی ئاگای لە بارودۆخی تۆیە و تەنانەت دەزانێت جارێکیشیان، لە ئەمەریکا میوانی ڕۆزفلێتی سەرۆککۆمار بوویت. هەوڵبدە لە بەرکەوتە لەگەڵیدا بە جۆرێک هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەیت، پێیوابێت ئەڵمانییەکانت خۆشدەوێت، پاشان ئەوەندەی دەتوانیت زانیاری لەبارەی هیتلەرەوە، یان نازییەکان دەستەبەربکەیت.

پرنێس کارڵ سەری لەقاند و وتی: دەزانم. دوای چەند ڕۆژێک، لە هەیوانی کافتریای گراند هوتێلی ستۆکهۆڵم، پرنێس کارڵ میوانداریییەکی ڕازاوەی بە شانازیی ئەڵمانییەکان ڕێکخست.

لەو کاتە کە ئاهەنگەکە بەردەوام بوو، کارڵ پێشنیازی هاوڕێیەتی بۆ کۆرتز کرد، سەرەنجام بە تەواوبوونی ئاهەنگەکە، نوێنەری هیملەر واتە کۆرتز داوای لە پرنێس کارڵ کرد، کۆتایی هەفتە نانی ئێوارە لە ماڵی ئەو بخوات.

بەم شێوەیە بوو ئەریکسۆن لەگەڵ کۆرتز بووە هاوڕێ و ئەو پیاوە بەوپەڕی ئارەزووەوە ڕازیبوو، ڤیزای چوونە ناو خاکی ئەڵمانیای پێبدەن.

## ئامادەکاریی کۆتایی

بۆ بەیانی، چاوی بە (ماژۆر برادلی) و سەرهەنگ مانسفێڵد کەوت، لەو چاوپێکەوتنەدا پرنێس کارلیش ئامادەبوو، لەوێ نەخشەکان دارێژران و گفتوگۆیەکان ئەنجامدران، کە لە ماوەیاندا ئەریکسۆن تێگەیشت پێویستە لە خاکی ئەڵمانیادا چ بکات و چ بڵێت و لە کاتی پێویستدا بۆ لای کێ بگەڕێتەوە؟ سەرەنجامی کار سەرهەنگ مانسفێڵد وتی:

جەنابی ئەریکسۆن تۆ کە دەچیتە وڵاتی ئەڵمانیا دەبێت ئەوەندی دەتوانیت هەوڵبدەیت دیتن و زانیارییەکانت لە زەین بگریت و لەسەر کاغەز نەیانووسیت، پێویستە ئێمە لەم کارەدا پارێز لەدەست نەدەین. توانای ئەڵمانیا پشتی بە سەرچاوە نەوتییەکان بەستووە، بە تەفروتووناکردنی ئەو سەرچاوانە، ئەڵمانیا تێکدەشکێت و نەک تەنیا ئەمەریکا ناچێتە شەڕەوە، بەڵکو شەڕیش خۆی لەخۆیدا کۆتایی پێدێت. لە هەمووی گرنگتر، پێویستە تۆ هەوڵبدەیت ئەوەندەی دەتوانیت لە هاوڕێ ئەڵمانییە کۆنەکانی خۆت، کە مامەڵەی نەوتت لەگەڵدا دەکردن، خۆت بپارێزیت و پێموانییە پێویستی بە بیرهێنانەوە بێت. ئەگە ئەڵمانییەک تۆی ناسی و بۆ پۆلیسی گشتپاوی درکاند، بەیەکجاری ئاسەوارت دەبڕێتەوە.

ئەریکسۆن سەری لەقاند و وتی: بەڵێ و من بەتەواوی لەو بابەتە ئاگادارم.

- لەوانەیە تۆ لە سەفەری یەکەم نەتوانیتن زانیاریی زۆر دەستەبەربکەیت، ئەرکی سەرەکیی تۆ پەیوەندی بە نەوتەوە هەیە، هەرکاتێک بە تەلەفۆن هەواڵێک لەبارەی شوێنی پاڵاوگەکان بدەیت، تۆپەدوورهاوێژەکانی بەریتانیا بەئاسانی ئەوێ وێران دەکەن.

- بەڵێ تەواو تێدەگەم.

مانسفێڵد سەری لەقاند و وتی: بەڵام ئەگەرهاتوو لەلایەن خودی هیتلەر، یان هاورێکەی واتە هیملەر بۆ چاخواردنەوە بانگهێشتیان کردیت، یەکسەر قبووڵی بکە.

ئەریکسۆن زەردەیەکی کرد و وتی: هەڵبەتە من بەوپەڕی ئارەزووەوە بانگهێشتنەکەیان قبووڵدەکەم.

- هیوادارم سەرکەوتووبیت.

***

دوای چەند ڕۆژێک، (کۆرتز) تەلەفۆنی بۆ (ئەریکسۆن) کرد، پێیوت: بۆ واژۆکردنی ڤیزاکەی سەردانی (ئۆلریخ)، پاشکۆ بازرگانییەکە بکات.

(ئەریکسۆن) دەستبەجێ چوو بۆ باڵوێزخانەی ئەڵمانیا و داوای قسەکردنی کرد، لەگەڵ (ئۆلریخ) و کاتێک بۆ ژووری پاشکۆی بازرگانی ڕێنمایی کرا، سڵاوی کرد، (والریخ) لە

جێگەکەی خۆی هەستا و لە کاتێکدا دەستی ئەریکسۆنی دەگوشی وتی: سڵاو جەنابی ئەریکسۆن. ئایا لەبارەی ڤیزاکەتەوە هاتووی؟ بەڵێ... بەڵێ دۆسیەکەی بەتەواوی دەزگا و پەسندکراوە. (والریخ) دوای ئەوەی وای وت، ڤیزاکەی دایە دەستی (ئەریکسۆن) و وتی: فەرموو، بژی هیتلەر!

– بژی هیتلەر!

(ئەریکسۆن) ئەو شەوە بە هاوسەر و پرنێس کارلی وت:

– بەڕواڵەت والریخ ڕەزامەندی لەسەر من دەربڕیوە و بووەتە هاوڕێم، بەڵام دڕدۆنگی لە سەروکەللەی دەبارێت.

(ئینگرید) بزەیەکی کرد و وتی: کەوایە، بێگومان ئەو بەڵگە لەسەر تۆ بەدەستدەهێنێت. بەڕاستی ئەریک، ئەو سەفەرەی تۆ بۆ ئەڵمانیا چەند درێژە دەکێشێت؟

– دیار نییە. لەوانەیە سێ ڕۆژ و لەوانەیەشە چەند هەفتە، ئەوە پەیوەندی بە بەرەوپێشچوونی ئەرکەکەوە هەیە.

(ئینگرید) سەری چەماندەوە و وتی: بانگێکی دەروونی گەفم لێدەکات، کە تۆ لەو سەفەرە تووشی سەرئێشە دەبیت. ئایا ناکرێت منیش لەگەڵ خۆت بەریت؟

– پێموانییە ئینگرید و بێجگە لەمانە، دڵنیات دەکەمەوە، کە هەرگیز تووشی سەرئێشە نابم. مێشکت ئاسوودە بێت.

**ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو**

دوای هەفتەیەک، واتە کۆتایی ئەیلولی 1941، ئینگرید بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی (ئەریکسۆن) و (پرێنس کارڵ)ی بەرەو فڕۆکەخانە برد. ئاسمان ساف و بێگەردبوو دەتوت نیلی شینە.

دوای بیست خولەک، ئەریکسۆن تازە لەسەر کورسیی فڕۆکەی (لوفت هانزا) پاڵی دابووەوە، کە لەناکاو دوو پیاوی باڵابەرز، پێش فڕینی فڕۆکەکە چوونە ناو فڕۆکەکەوە و ڕوویان لەسەر نشینەکانی کرد، یەکێکیان پرسی: کام موسافیرتان ئەریک ئەریکسۆنە؟

میوانەکانی ئەڵمانیا سیخوڕانە لە ڕوخساری فڕۆکەوانەکەیان هەڵڕوانی و لە هەمان کاتدا ئەریکسۆن لە شوێنەکەی خۆی هەستا و وتی: بەڕێزان من ئەریک ئەریکسۆنم. ئایا هیچ ئیشێکتان بە منە؟

یەکێک لەو دوو پیاوە وتی: دەبێت تۆ لەگەڵ ئێمە بێیت.

ئەریکسۆن بەتووڕەییەوە شیڕاندی: لەگەڵ ئێوە بێم؟ ئێوە کێن؟

پیاوە باڵابەرزەکە کارتێکی لە گیرفانی دەرهێنا و وتی: ئێمە پۆلیسی نهێنین.

ئەریکسۆن بیری دەکردەوە (ئۆلریخ) دەستی لەم کارەدا هەیە، پرسیی: بابەتەکە چییە؟ من نازانم پۆلیس هەقی بەسەر منەوە چییە؟

- قوربان دەبێت ئێمە چەند پرسیارێک لە تۆ بکەین.
- فەرموو.

ئەریکسۆن تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد و وتی: بەڵام فڕۆکەکە تا پێنج خولەکی دیکە دەفڕێت.

- بیرتان ئاسوودەبێت. تا گەڕانەوەی تۆ ڕێگە بە فڕینی فڕۆکەکە نادرێت.

ئەریکسۆن بەتووڕەییەوە وتی: ئاخر پێم ناڵێن ئەوە مانای چییە؟

- ئێمە ئاگادار نین.

ئەریکسۆن بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و بەردەوام لە دڵی خۆیدا جنێوی بە (ئۆلریخ)ی پاشکۆی بازرگانیی ئەڵمانیا لە سوید دەدا.

کاتێک گەیشتینە هۆڵی چاوەڕوانیی فڕۆکەخانە، پۆلیسی نهێنی جانتاکەی ئەریکسۆنیان پشکنی، تەنانەت جلوبەرگەکانیشیان بە بەرچاویاندا هێنان و بردن و لەناکاو بیرێک دزەی کردە مێشکی (ئەریکسۆن)ەوە و لە خۆی پرسی، کە نەکات ئەوانە پۆلیس و ئاسایشی ئەڵمانی بن و بەتووڕەییەوە وتی: گەمژەینە، زۆر هەڵەن گەر پێتانوابێت من موسافیری قاچاخچیم.

هەردوو پۆلیسە نهێنییەکە بەبێ گوێدانە ئەریکسۆن لەسەر پشکنینی جانتاکە بەردەوام بوون، بە شێوەیەک

دەجووڵانەوە کە گوایە دڵنیان شتێک دەدۆزنەوە، بەڵام سەرەنجامی کار بەنائومێدی سەری خۆی لەقاند و یەکێکیان وتی: قوربان داوای لێبوردن دەکەین، کە هەراسانمان کردیت.

(ئەریکسۆن) بەتوورەییەوە جانتاکەی هەڵگرت و بە ڕاکەڕاک بەرەو فڕۆکەکە ڕۆیشت. هێشتا هاوسەر و پرنێس کارڵ لە ڕیزی بەڕێکاراندا وەستابوون، بەڵام (ئەریکسۆن) بەبێ ماڵاوایی دووبارە سواری فڕۆکەکە بووەوە، تەماشای یەک بە یەکی موسافیرەکانی کرد، لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوە ڕاما. دوای ساتێک فڕۆکەکە تەکانێکی دا و فڕی و (ئەریکسۆن) سەیرێکی دەرەوەی کرد، لە بەرخۆیەوە بیری کردەوە کە زیاتر لە سەدجار لەو دەورووبەرە فڕیوە، کەچی لە هیچ کام لە سەفەرەکانی خۆی، بەم شێوەیە نیگەران نەبووە.

دوای چەند سەعاتێک کە فڕۆکەکە لە ئاسمانی سوید دوورکەوتەوە، سنووری بەزاند، ئەریکسۆن تێگەیشت کە پیاوێکی ئازاد و سەربەخۆ نییە. بەو شێوەیە بوو فڕۆکەکە بە ئاسمانی تەمومژ داپۆشراوی ئەڵمانیای باکووردا فڕی و دوای چەند سەعاتێک، نیشتەوە و دەنگی نەڕەی ماتۆڕەکان نەما و دەرگاکان کرانەوە. (ئەریکسۆن) دڵنیابوو کە نوێنەران و کارمەندانی گشتاپۆ لە دەرەوە چاوەڕوانی دەکەن.

**یەکەم دیداری گشتاپۆ**

ئەریکسۆن پێشتر چەندین جار چووەتە بەرلین و لە هەمان فڕۆکەخانە، واتە فڕۆکەخانەی (تمپڵ هۆف) دابەزیبوو، بەڵام ئەوکاتە هەستیکرد شەڕ، گۆڕانکاریی زۆری بەسەر ئەو ناوچەیەدا هێناوە. شوێنی فڕۆکەکان بە بۆیاغی سەوز بۆیاغکراون و وێنەی داریان لەسەر میچەکانیان کێشابوو تا فڕۆکەکانی دوژمن بە شوێنی فڕۆکەکان نەزانن و پێیانوابێت دارستان، یان دارستانە و دارو درەختی کەمی تێدایە.

کارمەندانی گومرگی ئەڵمانیا هەموویان یونیفۆرمی خۆڵەمێشیان پۆشیبوو، ئەریکسۆن پەتی ڕەشی لەسەر قۆڵەکانیانی بینی، کە بە پیتی گەورە و سپی دوو پیتی (SD)یان لەسەر نووسیبوو، یەکسەر زانیی ئەوانە سەربە دەزگای گشتاپۆ (دەزگای ئاسایشی ئەڵمانیا)ن، کە (هیملەر) دایمەزراندووە.

دوای چارەکێک، ئەریکسۆن لەگەڵ دوو موسافیری دیکە سواری ئۆتۆمبیلێکی (ئۆپڵ)ی ڕەش بووە و لەگەڵ دوو ئەفسەری گشتاپۆ، بەرەو بارەگای ناوەندی دەزگاکە کەوتوونەتەڕێ. کاتێک ئۆتۆمبێلەکە لە جادەی دەرەوەی شار بەرەوپێش ڕێیکرد، ئەریکسۆن بەسەرسامییەوە هەستیکرد برێکی زۆر گاو ئاسن (مەبەست نیرو ئامووری کێڵانە) و تەشوێی ژەنگاویی سەرانسەری جادەکەیان داپۆشیوە و

لەنەکاو زانی، نووکی تەواوی ئەو ئاسنانە بەرەو ئاسمان دانراون و تێگەیشت هەموویان، تۆپی دژە ئاسمانین و بۆ بەردانەوەی فڕۆکەکان لەوێن و هەر لەوکاتە دابوو، کە تێگەیشت پێویستە پێش هەمووشتێک ئەو بابەتە بە دەزگای دژەسیخوڕیی ئەمەریکا بگەیەنێت.

هێڵی تەلەفۆن لە شاری (ئۆتۆباهن) زۆر کەم بوو، ئەریکسۆن بە خۆی وت: بێگومان بەنزین بەشکراوە. ئۆتۆمبێلی (ئۆپڵ)ەکەیان لە خاڵێک، لەتەنیشت ئیڤایەکی گەورە، کە پڕاوپڕبوو لە زرێ و خودەی سەوزی سەربازی، وەستا.

ئەریکسۆن لەپشت شووشەی پەنجەرەکەی ئۆتۆمبێلەکەوە چاوێکی بە باری ئیڤایەکەدا گێڕا و هەستیکرد، کە لەژێر ئەو مس و چەکانە، ژمارەیەکی زۆر پاڵکەوتوون و دەنگی چپە چپی وەک پاڕانەوەی قسەکردنیانی بیست.

سەرتاپای شاری (بەرلین)، هەمووی وێران بوو، شەڕ پێش هەموو شوێنێک زیانێکی زۆری پێگەیاندووە و شوێنەواری ئەو تەلارە بەرزو سپییانە، کە ئەریکسۆن لە ساڵی 1938 دیتبوونی، بەرچاوناکەوێت. شوێنەواری بۆردومانی سوپای بەریتانیا بە هەموو شوێنێکەوە دیاربوو. دیوارەکان ڕووخاون و شەقامەکان درزیان بردبوو، لەو ناوەدا، پرۆجیکتۆرێکی زۆر هەبوو.

دوای چەند خولەکێک، ئۆتۆمبێلەکەیان لە بەردەم تەلارێکی خۆڵەمێشیدا، کە شوێنی دەزگای ئاساییش بوو، وەستا. ئەو تەلارە پێشتر هونەرستانێکی پیشەیی بوو، کراوەتە شوێنی دەزگای ئاساییش، یان پۆلیسی نهێنیی ئەڵمانیا و ترسناکییەکەی سێبەری بەسەر دڵدا دەکرد. (ئەریکسۆن) تێگەیشت لەناو ئەو تەلارەی کە نیازیوایە ئێستا بچێتە ژوورەوەی، سەدان کەس ئەشکەنجە دراوە و گیانیان سپاردووە، لەوێیە کە بڕیاری کۆمەڵکوژیی هەزاران کەس لە فەڕەنسا و پۆڵەندا، نەرویج، هۆڵندا، بەلجیکا و تەواوی وڵاتانی شکسخواردوو، دەردەکرێت. لەو شوێنەدا، خیانەت و ساختەکاری، تاوان و مرۆڤکوشتن و بێویژدانی زاڵبووە.

ئەفسەرانی جلوبەرگی ڕەنگخۆڵەمێشی پۆشی گشتاپۆ، (ئەریکسۆن)یان بەرەو نووسینگەی کاری (بارون فرانتز فۆن نوردهۆف)، سەرۆکی دەزگاکە، برد.

ئەریکسۆن دەیزانی هەرچەند (بارون نوردهۆف)، بەڕواڵەت پێگەی پۆستێکی تری لە تەواوی دەسەڵاتدارانی نازی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە بنەمادا لە زۆربەیان لەسەرووتر و گەورەترە و دەیزانی، کە لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی (هیملەر) سەرۆکی گشتیی دەزگای گشتاپۆیە.

(بارون نوردهۆف) پیاوێک بوو باڵابەرز و قژبۆز، بە

دیتنی (ئەریکسۆن)، لە جێگەی خۆی هەڵستا و تەوقەی لەگەڵ کرد و چاوە شینەکانی لە ڕوخساری ئەو پیاوە بڕی.

دوو کەسی تریش لەو نووسینگەیە ئامادەبوون، هەردووکیان لە بەرامبەر وێنەی کێشراوی ئەدۆلف هیتلەردا دانیشتبوون و سەروکەللەیان ناسیاو دەهاتەبەرچاو.

بارون نۆردهۆف بە تۆنێکی هێمن وتی: ئەو ئەفسەرانە پێیان وت، لە فرۆکەخانەی (برۆما) چەند کارمەندێکی ئەڵمانی، کە کارتی ناسنامەی ئەفسەرانی پۆلیسی بەریتانییان پێبووە، زۆر هەراسانیان کردوویت.

(ئەریکسۆن) خێرا چاوێکی بەو دوو کەسەدا گێڕا و لەناکاو بیری کەوتەوە، کە ئەوانەش لەناو فرۆکەکە دابوون و وتی: بەڵێ، بەڵام کارمەندانی ئێوە نەیانتوانی هیچ لە جانتاکەمدا بدۆزنەوە.

بارون نۆردهۆف بابەتی قسەکردنی گۆڕی و وتی: بۆچی تۆ کە کەسێکی ئەمەریکی، ئەوەندە سووری لەسەر ئەوەی مامەڵەی بازرگانیمان لەگەڵدا بکەیت؟

بارون نۆردهۆف دوای تەواوکردنی قسەکەی، ڕۆژنامەیەکی لە چاوەی  مێزەکەی هەڵگرت و لە بەردەم ئەریکسۆنی دانا. لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە بە مانشێتێکی گەورە چاپکرابوون: (پرێزدنت ڕۆزفلێت، خوازیاری ڕووخانی  ئەڵمانیایە) ئەریکسۆن بزەیەکی کرد

و وتی: ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە. من سویدیم و بە نەژادی ئارییایی ئەژماردەکرێم، بازرگانم و لەبەرئەوە سەبارەت بە ئەڵمانیا باوەڕێکی پتەوم هەیە. چونکە دەزانم مرۆڤی کار و وریان و بە سەرنجدان بەو خاڵەی، کە پێش چەندساڵێک میللەتێکی شکستخواردوو و پەست و زەبوون بوون، بەڵام ئێستا بوونەتە پادشای ئەورووپا. بۆیە دەکرێت لەسەر ئەوانم ئەژماربکەن و بەو هۆیەی، کە دەمەوێت لەگەڵ ئێوەی ئەڵمانی مامەڵە ئەنجام بدەم و نەوت بکڕم و بفرۆشم، ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ.

بارون نۆردهۆف بەخوێنساردییەوە وتی: تێگەیشتم.

ئەریکسۆن سەری لەقاند و پاشان بە پرسیار، کە بارون وایدەنواند وەڵامی بداتەوە، باوەڕی خۆی سەبارەت بە مەرامی نازیزم دەربڕێت و وەڵامی پرسیارێک، کە لەبارەی ئەڵمانیاوە کرابوو، بەرەوڕووی بارون پرسیی: ئایا ئەو ئامادەیە لەلایەن ئەڵمانییەکانەوە بۆ ئەنجامدانی مامەڵەی نەوتی و بەستنی گرێبەست بچێتە ئەمەریکا یان، نەخێر؟

ئەریکسۆن وەڵامی هەموو پرسیارەکانی ئەو پیاوەی دایەوە،بە شێوەیەک قسەی دەکرد و خۆی بە نازییەکی دەمارگیر نیشاندەدا، کە ئەو کارە بەلای خۆشییەوە گومانی بوو. دوای پرسوجۆی کورت، لە ئاکامدا (ئەریکسۆن)یان نارد بۆ هۆتێلی (بەهەشت)، لەوێ ژوورێکی

بۆ ئامادەکرابوو، بڕیاریاندا تا وەرگرتنی دوابڕیاری دەزگای گشتاپۆ لەبارەی کارەکەیەوە، لە بەرلین بمێنێتەوە، ئەو شارە بەجێ نەهێڵێت.

**کێشەی خەو**

کاتێک (ئەریکسۆن) گەیشتە هۆتێلەکە، دەفتەری ناونووسینی موسافیرەکانی واژۆکرد، لەلایەن کارمەندی هۆتێلەکەوە بۆ ژوورەکەی خۆی ڕێنمایی کرا و کاتێک جانتاکەی لەسەر تەختە خەوەکەی دانا، کارمەندەکە لەوە ئاگاداری کردەوە، کە دەبووایە لە کاتی پەلاماردانی ئاسمانی جێبەجێ بکرێت و ئەریکسۆن وتی: بەڵێ دەزانم و هەرکە فڕۆکەکانی دوژمن پەلاماریاندا، دەبێت من گڵۆپەکە بکوژێنمەوە و پەردەکان دابدەمەوە. ئێستا پێم بڵێ بزانم ئایا لێرە خاولی و سابوونتان هەیە یان نا؟

– بەڵێ قوربان، ئێمە خاولییەکت پێدەدەین و نیوقاڵب سابوونیش دەخەینە بەردەستت. فەرمانمان پێکراوە، کە سابوون زۆر بەفیڕۆنەدەین، بەڵام چونکە تۆ میوانی، بۆیە گوێ بەو فەرمانە نادرێت. ڕۆژانە لێرە هەمووشتێک دابەشکراوە و دەکرێت بڵێی قاتوقڕییە.

(ئەریکسۆن) سەری لەقاند و پاشان بڕیاریدا نانی ئێوارە وەک ڕۆژانی پێشوو، کە لە ئەڵمانیابوو، لە کافتریای

(ئەنتری لیندن) بخوات و بۆیە لە هۆتێلەکە چووە دەرەوە، بەسەر شەقامەکاندا پیاسەی کرد، زۆربەی تەلارەکان وێران ببوون. کافتریای (لیندن) هەرگیز بارودۆخی پێشووی نەبوو زۆر گۆڕابوو. زۆربەی کورسییەکای دڕابوون. کە ئەریکسۆن لەپشت مێزێک دانیشت و فەرمانی کرد پەرداخێک کۆنیاکم بۆ بێنن، مەشروبێکیان بۆ برد، کە نەک تەنیا تامی ئەلکحولی نەبوو، بەڵکو تامی سرکەیەکی بۆگەنیووکردوی دەدا، ئەریکسۆن بە بێزاری و تووڕەییەوە بەسەریەوە نا، دڵی خۆی خۆشکرد کە لە سەفەری داهاتوو، بڕێک مەشرووب لەگەڵ خۆی بهێنێت. دۆخی خواردنەکە پلە بە پلە بێزارکەرتربوو، تاکە خواردنی گەرمی ئەو کافتریایە، ماسیی سوورەوەکراو و گۆشتاوی بزن و باسترمەی گەرم بوو، (ئەریکسۆن) کە دەیزانی ماسییەکانیان بە بەزی بەراز سوورکردووەتەوە و باسترمەکەش کۆنە، بەناچاری بۆ تێرکردنی ورگی خۆی، بڕیاریدا پەتاتەی بۆ سووربکەنەوە و لە کاتی خواردنی ئەو خواردنە وشک و کەمە، دەستیکرد بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە، کە لەسەر مێزەکە بوو. ئەو ڕۆژنامایە لە بڵاوکراوەکانی ئۆرگانی هیتلەر و ناسراوبوو بە ول کیشر بیوباختەر، بابەتی زۆری سەبارەت بە بەرەوپێشچوونی هێزەکانی ئەڵمانیای تێدا بەرچاو دەکەوت، ئەریکسۆن کە وتمان بەباشی زمانی ئەڵمانی دەزانی،

تامەزرۆیانە، ئەم بابەتەی خوارەوەی خوێندەوە:

دوو هاوڕێی دڵسۆز کە مۆڵەتیان لە سوپا وەرگرتووە، پێویستیان بە دوو ژنی ئەسمەر و سەرنجڕاکێشە تا ڕۆژانی پشوویان لەگەڵ بەسەربەرن — ئەوانەی ئارەزوودەکەن با وێنەکانیان بۆ ئەم ناونیشانە بنێرن....

ئەو بابەتە بەجوانی نیشانیدەدات، کە چەند پیاو لە ئەڵمانیا کەم بووە، ژنان بۆ دەستگەیشتن بە پیاوان تەڕووشک دەکەن. ئەوەی سەرنجی ئەریکسۆنی پەلکێشکرد ئەو هەواڵە نەبوو، بەڵکو بابەتێک بوو کە سەرنجی ئەریکسۆنی تایبەت کردبوو، بە خۆی ئەوەبوو هەشت کەسی ئەڵمانی، بە تاوانی بە خراپە باسکردنی شەڕ و دڵساردکردنەوەی خەڵک، لەسێدارەدراون و مردنیان لەلایەن دادگای گشتییەوە پەسندکرابوو.

ئەریکسۆن تێگەیشت کە دادگای گشتی تەنیا ناوونیشانێکە بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵکەوە و تەفرەدانی بێگانان و دادگایەکی وەها، کە (چینی ئاسایی خەڵک دەستەی دادوەرییەکەی پێکدەهێنن)، هەرگیز بوونی نییە، بەڵکو لە بنەمادا هەمان دەزگای ترسناکی گشتاپۆی هیملەرە.

ئەریکسۆن لەخۆڕا چاوێکی بە دەورووبەریدا گێڕا، لەناکاو هەستیکرد، ئەگەر ناسنامە و ئەرکەکەی ئاشکرابێت،

دەستبەجێ لەسێدارەدەدرێت. زۆربەی مشتەرییەکانی کافتریایەکە کزورەقەڵە و لاوازبوون، بەڵام چەند سەربازێکیش کە لەوێ بوون، سیمایەکی سوور و گەش و جەستەیەکی قەڵەویان هەبوو، ئەوە نیشانیدەدات لەکاتی دابەشکردنی بەشە خۆراک، چەند بەزەییان بە سەربازان و پلەداراندا دێتەوە.

(ئەریکسۆن) لە شوێنی خۆی هەستا و پارەی خواردنەکەی دا، لە کافتریاکە وەدەرکەوت. دنیا تاریک داهاتووە و ئەستێرەکان لە ئاسماندا دەدرەوشێنەوە، کە گەیشتە بەردەم هۆتێلی (بەهەشت)، دەرگاوانەکە کڵاوەکەی هەڵبڕی و وتی: قوربان دەمویست شتێکتان پێ بڵێم، گەر ئارەزوودەکەیت شەوانە پشوو بدەیت، واباشترە زووتر بۆ هۆتێلەکە بگەڕێیتەوە و بخەویت، چونکە لە کاتی جیاوازی شەودا، فڕۆکە بەریتانییەکان پەلاماردەدەن،ئاسوودەییت دەشێوێنن و من گومانم نییە ئەمشەویش فڕۆکەکان پەلاماردەدەن.

(ئەریکسۆن) سەری لەقاند و چووە ژوورەوە و کە پێی خستەناو ژوورەکەی خۆیەوە، بە نیگەرانی و حەپەساوییەوە هەستیکرد پیاوێکی دیکەشی لێیە و بە ژووری ئەویش ئەژماردەکرێت. بەناچاری و بۆ خۆناساندن، دەستی تەوقەی بۆ ئەو پیاوە درێژکرد، ئەو پیاوە ئەڵمانییە کەوتە

زەمبی ئەڵمانییەکان و سکاڵای لە دەست نەبوونی شوێنی نیشتەجێ بوون کرد.

(ئەریکسۆن) لە وەڵامدانەوەی هەموو پرسیار و قسەکانی ئەو پیاوە ئەڵمانییە، کە خۆی بە (شوفیل) دەناساند، هیوای باشبوونی بۆ دەردەبڕی، کە بە سەرکەوتنی ئەڵمانیا و کۆتایی پێهاتنی شەڕ، هەموو ناخۆشییەکان نامێنن، بەڵام بە درێژایی کاتی قسەکردنەکە، بەردەوام بە خۆی دەوت: ئەی خەوی خۆشەویست و ئازیز ماڵاوا، چونکە جارێکی دیکە ببڕای ببڕ ڕێگەت ناکەوێتە چاوەکانی منەوە. لەوانەیە ئەو پیاوە کارمەندی گشتاپۆ، یان لە تەواوی هۆبە و ناوەندەکانی سیخوڕی، وەک ئیدارەی سیخوڕی ئەدمیسر ئال کاناریس و ئایۆر، بێت و ئەگەر بنوم، دوورنییە لە خەودا وڕێنە بکەم و خۆم ئاشکرابکەم.

لە ئالیان ژمارەیەک هۆبەی سیخوڕیی جیاجیا هەن، کە هەریەکەیان بۆ چاوەچاوێنی لەگەڵ هۆبەکەی دیکە، هەوڵیدەدا خزمەتێک ئەنجامبدات.

(ئەریکسۆن) لەبیری نەمابوو کە هەرگیز لە ژیانی خۆیدا لە خەودا  وڕێنەی کردبێت، کەسێک ئەوەی بە گوێدا بدات و تەنانەت بەم دواییانەش ئینگریدی هاوسەری شەوێک نەنووستبوو، تا بزانێت مێردەکەی لە خەودا وڕێنەدەکات، بەڵام نقەی لێوە نەهاتبوو.

ئەریکسۆن بە بیانووی ئەوەی دەیەوێت بڕوات مەشرووب بخواتەوە، لە ژوورەکە وەدەرکەوت و چووە سەر شەقامەکە و پیاسەی کرد، نزیکەی دوای نیوسەعات، گەیشتە وێرانەیەک کە ژمارەیەک ژن و پیاو و منداڵی جلوبەرگدڕاو لەوێ کروشمیان کردبوو.

ئەوانە بێ ماڵ، ئاوارە ببوون و شوێنی نیشتەجێ بوونیان نەبوو، بە جلوبەرگی دادڕ دادڕەوە لەسەر شەقامەکان نووستبوون، ئەریکسۆن کێشەی خەوتنی خۆی بەئاسانی چارەسەرکرد. بەو مانایەی بۆینباغەکەی دانا و لە گیرفانی هاویشت، پاشان دەلینگی پانتۆڵەکەی هەڵدایەوە، قژی ئاڵۆزکرد، چاکەتەکەی داکەند، قۆڵەکانی هەڵگێڕایەوە و پۆشیوویەتییەوە، ئینجا مشتێک تۆز و خۆڵی لە دەموچاوی هەڵسوو، خۆی وەک پیاوێکی جلوبەرگی شڕۆڵ پۆش، شپرزە، بێ ماڵ و حاڵ لێکرد، بەوپەڕی ئاسوودەیی، زۆر ماندوو و هیلاک لەبن دیوارێک پاڵکەوتوو نووست.

**بەرلین لە سەردەمی شەڕدا**

(بارون فۆن نوردهۆن) سەرۆکی دەزگای گشتپاۆ بە ئەریکسۆنی وتبوو، کە لەوانەیە یەک دوو ڕۆژ درێژەبکێشێت تا مۆڵەتی پێ بدرێت، سەرقاڵی ئەنجامدانی مامەڵەی خۆی بێت.

(ئەریکسۆن) بڕیاریدا تا وەرگرتنی بڕیاری دەزگای گشتاپۆ، دەست بۆ هیچ کارێک نەبات و کاتەکانی خۆی بە خولانەوە بەسەر شەقامەکاندا بەسەربەرێت.

(ئەریکسۆن) هەرچەند زیاتر پیاسەی بەناو شاری بەرلین دا دەکرد، زیاتر لە وێرانییەکان و ئەو خەساراتانەی کە پێی کەوتبوون، ئاگاداردەبووەوە. کتێبخانەی نیشتمانی بەتەواوی ئاگری گرتووە و ئۆپێرای (گۆرینک) داتەپیبوو. تۆپیان لەسەر زۆربەی تەلارە بەرز و بڵیندەکان، دابەستبوو.

ئەریکسۆن بەنیگەرانییەوە بەرەو لای شەقامی (تایر گارتن) سەربەرەوژێر بووەوە، بەڵام ئەوێ هەم لەگەڵ خاک تەختکراوە، باخی ئاژەڵانی شار لەناوچووبوو. خەڵک لەبرسان لە شەقامەکاندا کەوتوون و دەیانناڵاند.

(ئەریکسۆن) دڵنیابوو ئەگەر کەمیی خۆراک هەروا بەردەوام بێت، بەریتانیا پێویستی بەوە نابێت ئەڵمانیا بۆردومان بکات، چونکە ئەو وڵاتە خۆی لەخۆیدا هەرەس دەهێنێت. ئارەق، ناوچاوانی داپۆشیبوو، هەر بەو سەروکەللەوە چووەناو گەلەری شێوەکاریی گەورەوە، کە نرخی چوونەژوورەوەی 50 (فنیگ) بوو، لەوێ تابلۆی ژنی ڕووتوقووتیان خستبووەڕوو.

***

ئەریکسۆن ئەو ڕۆژە دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، جارێکی دیکە چووەوە سەر شەقام و تەماشای شەقام و شوێنە وێرانکراوەکانی کرد، کە سەردەمێک هەریەکەیان بە شاکاری تەلارسازی ئەژماردەکران.

چەندین سەعات بەو شێوەیە تێپەڕین تا ئەریکسۆن ماندوو و هیلاک بۆ هوتێل گەڕایەوە و لە پرسەگەکەی پرسیی، کە ئایا هیچ نامایەکی بۆ هاتووە یان نا، وەک وەڵامی نەرێنی بیست، بە پلیکانەکاندا سەرکەوت و بەحەپەسانەوە بینیی کە هاوژوورەکەی، واتە (شۆفیل) چووەتەدەرەوە. بۆیە لەسەر تەختەخەوەکە پاڵکەوت و چاوەکانی نووقاند و دوای کەمێک خەوبردبوویەوە. پاش چەند کاتژمێرێک، ئەریکسۆن خەبەری بووەوە و دەموچاوی شوشت و چووە ناو باڕی هوتێلەکەوە، هاوکات دەنگی چەند ئاژێرێک بیسترا و ئینجا دەرگای هۆڵەکە کرایەوە و (شۆفیل) وەژوور کەوت و هاواریکرد ڕابکەن. مەترسی. مەترسی.

هەر لەو کاتەدا نەڕەی ڤڕەڤڕی فڕۆکەکان بیسترا و ڕمبەی تەقینەوەی گوێکەڕکەر هەستا و هۆڵەکە لاژایەوە. بەڕێوەبەی هۆتێلەکە دەستەبەجێ گڵۆپەکانی کوژاندەوە و بە دەنگێکی هەڵلەرزیوەوە وتی: دیسانەوە فڕۆکەکانی بەریتانیا هاتنەوە.

نزیکەی پێنج خولەک بارودۆخەکە بە هەمان شێوە بوو،

سەرەنجام بێدەنگیی مەرگهێن هەمووشوێنێکی داگرت و نەمانی مەترسی ڕاگەیەنرا.

***

بۆ بەیانی زووی ڕۆژی داهاتوو، بەردەستی بارون فۆن هۆف تەلەفۆنی بۆ ئەریکسۆن کرد، داوای لێکرد سەعات یازدە لە ئیدارەی ئاساییش ئامادەبێت.

بارون فۆن هۆف، سەرۆکی دەزگای ئاساییش بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لە ئەریکسۆن کردووە و وتی: جەنابی ئەریکسۆن، داواکەت پەسندکراوە و دەتوانیت لە بەرلین و هامبۆرگ مامەڵەی نەوت ئەنجامبدەیت، وێڕای ئەوە، دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت هاموشۆت بۆ دوو شاری دیکە هەبێت.

- مەمنووم.

- هەڵبەتە هەرجۆرە گرێبەستێک ببەستیت، پێویستە زانیاریمان لەبارەیەوە هەبییت.

- ئەوە زۆر ئاشکرایە.

بارون فۆن هۆف زەنگی لێدا و وتی: زۆ باشە. کەوایە ئێستا مۆڵەتی تایبەتی سەفەرکردنت پێدەدرێت.

بەڵێ، من سیخوڕم

هەر ئەو ڕۆژە (ئەریکسۆن) سەردانی چەند سەرۆک کۆمپانیای نەوتی کرد، لە بەرلین و هەرچەندی کردی،

بتوانێت گرێبەست واژۆبکات، بۆی نەکرا و لەبەرئەوە بڕیاریدا سەردانی چەند خاوەن کۆمپانیایەکی نەوتی تر بکات، کە لە کۆنەوە دەیانناسێت تا لەوانەیە ئەرکەکەی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت.

ئەریکسۆن بەو بڕیارە سەردانی بارون (جرالّد ئەلدنبۆرک)ی کرد، کە لە خاوەن پشکە گەورەکانی نەوت بوو، چونکە لە کۆنەوە دەیناسی، بۆیە باش ئەخلاقی ئەوی دەزانی، کاتێک هێشتا شەڕ دەستی پێنەکردبوو، (ئەریکسۆن) چەندین جار چاوی بە (ئالدنبۆرک) کەوتبوو، لەبارەی کاری سیاسییەوە دواندبووی. شەو بوو کە (ئەریکسۆن) بۆ سەردانی ئەو پیاوە ڕۆیشت، کە وتمان خاوەن پشکی نەوت بوو، لە کاتێکدا کە لەسەر کورسی دادەنیشت و پەرداخە کۆنیاکەکەی خۆی هەڵدەقوڕاند، وتی: ئەگەر ئارەزووبکەیت من کارێک دەکەم لێرە بگوازرێیتەوە و شوێنی کاری خۆت ببەیتە وڵاتێکی بێلایەن.

- سوپاست دەکەم.

- جرالّد ئایا منت لەیادە، کە هێشتا شەڕ دەستی پێنەکردبوو...

بارون (جرالّد ئالدنبۆرک) ئاخێکی هەڵکێشا و وتی: بەڵێ، پێویستە بڵێم هەرگیز چاوەڕوان نەبووم دۆخەکە بەم خێراییە بگۆڕێت.

– ئێستا تەواوی ئەورووپا لەژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیادایە.
– بەڵێ، میللەتەکەمان سەرکەوتنگەلێکی درەوشاوەی دەستەبەرکردووە.
– جراڵد ئایا دەزانی بیروباوەڕی من چییە؟ من لەبەرئەوە بڕیارمداوە مامەڵەی نەوت لەگەڵ ئەڵمانیا ئەنجام بدەم، چونکە مشتەری لەوە باشتر نییە، بەڵام هەرچۆنێک بێت، پێموانییە ئەڵمانیا سەربکەوێت.
(ئالدنبۆرک) سەری دانەواند و وتی: ئاخر سەرکەوتن چەند جۆرێکی هەیە، ئەگەر مەبەستی تۆ ڕزگارکردنی هەموو جیهانە، دەبێت منیش بۆ جەنابتی بخەمەڕوو، کە ئەو کارە ناکرێت، بەڵام بۆ گەورەکردنی ئەڵمانیا، توانین زۆرە.
ئەریکسۆن سەری لەقاند و وتی: نەخێر ڕاست نییە. لە سەدا سەد ئەمەریکا دەبێتە هاوپەیمانی هاوپەیمانان و ئەو کارە، دەبێتەهۆی لەناوبردنی ئەڵمانیا. بیری لێ بکەرەوە، ئەگەر ئەمەریکا، بەریتانیا و ڕووسیا، واتە سەد وڵاتی بەهێز لە دژی ئەڵمانیا یەکبگرن، چ کارەساتێک ڕوودەدات.
(ئالدنبۆرک) سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاند و وتی: دەزانی ئەریک، ئەگەر بتەوێت لە شوێنی دیکەش ئەو قسانە بکەیت، پێموانییە بۆتۆ باش بێت، ئەگەر من لە شوێنی تۆ بوومایە، پلە بە پلە خاکی تر دەبووم.

- نیگەران مەبە جرالْد، من لە بـەردەم کارمەندانی گشتاپۆدا بەوجۆرە قسەناکەم، بێجگە لەمانە، پێموانییە تۆش لە ناخی دڵەوە ئەو قسانە بکەیت.

(ئالدنبۆرگ) وەڵامـی دایـەوە. من ئەوەندەی بتوانم لە ڕێگەی وڵاتی باپیرانم گیان فیدا دەکەم.

(ئەریک) بڕیاریدا کە زووتر بچێتە سەر ئەسڵی مەسەلەکە و هەر لەبەرئەوە وتی: بە باوەڕی من چاکترین خزمەتێک، کە تۆ دەتوانیت لەپێناو ئەڵمانیادا ئەنجامی بدەیت، ئەوەیە وابکەیت شەڕ کۆتایی پێبێت.

بـارون ئـالـدنـبـۆرک پـیـاوانـە وتــی: بـەڵـێ هـەڵـبـەتـە و درێژەکێشانی شەڕ بە زەرەری ئەڵمانیا تەواودەبێت.

- گوێ بگرە جرالْد، من باش لە نیازت گەیشتووم و پێویست ناکات شێر و ڕێویان بهێنییەوە. دڵنیام تۆ چارەی نازیت ناوێت و لە کردەوەی نازییەکان نیگەرانیت و وەک من ئەو بابەتە دەزانی، بۆیە هاتمە لات.

- بە ڕاستی؟

- جرالْد، دەمویست بابەتێکی گرنگت پێ بڵێم و داوای یارمەتیت لێبکەم. لەوانەیە بۆخۆشت هەستت بە مەبەستی مـن کـردبێت، ڕاستیی کـارەکـە ئـەوەیـە، کـە مـن کـار بۆ هاوپەیمانان دەکەم.

ئالدنبۆرگ بەحەپەسانەوە وتی: وتت چی؟

(ئەریکسۆن) کەمێک بۆ پێشەوە چەمایەوە و وەڵامی دایەوە: وتم لەگەڵ هاوپەیمانان کاردەکەم، واتە سیخوڕم و لەبەرئەوە ئەو کارەم کرد، چونکە دەمەوێت گیانی خەڵکی سڤیل لە مردن ڕزگاربکەم و ئەڵمانیای ڕاستەقینە، هەمان ئەڵمانیا، کە تۆ ئامادەیت گیانی خۆت بکەیتە ق\ وربانی، لە شکست ڕزگاربکەم و بە شانازی و ئازادی بگەیەنم. ئەوەی دەمەوێت لە تۆ داوای بکەم، هەمان شتە کە هەموو خەڵک ئارەزووی دەکەن. کارێکی زۆر سادەیە و هەر هێندە تۆ هاوکاریم بکەیت تا ئاشنای کۆمپانیاکانی نەوتی ئەڵمانیابم، گرێبەست واژۆبکەم، بەو شێوەیە دەتوانم لە وڵاتی ئەڵمانیادا سەفەربکەم و بێجگە لەوانە، دەبێت تۆ کەمێک زانیاریم بخەیتە بەردەست، زانیاری لەبارەی نەوت و لەجیاتی، هاوپەیمانان شەڕەکە دەبەنەوە و ئاگرەکەی دەکوژێتەوە، تۆ و خانەوادەکەتان ڕێزی لێدەنرێت و دوای کۆتایی پێهاتنی شەڕ، تۆ دەبیتە پاڵەوانێکی ناودار.

بارون ئالدنبۆرک چەند ساتێک لە جێگەی خۆی دانیشتووە، لە ڕوخساری ئەریکسۆن ڕاماوە و لە ئاکامدا ڕاچڵەکی و وتی: ئەریک تۆ منت حەپەساند و هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات تۆ سیخوڕ بیت. پێشنیازەکەت زۆر سەرنجڕاکێشە، بەڵام پێش ئەوەی ڕەزامەندی دەربڕم، دەبێت کەمێک بیر لە پێشکەوتنی کارەکان بکەمەوە.

ئەریکسۆن سەری لەقاند و وتی: کارەکەی ناردنی زانیارییە لەبارەی پالاوگە نەوتییەکانی ئەڵمانیا، ئەو زانیارییە وا دەکات هاوپەیمانان بەسەر ئەڵمانیادا سەربکەون و بەردەوام بوو: ئەگەر تۆ وا بکەیت من بتوانم بچمە پالاوگەکان، دەتوانم زانیاری کۆبکەمەوە، بەڵام من لەوبارەوە زۆر پشت بەخۆم نابەستم و زیاتر پشت بە هاوڕێیانی وەک تۆ دەبەستم.

ئالدنبۆرک جگەرەکەی داگیرساند و وتی: (مەبەستت لە هاوڕێیان چییە؟)

– ئاخ، نیگەران مەبە هیچ کام لەو کەسانەی کە هاوکاریم دەکەن، یەکتری ناناسن.

– بەڵام ئەگەر ئێمە هەردووکمان بە یەکەوە ببینن، هەست بە زۆر شت دەکەن و من زۆر ڕقم لەو کارە دەبێتەوە.

– دڵنیابە کە هیچ کام لە هاوکاران، ئێمە پێکەوە نابینن و هیچ کەسێک نازانێت تۆ هاوکاریی ئێمە دەکەیت.

– کەوایە کاتێک هەواڵەکەی خۆت ڕادەگەیەنیت چی؟ ئایا ئەو کاتە هیچ ناوێکی من نابرێت؟ لەوانەیە کارمەندانی سیخوڕیی ئەڵمانیا بە بابەتەکە بزانن و من هەراسان بکەن.

(ئەریکسۆن) بە تۆنێکی دڵنیابەخش وتی: ناوی هاوکارەکانمان تەنیا بە شێوەی ڕەمزی ڕادەگەیێنرێت و کەس لەوە ئاگادار ناکرێتەوە و بێجگە لەمانە، من هیچ

هۆیەک نابینم کە بۆچی نابێت ناوی تۆ لەم مەسەلەیەدا ببرێت، تاکە کارێک دەبێت ئەنجامی بدەیت ئەوەیە، کە بە من بڵێی لەبارەی نەوتەوە چ زانیارییەک دەزانیت، هەڵبەتە ئەو کارە بۆ تۆ هیچ مەترسییەکی نییە و نابێت بترسیت.

- پێم بڵێ چ جۆرە نەوتێک بکڕم، کە زیاتر من لە کارەکانمد بەرەوپێش بەرێت؟ مەبەستم ئەوەیە کە ...

(ئالدنبۆرک) قسەکەی پێ بڕی و وتی: لە ئێستادا بەنزینی ئۆتۆمبێل زۆرترین قازانجی ماددی هەیە، کە لە نەوت دەردەهێنرێت.

(ئەریکسۆن) هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا و پشتی بە پاڵپشتی کورسییەکە دایەوە، تێگەیشت کە یەکەمین هەنگاوی لە ڕێگای دۆزینەوەی هاوکاردا هەڵهێناوە.

***

### مامەڵەکردن و مەترسییەکان

کاتێک (ئەریکسۆن) دەچووە ناو هۆتێلەکەوە، لەناکاو بیرۆکەیەک دزەی کردە مێشکییەوە، لە خۆی پرسی: ئەگەر بارون ئالدنبۆرک تەلەفۆن بۆ پۆلیسی گشتاپۆ بکات و خەبەری لێبدات، چ دەقەومێت؟

ئەو پیاوە هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوان بوو لە هۆڵی هۆتێلەکە ژمارەیەک پۆلیس چاوەڕوانی بن، بەڵام کە

چووەژوورەوە،  هیچ کەسی لەوێ نەبینی و لەسەرخۆ بە پلیکانەکاندا سەرکەوت و چووە ژوورەکەی خۆیەوە.

(ئەریکسۆن) ئەو شەوە بە دوو شت زۆر دڵخۆش بوو. یەکەم، کە (شفیل)ی هاوژوورەکەی ڕۆیشتووە، ژوورەکە بۆ ئەو مابووەوە و دووەم، پێشبینیی مەترسیی پەلاماری ئاسمانیی بەریتانییەکان ناکرێت بۆسەر بەرلین.

(ئەریکسۆن) حەبێکی ڤالیۆمی خوارد و دەستەسڕەکەی لە دەمی هاڵاند تا ئەگەر مایک، یان ئەگەرهاتو ڕیکۆردەری تۆمارکردنی نهێنیان لە ژوورەکەی دانابێت، ئەگەر ئەو لە خەودا وڕێنەبکات، قسەکانی تۆماربکات، سەرکەوتوو نەبن و ئەوکاتە پاڵکەوتووە و بەقووڵی خەوبردوویەتییەوە، کە بۆ بەیانی خەبەری بووەوە، هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر دەکرد.

کاتێک (ئەریکسۆن) بەدوای کاری هەمیشەیی خۆیەوە، واتە سەردانی کۆمپانیا نەوتییەکانی کردەوە تا گرێبەست واژۆبکات، نەوت بۆ سوید بکڕێت و بفرۆشێت (چونکە ئەگەر گرێبەستی واژۆدەکرد، دەیتوانی بچێتە پاڵاوگە نەوتییە نهێنییەکان و کتومت بە چاڵە نەوتییەکان بزانێت). جاریکی دیکە بیرۆکەیەک زایە مێشکییەوە، لە خۆی پرسیی ئایا داوەی پێشووی لەبارەی (ئالدنبۆرک) ڕاستە یان نا. ئایا (ئالدنبۆرک) بۆ ئەڵمانیای ئاشکراناکات؟

ئەو پرسیارانە و دەیان پرسیاری دیکە، هەموویان لە مێشکیدا بێوەڵام مانەوە. بە درێژایی ئەو هەفتەیە، ئەریکسۆن سەری لە چەند کۆمپانیایەکی نەوت دا، کە پێش ساڵانێک مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ ئەنجامدابوون، لەناو بەڕێوەبەرانی ئەو کۆمپانیایانە، ژمارەیەک هاوکاری بۆ خۆی کۆکردەوە، کە دەکرێت لەوانە ناوی (ئەنتوان راسیز)، بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گچکەی نەوتی و (ڕۆدلف فۆن لیندن)، خاوەن بانکێکی گەورە بێنیت. تەواوی ئەو ژن و پیاوانەی کە لە سەفەری یەکەمدا ئامادەبوون هاوکاریی (ئەریکسۆن) بکەن، هەموویان (ئەنتی نازی) (دژەنازی) بوون.

(ئەریکسۆن) زۆر هەوڵ وتەقەلای دەدا تا هیچ کام لەو کەسانەی، کە بۆ هاوکاریکردنی خۆی دیاریکردوون، بە ناسنامای ئەوی دیکە نەزانێت و لە کاتی پێشبینینەکراودا یەکتری ئاشکرانەکەن. بەو شێوەیە بوو کە ئەو پیاوە توانیی ژمارەیەکی زۆر هاوڕێ و هاوکار بۆ خۆی کۆبکاتەوە.

لەو شەوەوە کە (ئەریکسۆن) بڕیاریدا لەگەڵ (ئالدنبۆرک) کاربکات، هەمیشە چاوەڕوانبوو هاتوچۆی پۆلیس بکات و هەرکاتێک بە شەقامەکاندا پیاسەی دەکرد، لە بەردەم جامخانەی دوکانەکان دەوەستا، دوای ئەوەی خۆی بە داگیرساندنی جگەرەوە دەخافڵاند، لە شووشەکە ڕادەما تا ئەگەر کەسێک چاودێری کردبێت، بزانێت.

ورده ورده هاوڕێیانی (ئەریکسۆن) زانیاریی پێویستیان پێگەیاند و لەبارەی پاڵاوگە و دامەزراوە نەوتییەکانەوە هەواڵیان پێدا. (ئەریکسۆن) دەیزانی نووسینی هەموو ئەو بابەتانە، کارێکی مەترسیدارە و لەبەرئەوە بە هەوڵێکی سەیر و بڕیارێکی قاییم و پتەو، هەمووی بە مێشکی خۆی دەسپارد، ئەوە مێشکی ماندوو و هیلاک کردبوو.

نازییەکان زۆر بیریان لە پاشەکەوتی نەوتی خاوی خۆیان دەکردەوە، ئەگەر هاوپەیمانان دەیانتوانی چاڵە نەوتییەکان تێکبدەن، ئەڵمانییەکان تووشی قەیرانی سووتەمەنیی ئامرازەکانی گواستنەوە و فڕۆکەکان دەبوون، ئەو کارە سەری دەکێشایە شکست پێهێنانیان. ئەریکسۆن لەبارەی ئەرکەکەیەوە زۆر گەشبین بوو، بۆ دەرئەنجامەکەی هیوادار.

***

ئەو گرێبەستانەی ئەریکسۆن لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکان دەیبەستن، بە نوێنەرایەتیی حوکومەتی سوید، نەوتی خاوی دەکڕی و لەجیاتی ئەڵمانییەکان دەیانتوانی لە سوید چەک و کەلوپەلەکانی شەڕ وەربگرن.

شەوێک، کاتێک (ئەریکسۆن) لە میوانداریيەک لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرۆک پاڵاوگەکان مژولی قسەکردن بوو، تێگەیشت هەموویان دژی نازیزمن و گفتوگۆ لەسەر

مامەڵەیەک بوو، کە پێش 20 یان 30 ساڵ ئەنجامیان دەدا.

لە کاتی قسەکردندا، لەناکاو یەکێک لە ئەڵمانییەکان ڕووی لە (ئەریکسۆن) کرد و وتی: قوربان، ئەو ڕۆژانەی پێشوو، بە شوومترین و خراپترین سەردەمانی ئەڵمانیا ئەژماردەکرا،ة بەو زوانە تەواوی دنیا ڕزگاردەکەین، لاپەڕەیەکی دیکە دەخرێتە سەر مێژووی پڕشکۆی ئەڵمانیا. (ئەریکسۆن) ئاخێکی هەڵکێشا و وتی: بەڵێ ڕاستە وایە و من بیرم لەو ڕۆژانە دەکردەوە، کە چەند لەگەڵ خاتوونەکان بۆ پیاسە و گەشت دەچووینە تاران و شانگهای، هەڵبەتە هێشتاش ئارەزووی دەکەم، بەڵام ئەو سەردەمە تێپەڕیوە و من ئێستا خێزاندارم و تین و تاقەتی لاویم نییە.

پیاوە ئەڵمانییەکە پێکەنی و وتی: ئاخ، بەڵێ. منیش هەروام.

## ئۆتۆ، کلارادهانس

(ئەریکسۆن) دوای دوو هەفتە مانەوەی لە بەرلین، بەرەو شاری هامبۆرگ کەوتەڕێ. هامبۆرگ ئەو سەردەمانە بە گەورەترین و گرنگترین بەندەری ئەڵمانیا ئەژماردەکرا.

(ئەریکسۆن) بە شەمەندەفەر سەفەری بۆ ئەو شارە کرد، لە فارگۆنێکدا دانیشتبوو کە موسافیرێکی زۆری لەناو دابوو، بە دیژایی سەفەرەکەی دەنگی گریانی منداڵی موسافیرەکان نیگەرانیان کردبوو، (ئەریکسۆن) نیوەی زیاتری ڕێگاکە لە

ڕاڕەوەکەدا وەستاوە، سەری لە پەنجەرەکەوە بردبووە دەرەوە.

بەندەری هامبۆرگ کەمتر لە بەرلین زیانی بەرکەوتووە، هاوشێوەی ونیز و ستۆکهۆڵم، پردی جیاجیای زۆربوو، کە جوانییەکی زۆری پێدەبەخشی و تەواو دیاربوو، کە فڕۆکەکانی بەریتانیا کەمتر بە ئاسمانی ئەو شارەدا فڕیون. میچی وێستگەی هێڵی ئاسنەکە، سەوز داگەڕاوە و لە ئاسمانەوە لە باخێکی گەورە دەچێت.

(ئەریکسۆن) لەوێ سەردانی چەند پاڵاوگە و کۆمپانیایەکی نەوتی کردووە، بە هەبوونی بەڵگەی پێویست، چەند گرێبەستێکی واژۆکردووە. چەندین جار لەگەڵ بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکان چووەتە هۆتێل و نانی لەگەڵ خواردوون.

(ئەریکسۆن) لەوێ بڕیاریدا کە تاری سیخوڕیی خۆی بە دەوری کارمەندانی ڕایشدا بتەنێت و یەکێک لە پیاوەکان، کە بۆ ئەو کارە دیاریکرد، ناوی (ئۆتۆ هۆڵتز) بوو. ئەریکسۆن پێش ساڵانێک (ئۆتۆهۆڵتز)ی، کە لە هاوڕێیانی دڵسۆز و هەواڵی خۆی بوو، دەناسی و پیاوێک بوو باڵا مامناوەندی شووش و باریک. (ئەریکسۆن) دەیزانی، کە لەوانەیە هەڵبژاردنی ئەو پیاوە بۆ هاوکاریکردنی خۆی ئەنجامی ترسناکی هەبێت، بەڵام پاشان ڕازی دەبێت،

کە (هۆڵتز) بە پێچەوانەی زۆربەی ئەڵمانییەکان، پیاوێکە سەرەڕۆ بە ئیرادە و هەر لەبەرئەوە سەردانی کرد، کە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی نەوتی گەورە بوو، لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا، ئەریکسۆن ڕووی لە هۆلتز کردووە، گۆزوگومبەت مەبەستەکەی خۆی پێوتووە.

(هۆڵتز) سەری هەڵبڕیوە و وتوویەتی: من دڵنیام تۆ کارمەندی گشتاپۆ نیت و ناشتەوێت قسەم لێ دەربێنی، لەبەرئەوە بەوپەڕی بێخەمی دەردەدڵی خۆمت لەلا دەکەم و ڕەزامەندیی خۆم بۆ هاوکاریکردنت ڕادەگەیەنم.

- زۆر باشە.

- بەڵام پێویستە ئەوەی بیزانی ئەوەیە، کە نابێت کلارای هاوسەرم ئەو بابەتەی پێ بگاتەوە.

- هاوسەرتان؟

- بەڵێ، پێموانییە تاوەکو ئێستاکە دیتبێتت.

- نەخێر، من شانازیی ناسینی ئەوم پێ نەبڕاوە.

- لەوانەیە بزانی (کلارا) دووەم هاوسەرمە. نزیکەی پێش سێ ساڵ، من لە ژنی یەکەمم جیابوومەوە و پاشانیش چاوم بە (کلارا) کەوت.

(هۆڵتز) دوای تەواوکردنی قسەکەی وێنەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و نیشانی (ئەریکسۆن)ی داو بەردەوام بوو: سەیرکە. بێگومان تێدەگەیت کە بۆچی من عاشقی ئەو بووم.

ئەو وێنەیە، ژنێکی نیوەڕووت بوو، لە کەناری دەریا وەستابوو، بەژن و باڵایەکی زۆر جوانی هەبوو، ئەریکسۆن مەزەندەی کرد ئەو ژنە نزیکەی بیست ساڵ لە (هۆڵتز)، کە تەمەنی پەنجا ساڵ بوو، گەنجترە و بەپێکەنینەوە وتی: پیرۆزباییت لێدەکەم ئۆتۆ، هاوسەرێکی جوانت هەیە.

(ئۆتۆ هۆڵتز) کەمێک سەری ڕێزی چەماندەوە و وتی: سوپاست دەکەم. بەڕاستی پێویستە ئەوە بڵێم کە (کلارا) هەرگیز ئاگای لەوە نییە، کە من لە کاری سیاسیی وڵاتدا بەشدارم.

– تێگەیشتم، بەڵام وا باشترە بە وادە و بەڵێنی ئێمەش نەزانێت. (هۆڵتز) بە بیرکردنەوەوە وتی: زۆرباشە، (کلارا) ی هاوسەرم نازییەکی زۆر دەمارگیرە، منداڵەکەشمی کردووەتە نازی و پێش ساڵانێک دەیویست پەیوەندی بە حیزبی نازییەوە بکەم، بەڵام هەڵبەتە من قبووڵم نەکرد و دڵنیام کە ئەگەر ئەو بزانێت من لەگەڵ تۆ دژی ئەڵمانییەکان چالاکی دەکەم، بێ سێودوو ئاشکرام دەکات و لە هەمووی گرنگتر تۆش ڕادەستی گشتاپۆ دەکات.

(ئەریکسۆن) بە تۆنێکی دڵنیابەخش وتی: ئێمە هیچمان نەکردووە، تا بترسین و ئێمە، لە کاتی خۆیدا، زۆر گرنگ و بەسوود ئەژماردەکرێین.

(هۆڵتز) لە وەڵامی پرسیارەکانی (ئەریکسۆن) وردەکاریی

وردی چەند پاڵاوگەیەکی نەوتی پێوت و لە ئاکامدا لە کاتێکدا هەردووکیان لە جێگەی خۆیان هەڵدەستان (هۆڵتز)، کە وتمان لە خاوەن پشکەگەورەکانی نەوتی هامبۆرگ بوو وتی: پێویستە سبەی شەو تۆ بۆ نانخواردنی ئێوارە لە ماڵەوە میوانم بیت، (کلارا)ی هاوسەرم بناسیت.

- زۆر باشە، سوپاست دەکەم.

***

(ئۆتۆ هۆڵتز) بە پیاوێکی دەوڵەمەند ئەژماردەکرا، خانوویەکی شەخسی گەورەی هەبوو، هاوسەرەکەی (کلارا) بە سەلیقەیەکی جوان ڕازاندبوویەوە. ئەو شەوە، کاتێک ئەوان لەپشت مێزی نانخواردن دانیشتن، (کلارا) وتی: جەنابی ئەریکسۆن، ئەم ڕۆژانە ئێمە کەمتر شانازیی پێشوازیکردنمان لە میوانانی دەرەوە پێدەبڕێت. سەرەنجام هیتلەر ڕێگەیەک بۆ کۆتایی پێهێنان بە شەڕ دەدۆزێتەوە.

(ئەریکسۆن) پەرداخە پڕ لە مەشرووبەکەی خۆی بڵندکرد و وتی: کەوایە با بخۆینەوە بە هیوای ڕۆژێک کە شەڕ تەواو بێت، جارێکی دیکە لە دەوری یەکتری کۆببینەوە، تام و خۆشی لە ژیان بکەین.

لەو کاتەدا کە پەرداخە پڕ لە مەشرووبەکەی خۆیان بە سەرەوە دەنا، (کلارا) بە پرسیارە جۆراوجۆرەکانی، (ئەریکسۆنی) گێژکرد و لێکدا لێکدا لە بارودۆخی سوید

و هەستی کۆمەڵانی خەڵکی ئەو وڵاتە لەبارەی ئەڵمانیاوە پرسی و پرسیاری دەکرد، کە ئایا هیچ شتێکی دەربارەی ئەڵمانیا نەبیستووە؟ ئایا سویدییەکانیش تووشی کەمیی خۆراک بوون، یان وەکو ئاسایی ژیانی شاهانەیان هەیە؟ (ئەریکسۆن لەسەر مێزی نانخواردنی ئێوارە بڕیاریدا، کە لە سەفەری داهاتووی خۆی، دیاری وەک قووتی کۆنسێرڤ (قوتوویەکە بۆ پاراستن و هەڵگرتنی خواردن) و بڕێک بۆن و جووتێک گۆرەوی بۆ کلارا بەرێت، چونکە لە تۆنی قسەکانی تێگەیشت، کە زۆر ئارەزوو دەکات ئەو شتانەی هەبێت.)

ئەریکسۆن ئەو ڕۆژانە بەباشی نەخشەی خۆی لەبارەی هاوبیروباوەڕبوون لەگەڵ نازییەکان بینیوە، بەتەواوی لە نیازی نازییەکان ئاگاداربووە، بەئاسانی وەڵامی پرسیارەکانی (کلارا)ی دەدایەوە و دوای نیو سەعات، (هانس) کوڕی ئەو ژن و پیاوە، هاتەلایان و لەسەر مێزی نانی ئێوارە لەگەڵیان دانیشت. تەمەنی نزیکەی نۆ ساڵ دەبێت و لە کاتی قسەکردندا بەردوام دەیوت بژی هیتلەر، وەک پیاوانی بەتەمەن زەڕەبینی کردووەتە چاوی و بە شێوەیەک قسەی دەکرد، کە (ئەریکسۆن) یەکسەر زانیی نازییەکان دزەیان کردووەتە ڕۆح و مێشکییەوە.

(کلارا) لەناکاو ڕووی لە ئەریکسۆن کردووە و پرسیی:

ئایا مێردەکەم پێی وتووی، کە بە سەری (هانس)، دیدەنی هیتلەری کردووە؟

- نەوەڵڵا.

(کلارا) بە لووتبەرزییەوە وتی: ئاخ، ئێمە پێش چەند مانێگ چووبووینە بەرلین و مێردەکەم (ئۆتۆ)، هەندێک کاری ئیداری هەبوو، منیش لەگەڵی چووم و دەمویست سەردانی ژمارەیەک لە هاوڕێکانم بکەم لە بەرلین و هەڵبەتە (هانس)یشمان لەگەڵ خۆمان بردبوو، بۆردومانی شار تازە دەستی پێکردووە، ئێمە ناچاربووین لە پەناگایەکی تایبەتی بەسەربەرین، هەر لەو کاتەدابوو، زانیم هیتلەر بۆ خۆی بانگهێشتی منداڵانی کردووە بچن لە پەناگاکەی شەخسیی خۆی ڕۆژ بەسەربەرن.

لەو کاتەدا (هانس) قسەکەی دایکی بڕی و وتی: زۆر سەیربوو. جەنابی هیتلەر دوو گۆڵی لەگەڵ دەکردین، تەوقەی لەگەڵ یەک بە یەکمان کرد، پێی وتم کە ئەڵمانیا پێویستی بە منە و پێویستە باش بخوێنم و کۆشش بکەم تا پاشان سوودم هەبێت، خزمەتی وڵاتی باب و باپیرانی خۆم بکەم، ئینجا لێی پرسیم کە پێمخۆشە لە دواڕۆژدا ببم بە چی و منیش وەڵامم دایەوە، ئارەزوو دەکەم ببمە ئەفسەر و هیتلەر دەستی بەسەرمدا هێناو پێیوتم ئافەرین.

(ئەریکسۆن) پێکەنی و وتی: زۆر سەرنجڕاکێش و جوانە.

چاوەکانی کلارا بریسکانەوە و وتی: ئایا سەیرنییە، کە هیتلەر لە جەرگەی شەڕدا، کاتی خۆی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵان تەرخاندەکات؟

- بۆ نا، زۆر سەیرە.

ئەو خواردنەی (ئەریکسۆن) لە ماڵی (هۆڵتز) خواردی، بە خۆشترین خواردن دادەنرا، کە لە ئەڵمانیا خواردبووی. دوای نانخواردن، ئەریکسۆن هەستی بە گێژبوون و نیگەرانی کرد، بەردەوام چاوەکانی ڕەشکەوپێشکەیان دەکرد، دوای کەمێک خاتوو (کلارا) هەستا و وتی: ئەگەر ئیزن بفەرموویت دەچم دەنووم، چونکە سبەینێ بەیانی دەبێت زوو لە خەو هەستم.

(ئەریکسۆن) ماڵاوایی لەو ژنە کرد و دوای ڕۆیشتنی کلارا، (ئۆتۆ هۆڵتز) وتی: باشە، ئێستا دەتوانین بەوپەڕی ئاسوودەییەوە قسە بکەین.

(ئەریکسۆن) باوێشکێکی هاتێ و ڕایگەیاندبوو بەڵێ و ئێمە دەتوانین زیاتر قسە بکەین، بەڵام چونکە من کەمێک ماندووم و خەوم دێت، وا باشترە گفتوگۆکەمان بخەینە بەیانی.

- پێم بڵێ بزانم ئایا نوکتە گاڵتەجاڕەکەی ئەڵمانیات بیستووە؟

- نەوەڵڵا، من چووزانم نوکتە گاڵتەجاڕەکەی ئەڵمانیا چییە و دەی بۆم باسبکە.

(هۆڵتز) پێکەنی و وتی: ڕۆژنامەکان ئەو نوکتەیەیان داتاشیوە و دەڵێن فڕۆکەیەکی دوو ماتۆڕ دەفڕێت، کە سەرنشینەکانی بریتین لە هیتلەر، هیملەر و گۆرنیگ، کاتێک ئەو فڕۆکەیە دەفڕێت و دەگاتە تۆقەڵای ئاسمان، لەناکاو دەتەقێتەوە و سێ لەسەر نشینەکانی دەمرن و یەکێک لەو سێ کەسانەش فڕۆکەوانەکەیە و تەنیا یەک کەس ڕزگاری دەبێت. ئایا دەتوانیت پێم بڵێی کامیان بەزیندوویی دەمێنێتەوە؟

(ئەریکسۆن) سەری ڕاوەشاند و وتی: نەخێر، من فالگرەوە نیم و چووزانم کێ بە زیندوویی دمێنێتەوە.

- خەڵکی ئەڵمانیا!

ئەریکسۆن پێکەنی و وتی: بەڕاستی نوکتەیەکی سەرنجڕاکێش بوو، ئەگەر خەوم نەهاتبا، باش بیرم لە قووڵایی وتەکانی تۆ دەکردەوە، لە پێکەنینان دەدڕام. نوکتەیەکی خۆش بوو. دەی، من ئێستا دەڕۆم و بەیانی لە نووسینگەکەت دەتبینمەوە.

- شەو شاد.

***

(ئەریکسۆن) بۆ ڕۆژی داهاتوو داوایکرد یاداشتێکی بۆ بنووسێت، کە پشتڕاستی بکاتەوە هۆڵتز کار بۆ هاوپەیمانان دەکات، ئەو پیاوە دەیتوانی بە بەڵگەی گۆرین، سوودێکی

شایستەی هەبێت و ئەگەر هاوپەیمانان شەڕەکەیان دەبردەوە، بەخستنەڕووی ئەو بەڵگەیە دەیتوانی بیسەلمێنێت، کە خزمەتێکی گرنگی کردووە، بێگومان ڕێزیان لێدەگرت و ئەگەریش ئەڵمانیا سەرکەوتبا، ئەو بەڵگەیەی دەدڕاند و هەروەک پێشوو کاری خۆی دەکرد، کەسیش بەوەی نەدەزانی کە لە سەردەمی شەڕدا، سیخوڕی بۆ هاوپەیمانان کردووە.

### پێخستنەسەر هێلکەی مریشك

(ئەریکسۆن) لە ماوەی چەند ڕۆژ مانەوەی خۆی لە هامبۆرگ، چانسێکی زۆر باشی هێنا کە ژووری هوتێلەکە تەنیا پەیوەندی بە خۆیەوە هەبوو، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە تەواوی گۆشە و کونوکەلەبەرەکانی ژوورەکەی گەڕا و هەڵیکۆڵی تا نەکات مایک، یان ڕیکۆردەریان بۆ دانابێت. کە دڵنیابوو لەو ڕووەوە هیچ مەترسییەک هەڕەشەی لێناکات، بەبێ ئەوەی دەمی بە دەستەسڕ ببەستێت، پاڵکەوت و خەوت.

پاش ئەوە (ئەریکسۆن)، بۆ دوو شاری دیکەی ئەڵمانیا، واتە (هبڵ) و (هانۆڤەر)یش سەفەری کرد، چەندین گرێبەستی دیکەی بەست و سەردانی چەند سەرۆکێکی پاڵاوگەی نەوتی کرد، توانیی زانیاریی جێگەسەرنجی دەستبکەوێت.

ئەریکسۆن بۆ ئەوەی زانیاری پێویستی خۆی بە مێشکی بسپێرێت، شەوانە پێش ئەوەی بچێتە ناو جێگەکەیەوە، هەموو ئەو بابەتانەی لەسەر کاغەز دەنووسی و دەیخوێندنەوە، کاتێک هەموویانی ئەزبەردەکرد، کاغەزەکەی دەسووتاند و خۆڵەمێشەکەی دەکردە سیفۆنی تەوالێتەکەوە.

کاتێک ئەریکسۆن بۆ بەرلینی پایتەخت دەگەڕایەوە، وردە وردە سەفەرەکەی لە پێشتر، ئاسانتر و ئاسوودەتر بوون، چونکە ئەم جارەیان فارگۆنەکان موسافیری کەمتریان تێدابوو. ئەریکسۆن لە خۆیدا هەستی بە غەریبی دەکرد، ئارەزووی دەکرد هەرچی زووترە سەفەرەکەی کۆتایی پێبێت و بۆ سوید بگەڕێتەوە، بەڵام کتوپڕ لە ترسی ئەوەی (ئۆلریخ)ی پاشکۆی بازرگانیی ئەڵمانیا لە سوید گومانی لێ هەیە، سەرتاپای وەک مێژۆک دەلەرزی.

ئەریکسۆن بە درێژایی سەفەرەکەی، بەتەواوی ئەو زانیارییانەدا گوزەری کردەوە، کە بە مێشکی سپاردبوو، لە ئاکامدا بەوپەڕی ڕازیبوونی لە بەرەوپێشچوونی کارەکەی خۆی، باوێشکێکی هاتێ و خەوت.

***

(ئەریکسۆن) لە شاری بەرلین، دوو کاری گرنگی هەبوو، کە دەبووایە زۆر زووتر ئەنجامیان بدات. یەکەم، دەبووایە بە هەر شیوەیەک بووە قەناعەتی بە پۆلیسی گشتاپۆ

بکردبا، لەمەڕ کارەکانی خۆی و ڤیزای چوونەدەرەوە لە وڵاتی ئەڵمانیا وەربگرێت، دووەم، پەیوەندی بکات بە هاوکارانی و زانیاریی زۆرتر دەستەبەربکات. بۆیە بۆ بەیانی زووەکەی ڕۆژی داهاتوو، واتە ڕۆژێک کە چووە ناو بەرلینەوە، ڕاستەوخۆ چووە دەزگای گشتاپۆ و باسی چالاکی و کارەکانی خۆی و ئەو گرێبەستانەی کرد، کە لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی ئەڵمانیا بەستبووی و باروون (نۆرد هۆف) سەرۆکی دەزگای گشتاپۆ، بەوردی گوێی بۆ قسەکانی شلکردبوو، بەردەستێکی خێرانووسیش لەوێ ئامادەبوو، قسەکانی ئەو پیاوەی دەنووسی. دوای ئەوەی ئەریکسۆن قسەکانی تەواوکرد، بارون (نۆردهۆف) چەند پسیارێک و داوای زانیاریی زیاتری لەبارەی گرێبەستەکانەوە لێکرد و وتی: بەڕواڵەت گرێبەستت لەگەڵ زۆر کۆمپانیا بەستووە، سێ مامەڵەی بازرگانیت لە وڵاتدا کردووەتەوە، من بۆخۆشم لە کاری نەوت شارەزام و پێمبڵێ، بزانم ئایا زۆری پێدەچێت تا ئەو گرێبەستانە جێبەجێ بکرێن؟

ئەریکسۆن وەڵامی دایەوە: بەڕێکەوت ئەوە پرسیارێکە، کە دەبێت من لە تۆی بکەم و بزانم کەی کاتی ئاڵوگۆڕی کەلوپەلی بازرگانیی نێوان دوو وڵات ئەنجامدەدرێت؟ من و هاوبەشەکەم پرنس کارڵ، خوشکەزای جەنابی ئۆگەستی پادشای سوید، زۆر ئارەزوو دەکەین بزانین، لە کەیەوە

ئێمە ترۆتفاقی شەڕ بنێرین و لەجیاتی نەوت وەربگرین؟
بارون نۆردهۆف سەری دانەواند و بیرکەرەوانە وتی: لەوانەیە ئەو کارە چەند هەفتەیەک بخایەنێت و پەیوەندی بە سیاسەتی حوکومەتەوە هەیە، دەبێت پەسەندبکرێت و پاشان مۆڵەتی کردنەوەی مامەڵە دەربچێت، وەک ئەوە نییە کە تۆ دەتەوێت بگەڕێیتەوە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید؟
ئەریکسۆن سەری ڕەزامەندی لەقاند و وەڵامیدایەوە: بەڵێ، من لێرە هیچ کارێکم نەماوە بیکەم، پێویستە بۆ وڵاتەکەی خۆم بگەڕێمەوە.
- زۆرباشە، کەوایە ئێمە ئەو کارە ڕێکدەخەین.
(ئەریکسۆن) دوای چوونەدەرەوەی لە دەزگای گشتاپۆ، تەلەفۆنی بۆ چەند بەڕێوەبەرێکی کۆمپانیای نەوتی کرد، ماڵاوایی لێکردن، بڕیاری پێویستی پێوتن، دەکرێت لەو کەسانەی تەلەفۆنی بۆ کردن ناوی بارون ئالدنبۆرک، هەروەها ناوی تەواویان بهێنیت و پێش ئەوەی شەو دابێت، تەواوی کارەکانی خۆی ڕێکخست. کارەکان بەپێی ویست دەڕۆیشتن و ئەریکسۆن بە شێوەیەک نەخشەکەی خۆی ڕێکخست، کە دوانیوەڕۆی ڕۆژی داهاتوو لە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید بێت، هەڵبەتە ئەو کارە لە کاتێکدا شیاوبوو، کە گشتاپۆ بە ئەرکە نهێنییەکەی نەزانێت و ڕێگەی چوونەدەرەوەی لێنەگرێت.

(ئەریکسۆن) هەمووکاتێک وا هەڵسوکەوتی دەکرد، کە وەک بڵێی پێی خستووەتە سەر هێلکەی مریشک و دەترسا نەکات بیانشکێنێت، لە تەواوی کارەکانیدا ورد و چاودێر بوو.

(ئەریکسۆن) ئەو شەوە کەمێک نانی لە هۆڵی هۆتێلەکە خوارد، پاشان چووە ژوورەکەی و دوای داخستنی دەرگاکە لە دواوە، جارێکی دیکە دەستەسڕەکەی لە دەمی پێچا و لە ماوەی کەمتر لە چەند چرکەیەک بەقووڵی خەوبردیەوە، کاتێک خەبەری بووەوە، کە دەنگی ئاژێری مەترسی بیسترا، خێرا لە جێگەکەی دەرپەڕی و چاوێکی لە سەعاتەکەی کرد. زیاتر لە چەند سەعاتێک نەخەوتبوو، کەمێک ئاوی ساردی بە دەموچاویدا کرد، ئەو گۆڤارەی تاودایە کە کڕیبووی و بۆ پەناگە ژێرزەمینەکەی هۆتێلەکە ڕۆیشت، لەو گۆڕە نیوەڕووناکە، دەستیکرد بە خوێندنەوەی گۆڤارەکە و ئەوەندەی پێنەچوو، فیکەی نەمانی مەترسیی بۆردومانی ئاسمانی زڕەی لێ هەستا، جارێکی دیکە ئەریکسۆن گەڕایەوە ژوورەکەی و خەوت.

***

سەعات نۆی ڕۆژی داهاتوو، ئەریکسۆن لە خەو هەستا و ڕیشی تاشی، سەعات سێ بۆ فڕۆکەخانەی (تمپلهۆف) ڕۆیشت و سواری فڕۆکە بوو، هەستیکرد

زۆربەی سەرنشینانی ئەو فڕۆکەیە ئەڵمانین. دوای کەمێک کارمەندی کۆنترۆڵ هاتەناو فڕۆکەکەوە، تەماشای کاغەزی موسافیرەکانی کرد، کە گەیشتە کورسیی (ئەریکسۆن)، ئەو پیاوە کاغەزەکانی خۆی نیشاندا و کارمەندی کۆنترۆڵکردنی فڕۆکەی لوفت هانزاو، هەروەها دوو ئەفسەری نازیی ئەڵمانیا سەری لێداونەوە و جانتاکانیانی پشکنیوە.

سەرەنجام دابودەستووری جیاجیا کۆتایی پێهات، فڕۆکەکە فڕی و دوای کەمێک، هەمووشتێک لە ئاسۆدا سڕدرایەوە، وێنەی شاری بەرلین لەبەرچاو ونبوو.

**بە تاوانبار ناسراو**

فڕینەکە بە خێر و سەلامەت ئەنجامدرا و ئەریکسۆن لەودیو شووشەکەوە، لە درەوەی دەڕوانی و پاپۆرەکانی لەسەر ئۆقیانووسی ئەتڵەسی دەبینی، لە هاتوچۆ دابوون و بە خۆی دەوت، کە بەم زوانە وەک ئەو پاپۆڕانە مژولی هەڵگرتنی نەوت دەبێت.

دوای چەندین سەعات، فڕۆکەکە بەسەر وڵاتی سوید دا فڕی، (ئەریکسۆن) لەخۆڕا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، وەک بڵێی بۆنی گیانڕزگارکردن دەکات، هەوای قووتدا، هەستی بە ئاسوودەیی کرد و دوای کەمێک تنۆکەئارەق ناوچاوانیان داپۆشی.

کاتێک میواندارى فڕۆکەکە دەستی خستە سەرشانەکانی و دەنگەکەی کە دەیوت: تکایە قاییشی پشتێنیی سەلامەتیتان ببەستن، بە گوێی گەیشت، تەواو خەبەری بووەتەوە، لە دەریای خەیاڵات هاتووەتەدەرەوە، تامەزرۆیانە چاوی بە دەرەوەی پەنجەرەکەدا گێڕا لە ئاسمانی بوولێڵی کازیوەی بەیانیدا، گڵۆپەکانی شاری ستۆکهۆڵم دەترووسکانەوە.

***

کاتێک ئەریکسۆن بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، پێش هەمووشتێک تەلەفۆنی بۆ پرنس کارڵ کرد، وادەی بەیانی بۆ چاوپێکەوتنی دانا. هاوسەرەکەی ئینگرید کە خەریکی ئامادەکردنی مەشرووب بوو وتی: لە ئەمڕۆ بەدواوە، جگە لە ئێمە هیچ کەس لە ماڵەوە نابێت و دەتوانین بە ئارەزوی خۆمان قسەبکەین.

ئەریکسۆن لە کاتی ئێوارەخوانی خۆش، کە هاوسەرەکەی ئامادەی کردبوو، دەستیکرد بە گێڕانەوەی ڕووداو و باسی تەواوی بەسەرهاتەکانی خۆی کرد، ناوی هاوکارە ئەڵمانییە تازەکانی هێنا.

(ئینگرید)یش ڕایگەیاند کە چەندین جار (ویلهێلم کۆرتز) ی نوێنەری (هیملەر)ی سەرۆکی گشتیی دەزگای گشتاپۆی لەو وڵاتە دیتووە، بەردەوام بوو کە ئەو پیاوە هەمیشە وەک ئاسایی ڕەفتاری هاوڕێیانەی لەگەڵ هەبووە، ئەریکسۆن

تامەزرۆیانە پرسی: ئایا هیچ هەواڵێکی (ئۆلریخ)ی پاشکۆی بازرگانیت نییە؟

– ئەو وەک قەبر کپ و بێدەنگە و هەرگیز لەبارەی تۆوە قسەی نەکردووە، من سەرم سوڕدەمێنێت، کە ئایا ئەو بەڕاستی گومانی لە تۆ هەیە یان نا.

***

بۆ بەیانی، ئەریکسۆن لەگەڵ پرنس کارڵ سەردانی نووسینگەکەیان کرد، ئەریکسۆن بەسەرهاتی خۆی بۆگێڕایەوە و باسی ئەو گرێبەستانەی کرد، کە بەستبوونی و وتی: چۆن ژمارەیەک بەڕێوەبەری کۆمپانیاکانی کردووەتە هاوڕا و هاوپەیمانی خۆی، پاشان گووشیی تەلەفۆنەکەی هەڵگرتووە و تەلەفۆنی بۆ (کۆرتز)، نوێنەری دەزگای گشتاپۆ کردووە، لەبارەی یارمەتیدانی لە کاری ڤیزا، سوپاسی کردووە، پاشان لە کاتێکدا گووشیی تەلەفۆنەکەی لە شوێنی خۆی دادەنایەوە، وتی: باشە کارڵ، ئێستا ئیدی نۆرەی ئێمەیە دەست بەکاربین.

(ئەریکسۆن) ئەوەندەی پێنەچوو سەردانی (کۆرتزی) کرد و پێیوت: چۆن لە بەستنی گرێبەستەکانی سەرکەوتووبووە، باسی شەڕ هاتەگۆڕێ، (کۆرتز) بە شڵەژان و تووڕەییەوە مستێکی بە مێزەکەدا کێشا و وتی: دڕندەکانی ڕووسیا ناتوانن لە بەرامبەر ئێمەدا خۆیان بگرن. دووژمنانی ڕایش

چاوەڕوانی پەرجوون و پێیانوایە، کە سەرکەوتوودەبن، بەڵام من لەلایەن خۆمەوە دڵنیاتان دەکەمەوە، کە پێش هاتنی زستانی ئەمساڵ، ئێمە سەردەکەوین و فڕۆکەکانی هێزە ئاسمانییەکانی ئێمە، مۆسکۆ و لینینگراد لەگەڵ زەی تەختدەکەن.

پرنس کارڵ کە لەوێ ئامادەبوو، سەری لەقاند و وتی: باوەڕموایە سۆڤێت تێکدەشکێت، بەڵام بەم زوانە نا، ئەوەی مسۆگەر و یەکجارەکییە ئەوەیە، کە ئەو وڵاتە دێرینە زوو بەچۆکدا دێت.

***

ئەو شەوە، دوای نانخواردنی ئێوارە (ئەریکسۆن) لە کاتێکدا چاودێری دەکرد، هیچ کەسێک شوێن پێی هەڵنەگرێت، سەردانی کارمەندانی سیخوڕیی ئەمەریکای کرد، ئەو تەلارەی ئیدارەی سیخوڕیی (باڵوێزی ئەمەریکا) ی تێدابوو. چوار نهۆم بوو. ئەریکسۆن بە پلیکانەکانی تەلارەکەدا سەرکەوت، چووە نهۆمی سەرەوە و لە بەردەم دەرگایەک وەستا، دوای ئەوەی سێ جار لە دەرگاکەی دا، چووە ژوورەوە.

مازۆر برادلی (پاشکۆی سەبازیی ئەمەریکا ل) لە سوید و سەرهەنگ مانسفێڵد لە ژوورەکە بوون و هەرکە بینیان، بەرزەپێ هەستان و بەتوندی دەستیان گوشی و

(ئەریکسۆن) گۆزوگومبەت باسی بەسەرهاتی خۆیکرد، کە قسەکانی تەواوبوو، ماژۆر (برادلی) وتی: لەڕاستیدا تۆ بە شێوەیەکی باش ئەرکەکەی خۆت ڕاپەڕاندووە، ئێمە جگە لەوە چاوەڕوانی هیچ شتێکی دیکە نەبووین لە تۆ.

(مانسفیلد) بەخۆشحاڵییەوە وتی: من بە نۆرەی خۆم پیرۆزباییت لێدەکەم.

(ئەریکسۆن) قاقا پێکەنی و وتی: دەزانی هاوسەر و هاوڕێکەم پرنس کارڵیش، هەمیشە ئەو ڕستەیە دووبارەدەکەنەوە، بەڵام من خۆم بە شایانی ئەوە نازانم، کە ببمە جێگەی ئافەرین.

(برادلی) و مانسفیلد بە دیقەتەوە گوێیان لە قسەکانی ئەو پیاوە دەگرت، بە دەگمەن قسەیان پێ دەبڕی تا پرسیاربکەن بۆئەوەی بابەتەکەیان بۆ ڕوونبکاتەوە.

ئەریکسۆن نەخشەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و لە کاتێکدا یەک یەک شوێنی پاڵاوگە نەوتییەکانی ئەڵمانیای نیشاندەدان، وتی: بە شێوەیەک کە تێبینی دەکەن، ئەڵمانیا بیرەنەوتی زۆرە و پاڵاوگەی جۆراوجۆرەکانی بەردەوام کاردەکەن، ئەگەر فڕۆکەکان پەلاماری ئەو پاڵاوگانە بدەن، کە نەوتی خاو دەپاڵێوون و وێرانیان بکەن، ئەو وڵاتە تووشی قەیرانی سووتەمەنی دەبێت، نەک تەنیا دەبابەکانیان، بەڵکو فڕۆکەکانیشیان لەکاردەکەون،شکستی ئەڵمانیا خێرا و بەم نزیکانە دەبێت.

سەرهەنگ مانسفیڵد سەری ڕاوەشاند و وتی: بەڵێ، من بەتەواوی ئەوە دەزانم.

(برادلی) چووەتە ناو قسەکەوە و وتوویەتی: جەنابی ئەریکسۆن لەو ناوەدا تاکە شتێک کە ماوە سەرفکردنەوەی خەرجەکانتە، تکایە لیستی خەرجیەکانتمان پێ بدە، هەڵبەتە پێویست بەوە ناکات یەک یەک هەموویان بنووسیت، تەنیا کۆی ئەو پارانەی کە خەرجتکردووە یاداشت بکە تا یەکسەر پێت بدەینەوە.

ئەریکسۆن پێکەنی و وتی: بیرم لەو بابەتە نەکردووەتەوە، لە داهاتوودا کە ئێوەم بینی، پاکتاوی ئەژمارەکەم دەکەم.

مانسفیڵد پیاوانە وتی: ئەریک، من دڵنیام تۆ دەزانیت فڕۆکەکانی بەریتانیا بێسنوور نین و پێویستە ڕێک ئامانجێکی دیاریکراو بۆردومان بکەن.

- بێگومان!

- بەڵێ، ئێمە هەموو ئەو زانیارییەی تۆ وەرتگرتووە، دەخەینە بەردەستیان و هەواڵ بە باڵوێزخانەی بەریتانیا دەدەین، سبەی شەو دەزگای ئەنتیلجیتسی بەریتانیا پێویستە ئەو زانیارییە وەربگرێت، بەڵام لەوانەیە پەلاماردان و وێرانکردنی پاڵاوگەکان کەمێک دوابخەن.

- بەڵێ دەزانم، ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە.

کاتێک ئەریکسۆن لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا هاتەدەرەوە،

سەعات دوو و نیووی شەو بوو، بەپێ بەرەوماڵ لە تاریکیدا هەنگاوی نا و بە درێژایی ڕێگاکە بیری دەکردەوە، تەنیا کاتێک مێشکی ئاسوودە و هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشا، کە لە ماڵەوە لەسەر تەختەخەوەکەی پاڵکەوتبوو، بۆنی زوڵفی (ئینگرید)ی دەکرد.

**بڕیار**

ڕاپۆرتەکەی ئەریکسۆن لەبارەی بارودۆخی ناوخۆی ئەڵمانیا، لە ماوەی کەمتر لە سێ ڕۆژ گەیشتە دەزگای سیخوڕیی بەریتانیا، یەکسەر جێبەجێکرا و لە چەند نوسخەیەکدا کۆپیکرا و بۆ چەندین فەرمانگەی جیاجیا نێردرا، لەوانە نوسخەیەکیان بۆ بەشی بۆردومانی هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا نێردرا. بەرپرسانی هێزە ئاسمانییەکان بەدیقەتەوە چاویان بە نەخشەی پاڵاوگەکاندا گێڕا و سەرەنجام بڕیاردرا، کە بەریتانییەکان چاوەڕوان بوون لەگەڵ هاتنی زستانی ساڵی 1941 ئەڵمانیا خۆی لەخۆیدا شکست دێنێت، تەسلیم دەبێت، بەڵام ئەگەر پێشبینیەکەیان ڕاست دەرنەچێت، لەو کاتەدا بە تۆپە دوورهاوێژەکانی، هێزەکانی ئەو وڵاتە تاروماردەکەن.

ئەریکسۆن و هاوسەرەکەی ئینگرید و پرنس کارڵ، هەروەک بە دڵی خۆیان درێژەیان بە نازیخوازی دەدا،

تێکرای هاوڕێیان و ڕەفیقەکانی ئەڵمانیا و تەواوی سویدییەکان لایەنگرانی نازیزمیان پێکدەهێنا.

شەوێک کە ئەریکسۆن لە میوانداریییەک دەگەڕایەوە، بە هاوسەرەکەی وت من و کارڵ نیوەڕۆی ئەمڕۆ چووینە هۆتێلێک نانی نیوەڕۆ بخۆین، لەگەڵ چووینە ناو هۆڵەکەوە، نیوەی زیاتری مشتەرییەکان لە جێگەکانی خۆیان هەستان و ڕۆیشتن.

ئینگرید پێکەنی و وتی: دەی سەرەنجام ڕۆژێک تێدەگەن، کە تۆ نازی نیت و تەنیا ڕۆڵت دەگێڕا.

- لەوانەیە لەبەرئەوەش بێت من زۆر گرنگی بەو مەسەلەیە نادەم، دەزانم بەتەواوی لەو تۆمەتە پاکم، کە ئەوان پێی تاوانباریان کردووم.

- دەزانم ئێمەش هەر بە هەمان شێوەین. کاتێک هاوڕێیانی سویدی بەتەنیشتمدا تێدەپەڕن، ڕوویان وەردەگێڕن. ئێستا هەموویان ئێمە بە خائین و خۆفرۆشمان دەزانن. تەنیا هیوادارم کە کار و ماندووبوونەکانت بەئەنجام بگات، زووتر ڕاستییەکە ئاشکرابێت.

***

ئەریکسۆن و پرنس کارڵ دەیانزانی، کە هەرچەند مامەڵەی بازرگانیی هەردووولات کراوەتەوە، هەنگاوی گەورەیان لەو ڕێگەیەوە هەڵهێناوە، خزمەتێکی گەورەشیان بە هاوپەیمانان

کردووه. ئەو نەوتە خاوەی لە ئەڵمانیاوە هاوردەدەکرێت، لە پاڵاوگەکانی سوید دەپاڵێورا و مادده دەرهێنراوەکانی لەوانە بەنزینی ئۆتۆمبێل و فڕۆکە ڕادەستی بەریتانییەکان دەکران، ئەڵمانییەکان بە پاپۆڕە گەورەکانی خۆیان، ئۆتۆمبێل و بۆڵبەرینی سویدی و مەکینەی ئۆتۆمبێلیان دەبرد.

***

هەر لەو ڕۆژانەدا بوو، کە کارەساتی پرل هاربۆر ڕوویدا. لەمێژبوو ئەریکسۆن چاوەڕوان بوو ئەمەریکا بەشداری شەڕبکات، بەڵام نەک بەو شێوەیە، چونکە ئەو قوربانییانەی ئەمەریکا پێش چوونەڕیزی هاوپەیمانان دای، لەوە زیاتربوو، کە چاوەڕواندەکرا.

ئەریکسۆن هەرچەند کە لە شاری برۆکلینی ئەمەریکا لەدایکبووە، زیاتر لە سی ساڵ لەو شارەدا ژیاوە، پاشان بووەتە هاووڵاتیی سویدی، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتاش خۆی بە ئەمەریکی دەزانێت.

کاتێک بەندەری (پول)ی ئەمەریکا بۆردومانکرا، ئەریکسۆن هیوابڕاو بوو، بەردەوام لە خۆی دەپرسی: ڕۆڵی لەبەرامبەر ئەڵمانییەکان چییە و دەبێت چ کارێک بکات. هەرچەند ئەڵمانیا، بردنە شەڕەوەی ئەمەریکای بە هەڵەیەکی سیاسی ئەژماردەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا، کەشتییە جەنگییەکانی ژاپۆن پێشەڕەویان دەکرد.

دوای چەند ڕۆژێک، کاتێک ئەریکسۆن لە میواندارییەکدا، چاوی کەوت بە (کۆرتز)، نوێنەری دەزگای گشتاپۆ و (ئۆلریخ) پاشکۆی بازرگانیی ئەڵمانیا. بابەتی پەلاماردانی ژاپۆنییەکانی بۆ (پرل هاربۆر)ی ئەمەریکا هێنایە بەرباس و وتی: دڵی بۆ ئەو ئەمەریکییانە دەسووتێت لە ژاپۆنن. هەموویان دەبنە قوربانیی سیاسەتی نادروستی ڕۆزفلێت.

ئەگەر ئەمەریکا ناڕاستەوخۆ هاوکاریی بەریتانیای نەدەکرد، هەرگیز ئەو کارەساتە ڕووی نەدەدا. پێموایە ژاپۆنییەکان زانیویانە ئەمەریکا درەنگ یان زوو، دەچێتە شەڕەوە، هەر لەبەرئەوە دەستپێشخەری کردووە، بەندەری (پرل)یان تیکوپێک داوە.

(کۆرتز) سەری لەقاند و وتی: لەوانەیە بەو شێوەیە بێت، بەڵام ئەمەریکا ئەوەندی توانیبێتی چالاکی لە دژمان ئەنجامدەدات و سەرەنجام دەبووایە درەنگ، یان زوو تۆڵەمان لێدەکردەوە.

- بەڵێ، هەڵەکە لە خودی ڕۆزفلت بوو.

دایکوباوکی ئەریکسۆن لە ژیاندا نەمابوون، بەڵام براکەی هێشتاش لە ئەمەریکا دەژیا و بیستبووی (ئەریک) بووەتە نازییەکی توندڕەو، بۆیە نامەیەکی بۆ ناردبوو و داوای لێکردبوو، کە نیازی خۆی بگۆڕێت، بەڵام ئەریکسۆن لە وەڵامدا نووسیی: بۆ خۆی باش دەزانێت چ کارێک دەکات و پێویستی بە ئامۆژگاریکردنی هیچ کەس نییە.

سالانێکه ئەریکسۆن لە سەردانیکردنی براکەی بێبەریکراوە، ئارەزووی نەدەکرد دوای ئەو هەموو ماوە دوورودرێــژە، دڵی بئێشێنێت و هەربۆیە بڕیاریدا، کە مۆڵەت لە (برادلی) و مانسفیڵد وەربگرێت و ڕاستییەکانی بۆ بنووسێت، بەڵام دوایی گوێی بەو بڕیارەش نەدا، ئەو، ئینگرید، هاوڕێکەی پرنس کارڵ، تەنیا و بێ هاوڕێ ماوەتەوە، هەموو ناسیاوەکانی لێی دڕدۆنگ بوون، بەڵام تەنیا هاوڕێیەکی ڕاستەقینەی هەبوو، کە هێشتاش بە وەفاداری بۆیان ماوەتەوە، ئاگای لە مەرام و خەونەکانی ئەوان نەبوو، ئەو کەسە کەسێکی دیکە نەبوو، جگە لە (پاول والنبێرگ)، هەمان پیاوی جوولەکە، کە جارێک (ئەریکسۆن) بە ئامادەبوونی (ئۆلریخ) و (کۆرتز) سەردانی کرد. (والنبێرگ) بە ڕاستییەکانی زانیوە و دەیزانی نابێت فریوی ڕواڵەتی بخوات.

***

لە سەرەتای حوزەیرانی ساڵی 1942، (ئەریکسۆن) بڕیاریدا سەفەرێکی دیکە بۆ ئەڵمانیا بکات، ئەمجارەیان دەیویست کارێک بکات، کە ئاگای لە کارەکانی ئەو وڵاتە بێت، بەڵام نەیدەزانی ئاخۆ بە چوونەناوەوەی ئەمەریکا بۆ شەڕ، مۆڵەتی سەفەرکردنی بۆ ئەو وڵاتەی پێدەدرێت، یان نا. بەو بڕیارەوە سەردانی (ئۆلریخ)ی کرد، بەڵام (ئۆلریخ)

نەک تەنیا بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی نەکرد، بەڵکو تەنانەت سەلامیشی نەستاندەوە، (ئەریکسۆن) تێگەیشت، کە ئەو پیاوە لێی بەگومانە، ئەگەر دەسەڵاتی پرنس کارڵ و (کۆرتز) نەبوو، لەوانەبوو کارێکی گەورەتر بکات.

**مەترسی**

دووەمین سەفەری ئەریکسۆن بۆ ئەڵمانیا تەنیا پێنج ڕۆژی خایاند، لەو ماوە کەمەدا توانیی زانیاریی گشتگیرتری لەبارەی پاڵاوگەکان دەستبکەوێت، دوای تێپەڕبوونی پێنج ڕۆژ، جارێکی دیکە دووبارە بۆ سوید گەڕایەوە.

ئەریکسۆن دوای ئەوە بەردەوام هاموشۆی ئەڵمانیای دەکرد، زانیاریی وردی لە هاوکارە ئەڵمانییەکانی خۆی، بەدەست دەهێنا و لەو سەفەرانەدا توانیی سەردانی پاڵاوگەکانی نەوتی خاوی هبل، هانۆڤەر، هامبۆرگ، لودویک شافن، شتوت گارت و (مرسبۆرگ لیۆنا) بکات.

ئەریکسۆن زۆر ئارەزووی دەکرد سەردانی ناوچەی چاڵەنەوتەکانی (پلویستی) بکات، کە نەوتی پاک و سرووشتی، لەوێ بەدەست دەهات و سەرەنجامیش توانیی ئەو کارە بکات.

پرنس کارڵ چەندین جار لەگەڵ ئەریکسۆن سەفەری بۆ بەرلین کرد، هۆکارەکەی ئەوەبوو، کە یەکەم، ئەریکسۆن

دەیتوانی بە هاوکاریی پرنس کارڵ، زیاتر ببێت ئاشنای باروون نۆرد هۆفی سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی گشتاپۆ و تەواوی سەرۆکان و پیاوانی ئەو وڵاتە، دووەم، پرنس کارڵ، واتە ئەندامی بنەماڵەی خانەدانی سوید، لە سەفەرەکانی خۆی، ڕۆڵی هاوڕێیەکی فیدایی هیتلەری هەبوو، گومانی گریمانەیی ئەڵمانیای سەبارەت بە ئەو ڕەواندەوە.

(ئینگرید) پێشنیازیکرد ئەویش لەگەڵیاندا بچێت، بەڵام ئەریکسۆن نەیهێشت، چونکە لەوە دەترسا هاوکارێکی لە ئەڵمانیا، پەردە لەسەر بابەتەکە هەڵبداتەوە و ئاشکرای بکات و سزای ئەو کارە هەرمردن بوو، بە هاوسەرەکەی وت:

- بەڕاستی من ناتوانم متمانە بە هاوکارەکانم بکەم، چونکە هەموودەمێک ئەگەری ئەوە هەیە ئاشکرام بکەن. تا ئێستا زانیارییەکانم بەرهەمیان نەبووە، نەبوونە جێگەی سوودوەرگرتنی ئەمەریکییەکان و ئەگەر ئەڵمانییەکان ماهیەتی منیان بۆ دەربکەوێت، تەواوی نەخشەی هاوپەیمانان دەبێتە بڵقی سەر ئاو.

***

جاری دووەم کە ئەریکسۆن لەگەڵ پرنس کارڵ بۆ ئەڵمانیا ڕۆیشت، ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو و سەیر ڕوویدا، بەو مانایەی کە پرنس کارڵ لەلایەن پۆلیسی ئەو وڵاتەوە دەستگیرکرا.

ئەو کاتە ئەریکسۆن لە بەندەری هامبۆرگ بوو، بۆ بەیانی کە گەڕایەوە بەرلین، یەکسەر چوو بۆ سەردانی باروون نور هۆدفی سەرۆکی دەزگای گشتاپۆ و لەوێ بوو، کە زانی پرنس کارڵ دەستگیرکراوە، بە بیستنی ئەو قسەیە ڕاچڵەکی و بە هەردوو چاوی مۆڵەقەوە پرسیی: بۆچی ئەو کارەت کردووە؟

باروون نۆرد هۆف وەڵامیدایەوە: پرنس کارڵ لەبەرئەوە دەستگیرکراوە، چونکە گوێ لە ڕادیۆی ئەمەریکا دەگرێت.

(ئەریکسۆن) کە دەیزانی لەو وڵاتە گوێگرتن لە ڕادیۆ، واتە وەرگرتنی دەزگای نێرەری ئەمەریکا و بەریتانیا یاساغە. بە خودی خۆی بیری کردەوە، کە نەکات باروون نۆردهۆف خۆهەڵدەکێشێت و وتی: بەڵام یاسا ڕێگری لە ئێوە دەکات، کە لە دەستدرێژی کردنە سەر بێگانان، بەتایبەت کەسانی وەک پرنس کارڵ خۆبەدوور بگریت و بێجگە لەمانە خۆ تۆ باش ئاگات لەوەیە، کە ئێمە لە شاری ستۆکهۆڵم خومان گرتووە بە گوێگرتن لە هەواڵەکانی ڕادیۆی ئەمەریکا.

- دەزانــم، بــەڵام نابێت ئـەو خـاڵـەت لەبیربچێت، کە دانیشتووانی شاری ڕۆما، ناودەنێن ڕۆمایی و هەرکەسێک لە هەروڵاتێک، پێویستە گوێڕایەڵی یاسای ئەو وڵاتە بێت.

- بەڵام بێگومان تۆ...

باروون نۆردهۆف سەری لەقاند و وتی: نەخێر ئەریکسۆنی

خۆشـەویـسـت. مـن نـاتـوانـم لـەوبـارەیـەوە بـڕیـاربـدەم، ئـازادکـردنـی پرنس کـارڵ پەیوەندی بە دەسـەڵاتـدارانـی سەرووترەوە هەیە.

ئەریکسۆن بێ وەستان تەلەفۆنی کرد بۆ مارشاڵ (هرمان گۆرینگ)، کە لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی پرنس کارڵ ئەژماردەکرا، توانیی پەیوەندی بە خودی ئەوەوە بکات.

(گۆرینگ) کە لە دەستگیرکردنی ئەندامێکی بنەماڵەی خانەدانی سوید نیگەران ببوو، یەکسەر ئازادکردنی پرنس کارڵی ڕێکخست و کاتێک ئەو پیاوە ئازادکرا، (ئەریکسۆن) پێی وت: زۆر نیگەران ببووم.

- داوای لێبووردن دەکەم لەبیرم چوبوو، کە نابێت لێرە گوی لە ڕادیۆی ئەمەریکا بگریت.

***

ئەریکسۆن و پرنس کارڵ جارێکی دیکە سەفەریان بۆ بەرلین کرد. بارون نورد هۆفی سەرۆکی دەزگای گشتاپۆ، بۆ نانخواردنی ئێوارە میوانداری کردن، شەوێکی دڵخۆشکەرەیان لەوێ بەسەربرد. (هاینریخ هیملەر)، سەرۆکی گشتیی دەزگای گشتاپۆ هاتە ناو هۆڵەکەوە و بارون نوردهۆف بە ئامادەبووانی ناساند.

ئەریکسۆن چەندین جار لە دوورەوە (هیملەر)ی دیتووە، بەڵام نەیتوانیبوو لە نزیکەوە بیبینێت، هیملەر

پیاوێکی کورتەباڵا، کز، ڕەقەڵە و کاتێک ئامادەبووانی پێدەناسێندران، ئەریکسۆن بۆی چەماوەتەوە، بزەی هێنایە سەر لێوان. بزەی پیاوەکە، نە بەهۆی یەکترناسینەوە بوو، نە لەبەر خۆشحاڵبوون، بەڵکو بەوە پێدەکەنی کە خۆی لە بەرامبەر (هیملەر)، زەبەلاحی بەتوانا دەبینی و دڵنیابوو، کە دەتوانێت بە دەستێک ملی ئەو کەسە بگرێت و بەرەو ئاسمان هەڵیبرێت، وەک زرکەتاڵ بە زەویدا بیکێشێت.

لەو میوانداریيە یەکێک لە جەنەراڵەکان، ناسراو بە جەنەراڵ (هایدریخ) لە سەرەتای هۆڵەکەیە و قسەیەکی کرد، دوای دەربڕینی خۆشحاڵی لە ئامادەبوونی کەسایەتیی پایەبەرزی وەک (پرنس کارڵ)، دەستیکرد بە تاریفکردنی هیتلەر و باسکردنی ئەندێشەکانی.

ئەو پیاوە تازە دەستی بە قسەکردن کردووە، وردە وردە دەنگی بەرزدەبووەوە و نەفرەتی لە دووژمنانی ڕایش دەکرد، کە لەناکاو دەرگەی هۆڵەکە کرایەوە، گارسۆنەکان بە قاپی گەورەی پڕ لە قاشەشووتی، هاتنەژوورەوە. جەنەراڵ (هایدنبێرخ) بە دیتنی ئەو قاشەشووتیانە، وەک ئاوێک کە بە ئاگردا کرابێت، کپبوو، زەردهەڵگەڕا و دوای ساتێک بێدەنگی، بەرەو کورسییەک چوو، لەسەری دانیشت و لە فڵقوهوڕی گریانی دا.

وورتــەورت لـەنـاو ئـامـادەبـووان پـەیدابـوو، (هیملەر) بە بـەژن و بـاڵا کورتەبنە و وردەکـەی چووەپێش و بە قاییم پرسیی: جەنەراڵ بۆچی دەگریت ؟ ئایا قسەکانت ئـەوەنـدە کـاریگـەربـوون، کـە خۆشت خستە گریانەوە؟ جەنەراڵ بەهەنیسکدانەوە سەری بڵندکرد و ئاماژەی بە قاشەشووتییەکان کـرد، بەمینگەمنگەوە وتـی: شـووتی، شووتی.

ئەو گارسۆنانەی قاپی میوەکانیان هێنابووە ژوورەوە، کە بینیان جەنەراڵ ئاماژە بۆلای ئەوان دەکات، بە ترس و لەرزەوە تەماشای یەکتریان کرد،لەشیان کەوتە لەرزەوە و یەکێکیان خاچێکی لەسەر سینگی کێشا، بەو خەیاڵەی کە هەڵەیەکی کردووە، بەو نزیکانە لەسێدارە دەدرێت، چووە سەر چۆکان.

(هیملەر) بە دوو چاوی مۆلەقەوە پرسیی: ئایا بۆمبیان لەناو شووتییەکان داناوە؟

جەنەراڵ هایدنبێرخ سەری بە ئاماژەی نەخێر ڕاوەشاند و وتی: نەخێر.

- کەوایە بۆچی دەگریت؟ جەنەراڵ بەڕاستی پێمبڵێ، ئایا ئارەزووت لە شووتییە؟ ئەگەر ئارەزووت لێیە، بەیانی هەزار شووتی بە شەرتی چەقۆت بۆ دەنێرم، ئەوە گریانی پێناوێت.

(هیملەر) بەهێواشی ئەو قسەیەی کرد، بەڵام تەواوی ئەوانەی لە دەورووبەری وەستابوون، بیستیان و پێکەنین و لەبەرئەوەی ژمارەیەک دەیانزانی جەنەراڵ بۆچی دەگریت، بۆیە بەخوێنساردییەوە وەستاون و چاوەڕوانی ئاکامی کارەکە بوون.

بارون نورد هۆف لە کاتێکدا ئاماژەی بە گارسۆنەکان دەکرد، شووتییەکان بەرنە دەرەوە، چوەپێش و ڕوو لە (هیملەر) وتی: قوربان جەنەراڵ لەبەرئەوە دەگری، کە گرێی دەروونی هەیە و هەستیارە بەرامبەر بە شووتی، بە بینینی ئەو میوەبەلەزەتە دەگرییێت .

ڕاستییەکەی هەر ئەوەبوو، کە (نوردهۆف) وتی و گرێ دەروونییەکەی ئەو جەنەراڵە لەو سەردەمەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە هاوکارەکانی ژمارەیەک جوولەکەیان لە کاتی شووتیخواردن کوشتبوو، لەو ڕۆژە بەدواوە ئەو کە زۆر دلڕەق بوو، لە هەر کوێیەک شووتی دەبینی، لە فلقوهوڕی گریانی دەدا. پاشان ئەریکسۆن ئەو بابەتەی قۆستەوە و وەک ببووە هاوڕێی ئەو جەنەراڵە، بۆیە شەوێک کاتێک، کە جەنەراڵ دەیەویست وتاربدات، وتەیەکی شۆڕشگێڕی پێشکەش بکات، بە بڕیاری پێشوەختی ئەریکسۆن گارسۆنەکان بە قاپی پڕ لە شووتی قاشنەکراو هاتنەناو هۆڵەکەوە و جەنەراڵ بە نیوەچڵی وازی لە وتەکەی هێنا،

نەیتوانی لە بەردەم پلەداران و بەرپرسانی وڵات، بە خراپە باسی ئەمەریکا بکات.

ئەو شەوە لە ماڵی بارون نوردهۆف، دوای نیوسەعات، (هیملەر) میوانداررییەکەی بەجێهێشتوە و مالاوایی لە هەمووان کردووە، دوای ڕۆیشتنی ئەو پیاوە، ئامادەبووان لە پڕمەی پێکەنینیان داوە و قسە و سەمایان کردووە، کۆڕەکەیان جەزمە و شڵەژانی تێکەوتووە. چەند خاتوونێک کە لەوێ ئامادەبوون، بەردەوام بە بەردەم و چاوی میوانانی سویدی دا تێدەپەڕین، یەکێکیان کە قژێکی خورمایی هەبوو، سەرنجی (ئەریکسۆن)ی ڕاکێشا و کاتێک میوانداررییەکە تەواوبووە، ژنەی قژ خورمایی پێشنیازی بۆ ئەریکسۆن کردووە، شەوی لەگەڵ بەسەرببات. پرنس کارلیش ژنێکی بالابەرز و قژ زەردی، کە لە بنەماڵە دیارەکانی ئەڵمانیا ئەژماردەکرا، پەیداکردووە، گەرمەی قسەکردنی بوو لە گەڵیدا و دوو هاوڕێ سویدییەکە بۆ گەیاندنەوەی خاتوونەکان بۆ ماڵەوەیان، لە یەکتری جیابوونەوە.

(ئەریکسۆن) تەواو دڵنیابوو ئەو ژنە قژخورماییە سەر بە گشتاپۆیە، کە گەیاندییە ماڵەوە، ئەو ژنە تکای لێکرد شەو بەیەکەوە بەسەربەرن. بیانووهێنانەوەی ئەریکسۆن قەناعەتی بە ژنەی نەکرد و بردییە ژوورەوە، فەرمووی باڕی ماڵەوەی کرد، مژولی تێکەڵکردنی چەندجۆر مەشرووب

بوو لە دوو پەرداخ دا. (ئەریکسۆن) دوای خواردنەوەی چەند پێکێک ویسکی، خۆی سەرخۆش نیشانداوە، باسی بەسەرهاتی خۆی کردووە لە خۆرهەڵاتی دوور و لێکدا لێکدا مەشرووبی بۆ ئەو ژنە تێدەکرد، بە ڕاددەیەک لەو کارەدا زیادەڕەوی کرد، ژنەی قژخورمایی لە مەستیان خۆی بەپێوە پێنەگیراوە، کەوتووەتە سەر زەوی، ئەریکسۆن نێوچاوانی ماچکرد و بۆ هۆتێلەکەی خۆی گەڕایەوە.

پرنس کارڵ و ئەریکسۆن هەردووک لە ژوورێکدا بوون، کاتێک ئەریکسۆن چووە ژوورەکەیەوە، هەستیکرد کە پرنس کارڵ پێش ئەو گەیشتووەتەوە، لەسەر تەختە خەوەکەی پاڵکەوتووە، بەڵام هێشتا نەخەوتووە. هەرچەند هەردووکیان بەدیقەتەوە گۆشەکانی ژوورەکەیان پشکنیوە و ئەو شوێنەیان نەدۆزیبووەوە، کە لەوانەبوو مایکرۆفۆنی تێدا دانرابێت، لەگەڵ ئەوەشدا، هەمیشە بەچرپەوە قسەیان دەکرد.

پرنس کارڵ دەمی بردووەتە بن گوێی ئەریکسۆن و بەچرپەوە وتی: من تا بەردەم دەرگا هاوڕێکەی خۆمم بەڕێکرد، بەڵام نەچوومە ژوورەوە، ئەرێ تۆ چیت لەو ژنەی کرد؟

ئەریکسۆن پێکەنی و وەڵامی دایەوە: من ئەو سیخوڕەی گشتاپۆم سەرخۆشکرد، خۆم ڕزگار کرد، بەجێمهێشت تا بەئاسوودەیی بخەوێت.

***

بۆ بەیانی زووی ڕۆژی داهاتوو، زەنگی تەلەفۆن لێیدا و ئەریکسۆن گووشییەکەی هەڵگرت و وتی: ئەلۆ و فەرموو.

– جەنابی ئەریکسۆن؟

– بەڵێ.

– من سکرتێری پایەدار بارون نۆرد هۆفم، تکایە سەعات یازدە سەردانی فەرمانگەی گشتاپۆ بکەن.

– زۆر باشە بەسەرچاو.

لەگەڵ ئەوەی ئەریکسۆن لە نووسینگەی بارون نۆرد هۆف وەژوورکەوت، سەرۆکی دەزگای گشتاپۆ گۆزوگومبەت: چەند پرسیارێکی لەبارەی ژیانی ڕابردووی لێکردووە کە پێشتر چ ئیشێکی کردووە، لە ساڵی 1916 لەکوێ ژیاوە، ساڵەکانی 1918 و 1921 لەکوێ بووە و تەمەن و ناو و ناوی خێزان و مێژوو، شوێنی لەدایکبوونی باوانی کوێیە و چییە و براکەی لەکوێ دەژیت؟

(ئەریکسۆن) وەڵامی تەواوی پرسیارەکانی ئەو ژنەی دایەوە، هەروەڵامێک کە گۆی دەکرد، بارون نۆرد هۆف دەستبەجێ لەسەر کاغەز دەینووسی و سەرەنجام وتی: تەواوی قسەکانت ڕاستن جەنابی ئەریکسۆن. تۆ ڕاستییەکانت وتووە و من سوپاست دەکەم.

(ئەریکسۆن) زانیی ئەوان تەواوی ژیانی ئەو دەزانن، چونکە بارون (نوردهۆف) لە هەندێک لایەنەوە، کە بیری

چوبووەوە بڵێت بۆ نموونە فلان ڕۆژ و مانگ لەکوێ بووە و چ ئیشێکی کردووە؟ بیری هێنایەوە و پاشان وتی: قوربان دەبینیت دەزگاکەمان چەند ڕێکوپێکە؟ ئێمە تەواوی وردەکاریی ژیانی تۆ دەزانین.

ئەریکسۆن لە خۆی دەپرسی، کە دەزگای گشتاپۆ چۆن توانیویەتی ئەو هەموو زانیارییە دەستەبەربکات. ئایا ئەوان بە سەرفکردنی پارەیەکی زۆر لێکۆڵینەوەکەیان ئەنجامداوە؟ لە کاتی ئەرێنیبوونی وەڵامی ئەو پرسیارە، هیچ گومانێکی تێدا نەبوو ئەڵمانییەکان گومانیان لێی هەبووە، ئەوەی ئەریکسۆن تێی نەگەیشت ئەوەبوو، کە کارمەندێکی گشتاپۆ، بە گەڕانەوە بۆ نووسینگەی ئەرشیفی کۆمپانیای نەوتی تەکساس کە ئەریکسۆن تێیدا بەشداربوو، ئەدرەسی تەواوی ئەو خانوانەی بەدەستهێناوە، کە ئەریکسۆن گۆڕیبوونی، پاشان بە گەڕانەوە بۆ ئەو ناوونیشانانە توانیبووی دۆسیێکەی تەواوبکات.

**ئەڵقەی گەمارۆ**

دوازدەی حوزەیرانی ساڵی 1942، ڕۆژی پیرۆز و شادمانی بوو، بۆ ئەریکسۆن و هاوسەرەکەی و پرنس کارڵ، چونکە لەو ڕۆژەدا، ڕادیۆ ڕایگەیاند هاوپەیمانان پاڵاوگەیەکی دوژمنیان بۆردومان کردووە، لە یەکێک لە

بنکەکانی میسر، فڕۆکەکانی ئەمەریکا پاڵاوگەی نەوتی خاوی (پلویستی) لە (ڕۆمانیا) تێکوپێکداوە، ئەوانە ئەو ناوچانەبوون، کە (ئەریکسۆن) لە ڕاپۆرتەکەی خۆی ناوی هێناوە، ڕێک ناوونیشانەکەی دابوو.

لەو پەلامارە ئاسمانییەدا بۆ سەر پاڵاوگەکان، زیانێکی زۆر بە نەوت نەکەوتبوو، (ئەریکسۆن) هیوای وابوو، کە لە پەلامارەکانی داهاتوو، ئەو کارە بەسەرکەوتوویی ئەنجامبدرێت. (ئەریکسۆن) لەو ساڵەدا، بەردەوام دوای سەرکێشی بە کاری نەوتی ئەو کۆمپانیایانەی، کە گرێبەستی لەگەڵ بەستبوون، بۆ ئەڵمانیا سەفەری دەکرد و لە هاوکارانی خۆی (واتە بەڕێوەبەرانی پاڵاوگەکان) زانیاریی زیاتری دەستەبەردەکرد، ناوونیشانی پاڵاوگە نەوتییەکان و ئەو پاڵاوگانەی دەپرسی، کە تازە دروستکرابوون و دەگەڕایەوە بۆ ستۆکهۆڵم، زانیارییەکانی خۆی، دەگەیاندە ماژۆر برادلی و سەرهەنگ مانسفیڵد و ئەوانیش بۆ باڵوێزخانەی گەورەی بەریتانیایان دەنارد، تا بەپێی هەواڵی ڕەمزی، بۆ دەزگای ئەنتلجیتسی بەریتانیایان دەبرد.

شوێنی چاوپێکەوتنی ئەریکسۆن بە ماژۆر برادلی، تەلارێکی چۆڵ و دوورەدەست، پێویسی بە نۆژەنکردنەوە بوو. لەو کاتەدا هێزە ئاسمانییەکان و بۆردومانی هاوپەیمانان ئەوەندە بەهێزنەبوو (هەڵبەتە لە باڵادەستی

بە پێوانە بە هێزی ئاسمانی و بۆردومانی ئەڵمانیا)، نەیاندەتوانی ڕاستەوخۆ شاڵاو بەرنە سەر ناوکی ناوەندی پاڵاوگەگەورەکان و بۆردومانیان بکەن، چونکە ڕادارە تایبەتییەکانی ئەڵمانیا، نزیکبوونەوەی فڕکەکانیان نیشاندەدا، چەکە دژەئاسمانییەکان و فڕۆکەکانی ئەڵمانیا هەڵدەستان و هەموویانیان تێکدەشاندن.

لە پاییزی 1941، واتە کاتێک ئەریکسۆن بۆ یەکەمین جار سەفەری بۆ ئەڵمانیا کردبوو، پیشەسازیی دروستکردنی فڕۆکە لە ئەڵمانیا گەیشتبووە لووتکە، لەو ساڵەدا یەکەکانی سوپای ئەڵمانیا تا ڕاددەیەک ئەورووپای داگیرکردووە، دەیانتوانی هەر شوێنێک کە بیانەوێت، سویدیش بکەنە هی خۆیان. هێشتا بەریتانیا هیچ لاوازییەکی خۆی دەرنەخستبوو، بەڵام ڕووسیا لە بەرامبەر پەلامارە یەک لەدوای یەکەکانی ئەڵمانیا، وردە وردە بەچۆکدا دەهات.

سوپای ئەڵمانیا لە زستانی ئەو ساڵەدا، توانیی مۆسکۆ و لینینگراد داگیربکات و لە بەرامبەردا، ڕووسیا دەستیکرد بە دژەپەلاماری وردووهاڕکەر. خەڵکی ئەڵمانیا وردە وردە لە ئەنجامی شەڕەکە نائومێددەبوون، نەک لەبەرئەوەی سوپاکەیان پێشڕەوییەکی ئەوتۆیان نیشان نەدەدا و لە شەڕگەی ڕۆژهەڵات شکستی یەک بەدوای یەکدایان دەخوارد، بەڵام لە ساڵی 1942، جارێکی دیکە

ڕەوتی شەڕەکە گۆڕا، بەو مانایە کە ژاپۆنییەکان هەموو دوورگەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسیان داگیرکرد، لە ئەفەریقیای باکوور، لەشکرەکانی مارشاڵ و ڕۆمێل، لێکدا لێکدا لە پێشکەوتندابوون و زۆر شاریان ڕزگارکردبوو، لە ئەسکەندەریە نزیکببونەوە. لە ڕووسیا، بە مێژووی دەی تشرینی یەکەم 1942، ئەڵمانیا زەربەی کوشندەی لە ڕووسیا وەشاند، سوپای سووری تارومارکرد.

هەڵبەتە ڕووداوێک لە ڕۆژهەڵات ڕوویدابوو، کە دیسانەوە دەکرا هیوادرابیت ڕەوتی شەڕەکە بگۆڕێت. تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن بووەتە ئامانجی پەلامارە ئاسمانییەکان و کەشتییە ژاپۆنییەکان لە دەریای مەرجان خەسارەت و کوژراوێکی زۆریان دابوو. لە تتشرینی دووەمی 1942، سۆڤێتییەکان پەلاماری دیکەیان دەستپێکرد. دوای سەرکەوتنی مارشاڵ مۆنتیگمەری لە شەڕی ئەلعامین، سەربازێکی زۆری ئەمەریکی لە ئەفەریقیای باکوور بە پەڕەشووت دابەزین.

پەلامارەکانی هاوپەیمانان بۆسەر ئەڵمانیا جیددیتر و خێراتر بووە، لە سێی مانگی ئاداری 1942، زیاتر لە هەزار تۆپهاوێژی ئەڵمانی لە ماوەی پەلامارێکی ئاسمانیی زۆر خەست لە ناوچەی (کۆڵن) تێکشکێندران. هامبۆرگ و بەرلین و زۆربەی شارە گەورەکانی ئەڵمانیا، زیانێکی

زۆریان بەرکەوت و ئەریکسۆن لە ڕاپۆرتەکانی خۆیدا، وێڕای نووسینی شوێنی ناوچە نەوتی و تەواوی شوێنە سەربازییەکان بەوردی، بیروڕای خۆیشی لەبارەی شەڕەوە دەردەبڕی و دەیزانی کە ئەڵمانیەکان، بەتاییەت بەرپرسانی باڵا، تووشی ترس و تۆقین بوون.

لە حوزەیرانی ساڵی 1943، لە کۆنفرانسی کازابلانکا، چەرچڵ و ڕۆزفلێت تەسلیمبوونی بێمەرجی ئەڵمانیایان پێشنیاز کرد، ئەریکسۆن کە هەر ئەو ڕۆژانە جارێکی دیکە سەفەری بۆ ئەڵمانیا کردبوو، هەستیکرد دەزگای بانگەشەکردنی (گۆبلز) چەند فراوانە و چۆن مانای تەسلیمبوونی بێمەرجی لێکداوەتەوە، چونکە لە ئەڵمانیا بە شێوەیەک پێشنیازەکەی سەرۆکانی هەردوو دەوڵەتی هاوپەیمانانیان لێکدابووەوە، کە هەمووان پێیانوابوو مەبەستیان لە تەسلیمبوونی بێمەرج، بەردەوامیی شەڕ و سەرکەوتنی نازییەکانە.

(ئەریکسۆن) کە دەیزانی ئەڵمانیا بە پێشنیازەکەی چەرچڵ و ڕۆزفلێت لەبارەی تەسلیمبوونی بێمەرج ڕازی نابێت، هەر ئەوە چاوەڕوان دەکرا، کە هەواڵی تێکوپێکدانی پاڵاوگە نەوتییەکانی ئەو وڵاتە ببیستێت.

پاشماوەکانی سوپای شەشەمی ئەڵمانیا لە شاری ستالینگراد، دوای قوربانیدانێکی قەرەبوونەکراوە

تەسلیمبووە، ئەریکسۆن چاوەڕوانی بیستنی هەواڵی ڕووداوی داهاتوو بوو لە شەڕگەی ڕۆژهەڵات.

هاوپەیمانان توانییان لە مانگی ئادار، سوپاکانی نازی لە کەنداوی (بۆن) تێکبشکێنن، بەدیلیان بگرن و ئاگری شەڕ لە ئەفەریقیا بەیەکجاری دابمرکێننەوە. هێشتا بۆردومانکردنی پاڵاوگەکانی ئەڵمانیا هیچ هەواڵێکان نەبوو، ئەریکسۆن زۆر سەری لەو کارە سوڕدەما

هەرکاتێک (ئەریکسۆن) دەچوو بۆ ئەڵمانیا، هەستی بە مەترسی دەکرد، نیگەران دەبوو، بۆئەوەی خەوی لێ بکەوێت، ڤالیۆمی دەخوارد و هەندێک کات، کە ناچاردەبوو، لەگەڵ غەریبەیەک لە ژووری هۆتێلەکە دابێت، (چونکە هەروەک وترا، لەو رۆژانەدا شوێنی نیشتەجێبوونی زۆر نایاب بووە و موسافیرەکان ناچاردەبوون دوو بەدوو، یان سێ بە سێ لە ژوورێک دابن). ئەریکسۆن لەو کاتانەدا حەبی (بنزدرین)ی دەخوارد کە خەوی لێنەکەوێت، بە نەخەوتوویی بمێنێتەوە، نەوەک لە خەودا وڕێنەبکات و خۆی دەرخات. لە سەردەمی شەڕدا، هەزاران سەرباز و هەزاران تۆپچی و پلەدار هەموویان هیواداربوون، کە بەزوویی ژمارەیان زیادبکات و هاوپەیمانان زیادیانکرد، تا بتوانن لەبەرامبەر هاوپەیمانان بوەستنەوە و خۆڕاگرن.

***

لەکۆتاییدا هاوینی ساڵی 1943، ماندووبوونەکانی ئەریکسۆن بەریان گرت، یەکەمین پەلاماری هاوپەیمانان بۆ سەر پاڵاوگە نەوتییەکانی ئەڵمانیا ئەنجامدرا. لەو ساڵەدا، فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمەریکا هێرشیان کردە سەر پاڵاوگە نەوتییەکانی هامبۆرگ، هانۆڤەر، مارسن بۆرگ و لودویکەشافن بۆردومانکران.

ئەریکسۆن هەرچەند هەواڵی ئەو سەرکەوتنانەی لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێندەوە، هەرگیز لە خۆیدا هەستی بە شانازی نەدەکرد، چونکە بۆ یەکەمین جار هەستیدەکرد، کە سیخوڕ و خیانەتکارێکی گەورەیە، بە مانای فراوانی وشە، بەڵام نەک لەبارەی هاوپەیمانانەوە، بەڵکو دەربارەی ئەڵمانییەکان.

(ئەریکسۆن) لەبەرئەوە بەهۆی خەیانەتکردنی لە ئەڵمانیا خۆی سەرزەنشت دەکرد، چونکە لەوێ ژمارەیەک لە سەرۆک، جەنەراڵ، بەڕێوەبەرەکانی نەوتی خۆشدەویست، ڕۆژێکیشیان بە پرنس کارڵی وت: هەرگیز خۆم لەبەر کارێک کە کردوومە نابەخشم.

❊❊❊

هاوینی ساڵی 1943، جارێکی دیکە پەلاماری دەستەجەمعی فڕۆکەکانی ئەمەریکا بۆ سەر چاڵە نەوتییەکانی ئەڵمانیا ئەنجامدرا، ئەو پەلامارە لە مانگی

ئاب بوو، بە یەکێک لە گرنگترین پەلاماری ئاسمانیی شەڕ ئەژماردەکرێت، چونکە 170 فڕۆکە لەو پەلامارەدا بەشدارییانکرد، ئامانجیشیان پاڵاوگە و چاڵە نەوتییەکان و پاکتاوکردنی خانووەکان بوو. لەو پەلامارەدا تەنیا 54 فڕۆکە بەردرانەوە و 532 فڕۆکەوان و شەڕکەر دیارنەمان، بەڵام هەموو زیانەکان بەر دامەزراوە نەوتییەکان کەوتن و بەپێی ئامارێکی ورد، 40%ی پاڵاوگەکانی ناوچەی (پۆلیستی) لەناوچوون.

هەرچەند ئەو زیانانە زۆر دژوار و ترسناکبوون، لەگەڵ ئەوەشدا (ئەریکسۆن) پەی بەوەبرد کە ئەڵمانییەکان دەستیان بە درووستکردنی پاڵاوگەی دیکە کردووە، پەلە لە کاری پاڵاوتنی نەوتدا دەکەن.

### تێکوپێکدان

دوانیوەڕۆی ڕۆژێک (ئەریکسۆن) سەردانی یەکێک لە پاڵاوگەکانی شاری هانۆڤەری کرد، بەڵام لەبەرئەوەی بەڕێوەبەرەکەی زۆر سەرقاڵ بوو، لەگەڵ ژمارەیەک پلەداری دەریاوانی (سچهبەر)، سەرۆکی گشتیی بەرهەمی شەڕی ئەڵمانیا قسەی دەکرد، چونکە ناچاربوو چەندین سەعات چاوەڕوان بێت تا بانگی بکەن.

بەڕێوەبەری پاڵاوگەکە بەهۆی دواخستنی ئەو پیاوە داوای

لێبوردنی کرد، پاشان لەبارەی کاری بازرگانییەوە گفتوگۆیان کرد. سەعات نزیکەی هەشتی شەو بوو، کە گفتوگۆکەیان لەبارەی وتوویژی نەوت بۆ دەزگای سویدی کۆتایی پێهات، پاشان ئەریکسۆن سەردانی پاڵاوگەکانی کرد و هەستیکرد چەندین چەکی دژە ئاسمانیی نوێ لەوێ ئامادەکراون.

ئەریکسۆن ئیزنی ڕۆیشتنی لە بەڕێوەبەری پاڵاوگەکە خواست، بەڵام ئەو پیاوە زۆر شەیدای ئەخلاق و ڕەفتاری ئەریکسۆن ببوو، تکای لێکرد کە پەرداخێک بیرە بەیەکەوە بخۆنەوە. دوای خواردنەوەی بیرەکە، بەڕێوەبەری پاڵاوگەکە میوانە مەزنەکەی خۆی داوەتکرد، کە نانی ئێوارە لەگەڵ ئەو لە نووسینگەکەی بخۆن و وەک داوای لێبوردنی کرد، پیاوانە وتی: جەنابی ئەریکسۆن تکادەکەم قبووڵی بکەیت، بۆخۆت باش دەزانیت، کە ئێمە بە دێژایی ڕۆژ لێرە کاردەکەین و ژیانی کۆمەڵایەتیم بەتەواوی سفرە و بەدەگمەن میوانێکی وەک تۆ دێت، تا بتوانم چەند سەعاتێکی لەگەڵ بەسەربەرم.

ئەریکسۆن پیاوانە نوقمی خەیاڵکردنەوە بوو، نیازباشیی ئەو پیاوە لە مامەڵەی ئێستادا زۆر بەسوود دەبێت، ئەریکسۆن وەڵامیدایەوە: زۆر باشە. ئەگەر دەزانیت کاتت ناگرم، بەوپەڕی ئارەزووەوە دەمێنمەوە، نانی ئێوارە بەیەکەوە دەخۆین.

نانخواردنی ئێوارە لە بێدەنگیدا تەواوبوو، ئەریکسۆن دوای نانخواردن، جگەرەیەکی داگیرساند و ڕێک دەستەوجێ لەناکاو دەنگی ئاژێری پەلاماری ئاسمانی بەرزبووەوە، و ئەریکسۆن تێگەیشت کە ئەو شەوە بەخت یاوەری نەبووە، ئەگەر بیر لە چارەسەرێک نەکاتەوە، بۆمبی هاوپەیمانان دەیکەنە ئاردی ناو دڕوان.

بەڕێوەبەری پاڵاوگەکە لە کاتێکدا لەژێر لێوانەوە جوێنی دەدا، لە جێگەکەی هەڵستا، ئەریکسۆنی لەگەڵ خۆی بردە پەناگە ژێرزەمینییەکە و دوای چەند خولەکێک ڕمبەی تەقینەوەیەکی زۆریان لەپشت دیواری ژێرزەمینەکەوە بیست و لەگەڵ هەر تەقینەوەیەک لەشی بەڕێوەبەرەکان لە نیگەرانی و ترسدا دەلەرزی.

دوای نەمانی مەترسی، ئەریکسۆن لەگەڵ بەڕێوەبەری پاڵاوگەکە بۆ دیتنی بەشە زیان بەرکەوتووەکان ڕۆیشت و هەستیکرد، بۆڕییە ئەستوور و دەزگا جیاجیاکان هەموویان شکاون، پاڵاوگەکە بووەتە پارووی ئاگر و داپلۆخاوە.

لە ساڵەکانی 1934 و 1944، بەردەوام فڕۆکەکانی هاوپەیمانان هێرشیان دەکردە سەر پاڵاوگە و ناوچەی چاڵە نەوتییەکانی ئەڵمانیا، بەڵام هێشتا پیشەسازیی نەوتی ئەڵمانیا بەتەواوی تێکنەدرابوو.

لەوانەیە کاتێک توندترین زەربە بەو وڵاتە کەوتبێت، کە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لە تشرینی دووەمی 1943 پەلاماری هامبۆرگیان دا، چونکە لەو پەلامارەدا، فڕۆکەکان تەواوی کارگە کیمیاوییەکانیان، کە بەنزینی تایبەتیان بۆ دەبابەکانی مۆدێل (ME236) ئامادەدەکرد، وێرانکرد. دۆسیەی وەزارەتی بەرگریی ئەڵمانیا (کە پاشان ئاشکرابوون) نیشاندەدەن، تێکوپێکدانی کارگە کیمیاوییەکانی هامبۆرگ، شەش بۆ نۆ مانگ دروستکردنی جتەکانی ئەڵمانیای هەڵپەسارد.

### ئارەزووەکانی ژنێک

بارون نۆرد هۆفی سەرۆکی دەزگای تۆقێنەری گشتاپۆ، پەیوندی نزیکی لەگەڵ ئەریکسۆن پەیداکرد، زۆربەی کات بە یەکەوە بوون و ئەریکسۆنیش ڕۆڵی نازیبوونی بە شێوازیکی زۆرباش دەبینی، جارێکیان بەتەوسەوە بە پرن کارڵی وت: جارێکی دیکە کە بمەوێت کاری سیخوڕی بکەم، پێشتر ڕاوێژ بە دەروونناسێک دەکەم، تا بزانم شێتم یان نا.

ئەو کاتانەی ئەریکسۆن سەفەری دەکرد بۆ ئەڵمانیا، بەردەوام دوو ژنی جوان سەردانیان دەکرد، دەیانویست سەرنجیڕابکێشن و یەکەمیان (لیزاوبێر)، کچی بەرپرسیکی گشتاپۆ بوو، کە لە میوانداریيەک ناسیویەتی و هەمیشە

داوای لێدەکرد بەیەکەوە گەشت بکەن، بەڵام وەک ئەریکسۆن ئەرکێکی دیکەی هەبوو، بۆیە داوای ئەو ژنەی ڕەتدەکردەوە، کەچی ژنی دووەم، کە ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیخوڕیی ئەریکسۆندا دەبینی، ناوی ماریان بوو، بۆ یەکەم جار لەلایەن دەزگای سیخوڕیی هاوپەیمانان ئەو ژنەی ناسیی، کە لە سیخوڕانی ئەمەریکی بوو (واتە بۆ خۆی بە ئەڵمانی ئەژماردەکرا، بەڵام کاری بۆ ئەمەریکییەکان دەکرد)، بەهۆی ئەوەی کە بەرپرسانی فەرمانگەی سیخوڕیی هاوپەیمانان ویستیان ئەریکسۆن ئەو ژنە بناسێت، ئەوەبوو دەیانبینی تەواوی کارەکانی بەبێ بوونی هاوکار و هاوڕێ ئەنجامدەدات، بۆیە بڕیاریاندا کە ماریان ڕابسپێرن هاوکاری بکات.

کەمێک پێش ئەوەی ئەریکسۆن سەفەربکات بۆ ئەڵمانیا، (برادلی) وێنەیەکی گچکەی ماریانی نیشاندا و وتی: پێشتر فەرمان بەو ژنە کراوە لە بەرلین پەیوەندیت پێوەبکات، بێتە هۆتێلی بەهەشت و ڕەمزەکەی بڵێت.

(ئەریکسۆن) لە کاتێکدا بەدیقەتەوە لە وێنکە ڕامابوو، پرسی: لە بنەڕەتڕا ئەو ماریانە کێیە و کاری چییە؟

(برادلی) وەڵامیدایەوە: لە خێزانێکی هەژاری ئەڵمانیایە و چەندساڵێکیش لە بەریتانیا ژیاوە. بەڕواڵەت نیشتمانپەروەرێکی دەمارگیرە، لە کاتێکدا بەو شێوەیە

نییە و زۆر ڕقی لە هیتلەر و نازییەکان دەبێتەوە. لەمێژە وەک کارمەند کار بۆ ئێمە دەکات و ئێمە زۆر لە کار و چالاکییەکانی ڕازین.

(ئەریکسۆن) جارێکی دیکە تەماشای وێنەکەی کردووەتەوە، خستییە مێشکییەوە و ماژۆر بردلی بەردەوام بوو: ئەسڵی بابەتەکە لێرەیە کە ماریان بەردەوام لەلایەن حزب و کۆمەڵەکانی ئەڵمانیاوە بانگهێشت دەکرێت، چونکە هەموویان بە نازییەکی نیشتمانپەروەری دەزانن و بێگومان دەتوانێت تۆ بە هەموو سەرۆکانی کۆمپانیای نەوتی بناسێنێت، شوێنی پاڵاوگە نهێنییەکانت پێ بڵێت.

- هەڵبتە.

- نابێت تۆ لە هیچ شوێنێک ناوی ماریان بهێنیت، ئێمە نامانەوێت هیچ کەسێک بزانێت کارمەندی ئیدارەیە و ئەگەر هەریەکێک لە ئێوە دەستگیرکران، نابێت ئەوی دیکە ئاشکرابکات.

- بەڵێ. هەڵبەتە من چۆن دەتوانم متمانە بە ژنێکی غەریبە بکەم؟

- ئەو غەریبە نییە و ئێمە زیاتر لە هەمووشتێک متمانەمان پێیە، ئەو هۆکار و ئەڵقەیەکی بەیەکەوە بەستنەوەی باشە لەنێوان تۆ و تەواوی بەرپرسانی ئەڵمانیا.

ئەریکسۆن سەری ڕاوەشاند و پاشان دەستیکرد بە

دووبارەکردنەوەی ڕەمزەکە، کە (مانسفێڵد) پێی وتبوو پێویستە لە کاتی پەیوەندیکردن بە ماریانەوە گۆی بکات و خۆی بناسێنێت.

***

دووشەممەی هەفتەی داهاتوو، ئەریکسۆن بە فڕۆکە بەرەو بەرلین فڕی و کاتێک گەیشتە هۆتێلی بەهەشت، پشووی دا و بە دەسپێکی شەو، زڕەی زەنگی تەلەفۆنەکە هەستا و گوشییەکەی تاودایە، دەنگی ژنێک لەوسەری وایەرەکەوە وتی: ئالۆو، ئەریک گیان، چەندە خۆشاڵم کە دیسانەوە هاتوویتەوە بۆ بەرلین کۆتری بەرزەفڕان.

ئەریکسۆن لە تۆنی عاشقانەی ئەو ژنە، کە جگە لە ماریان هیچ کەسێکی دیکە نەبوو، حەپەسا و لە وەڵامدا وتی: زۆر سەیرە کە دیسانەوە دەنگی تۆ دەبیستم. کۆترە جوان و نەشمیلانەکەی من، ئیدی بەرگەی دووریی تۆ ناگرم و دەمەوێت لە ئامێزمدا بتگوشم.

– ئەریک من ناتوانم زۆر قسەبکەم، ئایا دەشێت سەعات دەی شەوی چوارشەممە یەکتری ببینین؟

– بەڵێ، شەوی چوارشەممە زۆر گونجاوە، هیوادارم ئەو شەوە، ئاگری شەڕ دامرکابێتەوە.

– شەوی چوارشەممە لە شوێنی هەمیشەیی چاوپێکەوتنمان دەتبینم، ماڵاوا.

(شوێنی یەکتردیتنی هەمیشەیی)، بریتی بوو لە بەشی خۆرئاوای پارکی شاری بەرلین و ئەریکسۆن پێش سەعات دەی شەوی چوار شەممە، لە هۆتێل وەدەرکەوت، لە کاتێکدا وریابوو کەس چاودێری نەکات، بڕیاربوو ئەگەر چاودێری کرابێت، بچێتە ڕیستۆرانتێک و پەرداخێک مەشرووب بخواتەوە، بە شێوەیەک خۆی نیشانبدات، کە گوایە چاوەڕوانی کەسێک دەکات و دوای چەند خولەکێک چاوەڕوانی، لە شوێنی خۆی هەڵدەستێت و دەڕوات.

کاتێک ئەریکسۆن بە دڵنیابوون لەوەی، کە هیچ کەسێک چاودێری ناکات، گەیشتە شوێنی دیدارەکە. لە پشتەوەی دەنگی ژنێکی بیست، کە بەئەستەم دەیوت: ئایا تۆی کۆترە بەرزەفڕەکەی من؟

- بەڵێ گیانەکەم، منم.

هەردووکیان خۆیان لە باوەشی یەکتری هاویشت و هەرکەسێک دەی دیتن، وایدەزانی ئەو دوو عاشق و مەعشووقە ساڵانێکە یەکتریان نەدیتوە، (ماریان) بەچرپەوە وتی: ئێستا ئیدی خۆر دنیای بۆ ڕووناکتر کردمەوە.

ئەریکسۆن لە بەرامبەردا وەڵامیدایەوە: هەرکاتێک لە ئامێزی تۆدام، هەموو هەورەکان دەڕەونەوە.

بەو شێوەیە ئاماژەی ڕەمز ئاڵوگۆڕکرا و (ماریان) وتی: وەرە بابڕۆین. هەمووشتێک ڕێکخراوە.

هەردووکیان دەست لەناو دەستی یەکدیدا ڕۆیشتن و دوای چەند خولەکێک گەیشتنە بەردەمماڵەکە، چوونە ژوورەوە. هۆڵەکە نیوەڕووناک بوو، ئەریکسۆن ناچاربوو تاڵەشقارتەیەک دابگیرسێنێت، دوای ئەوەی درێژایی هۆڵەکەیان بڕی، گەیشتنە دەرگایەک کە ژمارە دوازدەی لەسەر نووسرابوو، (ماریان) ئەو دەرگایەی بە کلیل کردەوە و هەردووکیان چوونەژوورەوە.

(ماریان) دوای چوونەژوورەوە، تەواوی کونوکەلەبەری ئەو ژوورەی پشکنی و کاتێک دڵنیابوو هیچ مایکرۆفۆنێک لەوێدا نەشاردراوەتەوە، لەسەر کورسییەک دانیشت و وتی: چەند ڕۆژێک پێش ئێستا ئەم ژوورەم بەکرێ گرتووە، بەڵام لەبیرم چووبوو بیپشکنم.

- زۆر بە پارێزەوەی؟

- بەڵێ پێویستیشە وەهابم.

(ماریان) دەستی بە گێڕانەوەی ئەو زانیارییە کرد، کە دەسەتەبەری کردبوو. (ئەریکسۆن) لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لە ڕوخساری ڕاماوە و پێیوابوو، پلە بە پلە لە وێنەکەی جوانترە.

***

چەند مانگێک دوای یەکەمین دیدار، ئەریکسۆن چەندین جار سەردانی (ماریان)ی کردووە، لە سەرەتاوە ژوانگەیان

هەمان ژووره گچکەکەی یەکەم بوو، بەڵام پاشان (ماریان) شوێنی نیشتەجێبوونی گۆڕیوه و بۆ تەلارێکی گەوره و ڕازاوەی گواستەوه.

هیچ کات ئەو دووانە لە شوێن و گوزەری گشتیدا یەکتریان نەدەبینی، (ماریان) بووەتە ئاشنای جەنەراڵێکی هێزی ئاسمانیی ئەڵمانیا و ئەریکسۆنیشی پێ ناسادبوو.

پەلاماری هاوپەیمانان بۆ سەر پاڵاوگە نەوتییەکانی ئەڵمانیا، هەروەک بەپێی نەخشەیەک کە ئەریکسۆن پێیدابوون، بەردەوام بوو، سەرنج بەوەی کە لەو ڕۆژانەدا نەوتی ئەڵمانیا (لە پاڵاوگەیەکی گەورەدا ناپاڵێوریێت)، بەڵکو پاڵاوگەی جیاجیا و بێشومار بۆ ئەو کاره هەبوون، بۆیه ئەریکسۆن بەردەوام سەری لە کۆمپانیا نەوتییەکان دەدا، زانیاری دەستەبەردەکرد. سەردانکردنەکانی لەسەریەکی ئەریکسۆن لەگەڵ (ماریان) بووەهۆی ئەوەی، کە ئەو دووانه شێت و شەیدای یەکتری ببن، بەڵام هەرگیز ئەو عیشقەی خۆیان دەرنەدەبڕی. (ماریان) کە سیخوڕێکی ئەڵمانی بوو، دژی نازییەکان کاری دەکرد، ئەریکسۆنی بەهۆی ئەو کاره بوێرانەوه زۆر خۆشدەویست، کە دژی نازییەکان ئەنجامی دەدا. هەرگیز ئەریکسۆن لە بابەت ئەو عیشقەوه سەرزەنشتی خۆی نەدەکرد، چونکە دەیزانی لە دنیای سیخوڕان، لەو جۆره عیشقانە بەزۆری ڕوودەدەن، بەڵام

دڵنیابوو ئەو عیشقە لەگەڵ هەموو عیشقەکان جیاوازە<
ناچارە دوای تەواوبوونی شەڕ، لەنێوان ئینگرید و ماریان
یەکیان هەڵبژێرێت، بەڵام پێشتر دەیزانی کە بژاردەکەی لەو
دیاریکردنە، جگە لە هاوسەرەکەی ئینگرید، هیچ کەسێکی
دیکە نابیێت.

**بەدگومانdی بەرپرسانی سوپا**

لە سەرەتای ساڵی 1944 دا، ئەریکسۆن هەستیکرد
لە بازنەیەک زیاتر نییە بە دەست هاوپەیمانانەوە، چونکە
هێشتا فڕۆکەکانیان هێرشیان نەبردبووەسەر پاڵاوگە
گەورەکانیان< ئەریکسۆن بەردەوام لە ماریانی دەپرسی
ئەگەر ئەوان نایانەوێت پاڵاوگە گەورەکان تێکوپێک بدەن،
ئەی کەوایە بۆچی ئێمە هەراسان دەکەن؟

بەڵام ئەسڵی بابەتەکە ئەوەبوو کە هاوپەیمانان هەموو
ئەو زانیاریەیان کۆدەکردەوە، کە ئەریکسۆن بۆی دەناردن
و مەبەستیان ئەوەبوو، ئەگەر ئەڵمانیا لە زستانی ئەو
ساڵە چۆکی دانەدا، پەلاماری گرنگ و بەرچاوی خۆیان
ئەنجامبدەن، زەربەیکی گوڕچکبڕ لە پەیکەری ئەڵمانیا بدەن.

لە سەرەتای هەمان ساڵەوە، کە ئەریکسۆن زۆر لەو
بارەیەوە نیگەران بوو، هاوپەیمانان سەرقاڵی خۆئامادەکردن
بوون بۆ پەلاماردانی ناوچەی چاڵەنەوتییەکانی ئەڵمانیا،

ئەو ئامادەکارییە لە فەرماندەییەکەی جەنەراڵ ئایزنهاوەر ئەنجامدەدرا، (لەو سەردەمەدا دوایت ئەیزنهاوەر هێشتا جەنەراڵ بوو، نەببووە سەرۆککۆمار – و.ف). جەنەراڵەکانی ئەمەریکا لەوانە ئەیزنهاوەر بۆ خۆی، دەیانویست بەناو خاکی فەڕەنسادا هێرشێکی توند بکەنە سەر ئەڵمانیا.

ناکۆکیی نێوان جەنەراڵەکان بوو وایدەکرد، فڕۆکەکانی ئەمەریکا زووتر پەلاماری ناوچەی چاڵەنەوتییەکای ئەڵمانیا نەدەن، چونکە جەنەراڵ (کارڵ سپاتز)ی سەرۆکی هێزەئاسمانییەکانی وڵاتەیەکگرتووەکان و جەنەراڵ ئایزنهاوەر (ماپ ئارنۆڵد)، لە گفتوگۆکانی خۆیاندا، نەدەگەیشتنە ئەنجام.

ئایزنهاوەر باوەڕی وابوو فڕۆکەکانی هاوپەیمانان ئەوەندە زۆر نین و ناتوانن هەموویان بەیەکجاری، لە پەلامارێکدا بۆ سەر ناوچەی چاڵە نەوتییەکانیان بنێرن، چونکە بەو شێوەیە هێزی ئاسمانییان لاواز دەبێت، ئەڵمانییەکان لە هەموو لایەکەوە، پەلاماریان دەدەن و پێویستە پێش هێرشکردنە سەر ناوچە نەوتییەکان، کاری گرنگتر بکەن.

ئایزنهاوەر بەردەوام لەلایەن فەرماندەکانی سوپای هاوپەیمانانەوە، بەتایبەت بەریتانییەکان لەبارەی بۆردومانی ناوچە نەوتییەکان دەستووری وەردەگرت، بەڵام

هەمووی ڕەتدەکردەوە و ڕایدەگەیاند، کە پێویستە پێش هەمووشتێک هێرش بکرێتەسەر هێڵی ئاسمانی ئەورووپای خۆرئاوا. بەم تاکتیکە، کاری گواستنەوەی پێداویستییەکان و سەربازەکان بۆ ئەورووپای خۆرئاوا، دەبڕدرێت و ڕێگای وشکانی دەبەسترێت و ئەڵمانییەکان، ناچاردەبن بۆ هاوکاریکردنی خەڵکی خۆیان لە بەرەی خۆرئاوا، سوود لە ڕێگای ئاسمانی وەربگرن، ئەیزنهاور باوەڕی وابوو کە ئەگەر بیانەوێت فڕۆکەکانی خۆیان بۆ وێرانکردنی ناوچە نەوتییەکان ڕەوانەبکەن، ئیدی لە کاتی هەڵگرتن و گواستنەوەی پێداویستی و سەربازەکانی ئەڵمانیا لە ڕێگای ئاسمانییەوە، ئەوان ناتوانن بەر بەو کارە بگرن (چونکە وەک پێویست فڕۆکەیان نابێت)، بەڵام ئەگەر فڕۆکەکان هەموویان لە جێگەیەک کۆدەبوونەوە، دەیانتوانی بەئاسانی دوای وێرانکردنی هێڵی وشکانی، پاشان هێرشبکەنە سەر فڕۆکەکانی ئەڵمانیا و تێکوپێکیان بشکێنن و بەم تاکتیکە، شارەزایانە، هەم هێزی ئەڵمانیا لە خۆرئاوا تێکدەشکا و هەم هێزی ئاسمانیی ئەو وڵاتە تارومار دەبوو، ئەڵمانیا خۆی لە خۆیدا تەسلیم دەبێت.

هەرچەندی ئەیزنهاوەر پێداگری لەسەر بیروباوەڕی خۆی دەکرد، ئەوانی دیکە زیاتر دژی دەوەستانەوە، دەیانوت هەرگیز ئەڵمانیا تەسلیم نابێت، مەگەر بە

وێرانکردنی پاڵاوگەکان و تێکدانی ناوچە چاڵەنەوتییەکان.

ڕۆژێکیان ئەیزنهاوەر بە ئامادەبوونی تەواوی ئەفسەرانی هاوپەیمانان وتەیەکی پێشکەشکرد، باوەڕی خۆی دەربڕی و وتی: بەڕێزان ئەگەر ئێمە ئێستا بمانەوێت هەموو فڕۆکەکانی خۆمان بنێرین بۆ ئەڵمانیا، هیچ فڕۆکەیەکمان نامێنێتەوە، ئەڵمانیا دەتوانێت ئەو هەلە بقۆزێتەوە و لە ڕێگەی ئاسمانییەوە هێرشی کوشندەمان بکاتەسەر، بەڵام ئەگەر ئێمە پاشەکەوتی ئاسمانیی خۆمان بپارێزین، دەتوانین پێش هەمووشتێک ڕێگای وشکانی (هێڵی شەمەندەفەر)، کە لە ئەڵمانیاوە بۆ تەواوی وڵاتانی خۆرئاوا درێژبووەتەوە لەناوبەرین و بەم کارە، ئیدی ئەڵمانییەکان ناتوانن هاوکاری بۆ هێزەکانی خۆیان بنێرن لە خۆرئاوا، هەر لەبەرئەوە هێزەکانیان لە ئەورووپای خۆرئاوا تێکدەشکێت، ئەڵمانیا ناچاردەبێت لە ڕێگەی ئاسمانییەوە هاوکارییان بۆ بنێرێت، ئەگەر فڕۆکەمان بەدەستەوە نەبێت، ناتوانین پێش بە فڕۆکە هاوکاری بەرەکانیان بگرین، هەم بۆخۆمان شکستدەخۆین و هەم جارێکی دیکە، دووبارە تەواوی وڵاتانی چۆڵبوو، دەکەونەوە دەست ئەڵمانییەکان.

بیروباوەڕی جەنەراڵ ئەیزنهاوەر بەم شێوەیە بوو، بەڵام جەنەراڵ (سپایز) سەرۆکی هێزی ئاسمانیی ئەمەریکا ڕایدەگەیاند: کە تاکە ڕێگەی شکستپێهێنانی هێزی ئاسمانیی

ئەڵمانیا، هێرشکردنەسەر ناوچەی چاڵەنەوتییەکانە: چونکە ئەگەر پاڵاوگەکان و دەزگاکانی دەرهێنانی نەوتی خاو تێکدەشکێندران، ئەڵمانیا نەیدەتوانی نەوتی خاو دەربهێنێت، بیپاڵێوێت، بۆیە ناتوانن بەنزینی فڕۆکەکانیان ئامادەبکەن، بەم شێوەیە، هێزی ئاسمانی خۆی لە خۆیدا لەناودەچێت و خۆی تەسلیم دەکات.

هەروەها جەنەراڵ سپاتز ئەوەی بەبیر ئەیزنهاوەر هێنایەوە، کە ئەگەر شەش مانگی دیکەش، هەل و دەرفەت بۆ ئەڵمانیا بڕەخسێنرێت، ئەو وڵاتە دەتوانێت بڕی 8,500,000 تەن نەوت و بەنزین ئامادەبکات، وەک پێویست پاشەکەوتی شەڕکردنی هەبێت و ئەو کاتە هاوپەیمانان ناوانن تا ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ ئەو وڵاتە تووشی قەیرانی سووتەمەنی بکەن. باوەڕی جەنەراڵ سپارتز ئەوەبوو، کە هێزە ئاسمانییەکانی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هاوکاریی بەریتانیا، دەتوانن بە تێکوپێکدانی تەواوی پاڵاوگە و ناوچە نەوتییەکان، زەربەیەکی کوشندە لە پەیکەری ئەڵمانیا بدەن، هەر ئەو کارە دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی بەرووبوومەکانی شەڕی ئەو وڵاتە.

ئەریک ئەریکسۆن لە ئەڵمانیا و جەنەراڵ (سپاتز) لە بەریتانیا (بە بێ ئەوەی یەکتری بناسن)، هەردووکیان بە نیگەرانی و تامەزرۆییەوە، چاوەڕوانی ڕاگەیاندنی

ئەنجامی کۆتایی بڕیاری وڵاتانی هاوپەیمان بوون، لەبارەی پەلاماردانی ناوچە نەوتییەکانەوە.

سەرەنجام ئازینهاوەر بڕیاری خۆی بە مێژووی 25ی مانگی ئاداری 1944 ڕاگەیاندبوو. وەڵامەکەی لەو بارەیەوە نەرێنی بوو، وێڕای نهێنیی جەنەراڵ سپاتز، فەرمانی بۆردومانکردنی هێڵی ئاسنی دەرکرد. خۆشبەختانە بڕیارەکەی ئایزنهاوەر یەکلاکەرەوە نەبوو، دوای شەش ڕۆژ، واتە 31ی ئادار دوای ڕاوێژێکی زۆر پێشنیازی کرد، کە پەلامارێکی تاقیکردنەوەیی لەلایەن هێزی هەشتەمەوە ئەنجامبدرێت، فڕۆکەکان هێرش بکەنە سەر بەشێک لە سەرچاوەکانی نەوتی خاو.

***

یەکەمین هێرشکردنە سەر ناوچە نەوتییەکان (پلوستی) بە مێژووی 5ی مانگی نیسانی 1944 ئەنجامدرا، دوای ئەوەش لە 11 و 24ی نیسان و 5ی مانگی ئادار، کۆمەڵەی جێتی بێشومار لە فڕۆکە زەبەلاحەکان پەلاماری ناوچەکانی نەوتی خاوی ئەڵمانیایان دا، لە هەریەک لەو پەلامارانەدا (کە زۆربەیان لەلایەن هێزەکانی وشکانی و ئاسمانی و دەریایی ئەڵمانیاوە نەزۆک دەکران)، زیانێکی جێگەی سەرنج بە پاڵاوگەکانی ئەڵمانیا کەوت.

ئەریکسۆن، کە لەلایەن هاوکارەکانییەوە (سەرۆکانی

کۆمپانیا نەوتییەکان)، زانیبووی ئەڵمانیا زراوی چووە، کەمێک هێزی وەبەرگەڕایەوە، لە مێژووی 17ی نیسان، ئەیزنهاوەر بڕیارێکی گرنگی دەرکرد، کە یەکەم پەلاماردان بۆسەر هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا و دووەمیان تێکدانی تێکڕای شارێگەکان و هێڵی وشکانی و شەمەندەفەر بوون، و هەر ئەو کاتە جەنەراڵ (سپاتز)، سەرۆکی هێزی ئاسمانیی ئەمەریکا هەلەکەی قۆستووەتەوە و ڕایگەیاندبوو، کاتی ئەوە هاتووە ئایزنهاوەر پەلاماری گرنگ و گەورە بۆ سەر ناوچە نەوتییەکانی ئەڵمانیا پەسەندبکات، بەردەوام دەیوت، ئایا هێزی ئاسمانیی ئەڵمانیا پێویستی بە سووتەمەنی نییە؟ کەوایە بۆچی نابێت هێرشکردنە سەر نەوتی خاوی ئەو وڵاتە، کە سووتەمەنیی پێویست بۆ فڕۆکەکانی دابیندەکات، ئەنجام بدرێت؟ هۆکاری دووەمی (سپاتز) لەبارەی تێکشکانی ئەڵمانیاوە (بەم تاکتیکە) ئەوەبوو، ئەگەر هێرش بکرێتە سەر پاڵاوگەگەورەکان (فڕۆکەکانی هاوپەیمانان)، هەڵدەستن و ئەوە وادەکات ئەمەریکا بتوانێت ئەو فڕۆکانە بخاتە خوارەوە، پێش ئەوەی هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا بکەونە قەیرانی سووتەمەنییەوە، تا ئاستی جێگە سەرنج کەم بێتەوە.

ئایزنهاوەر لە بەرامبەر ئەو سەلماندنەی جەنەراڵ (سپاتز) ڕازیبوو، بە مێژووی 19ی نیسان بڕیاریدا

جەنەراڵ (دولیتل) بڕێکی زۆری بۆمهاوێژەقورسەکانی هێزی هەشتەمی ئاسمانیی ئەمەریکای بۆ هێرشبردنەسەر ناوچە چاڵەنەوتییەکانی ئەڵمانیای نارد. (ئایزنهاوەر) لە کاتی دەرکردنی ئەو بڕیارەدا، بە سەرۆکی هێزە ئاسمانییەکانی ئەمەریکای وت: لە کاتێکدا پەلاماری زیاتر بۆ سەر ناوچە نەوتییەکانی ئەڵمانیا پەسەنددەکرێن، کە تەنیا لەو پەلامارەی یەکەمدا (گۆریانگ)، سەرۆکی فەرماندەی هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا، بڕیاربدات فڕۆکەکان بۆ بەرگری لە پاڵاوگەکان هەڵبستن و شەڕ لەگەڵ فڕۆکەکانی هاوپەیماناندا بکەن.

سەرەنجام ئەوەی ماوەیەکی زۆربوو ئەریکسۆن چاوەڕوانی بوو، هاتەدی (میللەتی ئەمەریکا هەرگیز ئەو خزمەتە گەورەیەی جەنەراڵ سپاتزی لە بیرناچێتەوە).

ئەنجامی کۆتایی

جەنەراڵ دولنیل (سەرۆکی فەرماندەی هەشتەمی هێزە ئاسمانییەکان)، فەرمانی هێرشەکەی دا. لەم قۆناغەدا 884 بۆمبهاوێژی گەورە و 1040 شەڕکەر (بریتی لە فڕۆکەی پارێزەر، وەک دەڵێن سکۆرت) بەشدارییان کردبوو، بەڵام بەرنامەی هەڵفڕینیان بەهۆی خراپبوونی کەشوهەواوە، دواخرا.

سێ هەفتەی تەواو، واتە 12ی مانگی ئادار، بارودۆخی کەشوهەوا لەبارنەبوو، بەڵام سەرەنجام ئەو ڕووداوە

مێژووییە هاتەدی، فڕۆکەکان فڕین و ئەوەی کە ئەڵمانیا لێی دەترسا، ڕوویدا و چارەنووسی شەڕی دووەمی جیهانی گۆڕا. پێشبینییەکانی (جەنەراڵ سپاتز) و ئەریکسۆن ڕێک وەک خۆیان هاتنەدی، چونکە فڕۆکە (لوفت واف)ەکانی ئەڵمانیا بە فەرمانی (گۆرینگ)، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یەکلاکەرەوە فڕین، شەڕی ئاسمانیی گەورە بەرپابوو.

لە دەورووبەری فرانکفۆرت: لە نزیکەی 150 بۆ 200 فڕۆکەی ئەڵمانی بە شێوەیەکی بەکۆمەڵ بەرەو ئاسمان هەڵفڕین، تا پێش بە دوژمن بگرن، کە نیازی وێرانکردنی پاڵاوگە و ناوچە نەوتییەکانیان هەبوو...

**(لە دۆسیەی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا وەرگیراوە)**

زیاتر لە 800 بۆمبهاوێژی قورسی ئەمەریکی گەیشتوونە ئامانجەکانی خۆیان، نزیکەی 1718 تەن کەرەستەی تەقینەوە و تێکدەریان بەسەر ناوچەی چاڵە نەوتییەکانی (ریکا) مرسبورگەلیۆنا، براو، لوتزندرۆف، بۆهلن، زایتس و تەواوی شارەکاندا هەڵڕشت...

هێزی هەشتەمی ئاسمانیی ئەمەریکا، 46 بۆمبهاوێژیی لەدەستدا، 10 شەڕکەری هاوپەیمانان کەوتنەخوارەوە، بەڵام هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا لە کاتی بەرگریکردن لە ناوچە نەوتییەکان، زیانێکی زۆریان بەرکەوت...

له بۆردومانکردنی ناوچە نەوتییەکان (مرسبۆرگ لیۆنا) شتێک ڕوویدا، کە نەک تەنیا ئەریکسۆن، بەڵکو سەرۆکانی سوپای هاوپەیمانانیش پێشبینیی ئەوەیان نەکردبوو، چونکە لەو هێرشەدا، باڵەخانەیەکی زۆر گەورەی شاری (مرسبۆرگ لیۆنا)، کە تێیدا یەکەمین ئەزموونی درووستکردنی بۆمبی ئەتۆمی لە پێشکەوتندابوو، وێرانکرا.

لەو هێرشەی یەکەمدا، کە جەنەراڵ سپاتز سەلماندی ڕێگەیەکی درووستی بڕیوە، ئایزنهاوەر لە وتارێکیدا وتی:

(ئێمە زۆر دەترساین هێرش بکەینە سەر ناوچە نەوتی پیشەسازییەکانی ئەڵمانیا، بەڵام جەنەراڵ سپاتز قەناعەتی پێکردم، کە توانای ئەڵمانیا زیاتر پەیوەندی بە سووتەمەنییە ئەو وڵاتەوە هەیە و ئەوە، گەورەییەک بوو بۆ ئێمە و تەواوی جیهانییان)

ئەوەی وایکرد ئەمەریکا لەو هێرشەدا سەروکەتووبێت، بوونی ئەریکسۆن بوو، چونکە ئەگەر ئەو نەخشەی ناوچەی چاڵە نەوتییەکان و پاڵاوگەکانی نەدەکێشا، زانیاری لەوبارەیەوە، دەستەبەرنەدەکرد، هەرگیز هاوپەیمانان بەم سەرکەوتنە نەدەگەیشتن.

تا دوای سێ هەفتە، واتە تا 6ی مانگی حوزەیران بۆمبهاوێژەکانی هاوپەیمانان درێژەیان بە هێرشەکانی خۆیاندا، (ئەریکسۆن)، بەردەوام هاموشۆی ئەڵمانیای دەکرد،

زانیی کە بارودۆخی ئەو وڵاتەی لەرزۆک کردووە، بەتایبەت تێکدانی ناوچەی تاقیگەی بۆمبی ئەتۆمی هەموویانی تووشی نارەحەتی کردووە، کاتێک کارکەران و پرۆفیسۆرەکانی کە سەرقاڵی درووستکردنی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی بوون، هەستیانکرد ماندووبوونەکەیان بەفیڕۆچووە، بەتوندی دڵتەنگبوون و تەزین و لێرەدابوو، کە خودی (گویلز)، سەرۆکی بانگەشە و دەریاوان (سپیر) وەزیری بەرگریی ئەڵمانیا بۆ خۆیان چوونەتە شاری (مرسبۆرگ لیۆنا)، وتاری شۆڕشگێڕییان داوە و ئەندازیاران و کرێکارەکانیان هانداوە بە زووترین کات تەلاری بۆمبە ئەتۆمییەکە تەواوبکەن. ئەریکسۆن دوای چەندین ڕاوێژ و گفتوگۆ کە لەگەڵ هاوکارانی خۆی (سەرۆکی کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەڵمانیا) ئەنجامیدا، توانیی ئەو زیانانە بزانێت، کە بەر ئەو وڵاتە کەوتووە و ئەویش ڕاپۆرتی لەوبارەیەوە دا.

خودی دەریاوان (سپیر)، سەرکێشی بۆ تەواوی پاڵاوگە بۆردومانکراوەکان کردبوو.

دوای کۆتایی پێهاتنی شەڕ، کاتێک دۆسیەکانی وڵاتانی ئەڵمانیا هەڵدرانەوە، دەرکەوت لەو هێرشەدا، بەروبوومی نەوتی ئەڵمانیا یەک بۆ دوو کەمیکردووە، زیاتر لە 120000 کرێکار بۆ درووستکردنەوەی سەرلەنوێی پاڵاوگەکان خراونەتە کارەوە.

هێزی ئاسمانیی ئەڵمانیا تا هاوینی داهاتووی ئەو ساڵە، هەستی بە دەرئەنجامی کەمبوونەوەی سووتەمەنی نەکرد، بەڵام (ئەریکسۆن) زۆر دڵخۆشبوو، کە حەقیقەتێکی گەورەی زانیوە، بەو مانایەی کاتێک هاوپەیمانان لە کەناراوەکانی نۆرماندی نزیکبوونەوە، ڕێک ئەو ڕۆژە بوو، کە هێرشە ئاسمانییەکە دەستی پێکرد و لەو هێرشەدا، ئەمانەی خوارەوە ڕوویاندا:

بە هەمان جۆر کە سەرۆکی فەرماندەیی هێزە ئاسمانییەکانی ئەمەریکا چاوەڕوان بوو، هێرشکردنە سەر ناوچە نەوتییەکان وایکرد، هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیاش بچێتە ناو شەڕەکەوە و لە مانگی ئادار، فڕۆکەوانەکانی هاوپەیمانان، زیاتر لە 2500 شەڕکەری ئەڵمانییان بەردایەوە، ئەو پڕۆسەیە بووەهۆی تێکچوونی نەخشەی هیتلەر و گۆرینگ، چونکە گۆرینگ دەیویست بۆمبهاوێژی بەهێز لە ئەڵمانیاوە بۆ فەڕەنسا بنێرێت، بەڵام بە هاتنەپێشی ئەو پرۆسەیە، نەخشەکەی هەڵوەشایەوە، هێزەکانی ئەڵمانیا لە فەڕەنسا لاوازبوون. نەوت ئامانجی ژمارە یەکی ستراتیجی بوو، ئەریکسۆن بەردەوام لە ئەڵمانیا لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە تەراتێنی بوو، دەزگای سیخوڕیی هاوپەیمانانی لێ ئاگاداردەکردەوە.

بۆمبهاوێژە زەبەلاحەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا زیاتر لە 200000 تەن کەرەستەی تەقەمەنیان بەسەر پاڵاوگەکانی هامبۆرگ، وین، برمنا، میبۆرگ، بویرشۆلۆن، ئۆسترمور، ماگدبۆرگ، رۆڵند، مۆسیربۆم، فلۆرین درف، پۆلیتز و تەواوی شارەکاندا داباراند، پاشەکەوتی بەروبوومی نەوتی ئەڵمانیا بۆ لە 30%ی کەمبووەوە.

هاوپەیمانان بە وەرگرتنی ڕاپۆرتی دەزگای سیخوڕی و ئەریکسۆن، توانیاین بڕی ئەو زیانانە بزانن، کە لە دوژمنیان داوە، هەر ئەو کارە بە زیانی ئەریکسۆن تەواو بووە، چونکە پێش دەستپێکردن بە کارەکە ڕێککەوتن کرابوو، کە هاوپەیمانان ببڕای ببڕ دەرینەخەن کە چەند زیانیان بە دوژمن گەیاندووە، چونکە لە کاتێکی وەهادا ئەو کارە بە زیانی ئەریکسۆن تەواو دەبێت، دووژمن نارەحەت دەکات، بەڵام جەنەراڵێکی ئەمەریکی، لووتبەرزانە لە کۆنفرانسێکدا، کە بە ئامادەبوونی بەرپرسانی وڵاتانی هاوپەیمانان و ڕۆژنامەنووسان سازدرابوو، لەپشت تریبۆنەوە ڕایگەیاند، کە ئەوان چ شکستێکیان بە ئەڵمانیا هێناوە.

کاتێک ئەو هەواڵە بڵاوبووەوە، هێزی ئاسمانی هەستیکرد، کار لە کار ترازاوە و دەوڵەتی ئەڵمانیا تێگەیشت، کە هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەریان، لەسەر بنەمای ڕاپۆرتی سیخوڕەکانیان بووە، توندوتیژیی زیاتر لە کاروباری

نەوتدا دەکات، تەنانەت لەوانەیە ناسنامەی ئەریکسۆنیان بۆ ئاشکرابێت.

لە مێژووی 3ی حوزەیران، تەکنەلۆژیای نەوتی ئەڵمانیا لە 10% کەمیان کردووە، دەریاوان (سپیر)، ئەو ڕاپۆرتەی پێکەشی هیتلەری کرد، تێیدا نووسیبووی ئەگەر بڕیاری سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی پاڵاوگەکان نەدرێت، ئەوان شەڕەکە دەدۆڕێنن. (هیتلەر) و گۆدینگ بەپێی هەمان ڕاپۆرت ژمارەیەکی زۆریان لە فڕۆکەکان، کە لە بەرەی (نۆرماندی) سەرقاڵی شەڕبوون، گەڕاندنەوە تا لە کاتی دووبارە درووستکردنەوەی پاڵاوگەکانن بتوانن ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە، چاودێری بکەن. بەو شێوەیە لە سنووری سێ بەشی شەڕکەرەکان لە ئەڵمانیا چڕبوونەوە، تەنیا 1\ 4یان لە بەرەکانی شەڕدا مانەوە. ئەڵمانییەکان دەستیان لە دروستکردنی دەبابە هەڵگرت، ئەو دەبابانەش کە درووستیان کردبوون، نەیاندەتوانی بۆ بەرەی شەڕی خۆرئاوایان بنێرن، چونکە هاوپەیمانان هێڵی ئاسنیان وێرانکردبوو، ئەو فڕۆکانەی دەیانتوانی ئەو دەبابانە هەڵبگرن، خەریکی چاودێریی درووستکردنەوەی پاڵاوگەکانیان دەکرد و دەیان پاراستن. ئەوەندەی پێنەچوو، کە ئەنجامی کەمبوونەوەی نەوت خۆی لە خۆیدا دەرکەوت، ئەڵمانییەکان لە (کبن) (فەرەنسا) شکستیان خوارد.

ئەڵمانییەکان سەرەڕای ئەو زیانەی بەریانکەوت، سەرسەختانە درێژەیان بە شەڕ دەدا، و بە تێپەڕینی کات ئەریکسۆن زانیی کاری چاککردنەوەی پاڵاوگەکان بە هیلاکی و ماندبوونی شەوانە ڕۆژی 350 هەزار کرێکار، کە زۆربەیان دیلەکانی بێگانەبوون، بەردەوامە و لە بەرەوپێشچووندایە. ئەڵمانییەکان دامەزراوەی نەوتیی نوێیان لە شوێنە جیا جیاکان درووستدەکرد، هیواداربوون ئەم جارەیان هاوپەیمانان بە شوێنەکانیان نەزانن. کارەکە بە خێراییەکی زۆر بەرەوپێش دەچوو، ئەریکسۆن سەرسام بوو بەوەی ،کە ئەڵمانیا کەی دەیەوێت چۆکدابدات و تەسلیم بێت.

### قەیران لە بەرلین

ڕێک سێ ساڵی بێ کەم و زیاد لە کاری سیخوڕیی ئەریکسۆن تێدەپەڕی، ئەمجارەیان زانیی کە توانای مامەڵەکردنیی لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەڵمانیا نییە، بەهۆی کەمبوونەوەی نەوت، ڕێگەنادەن ئەو ماددەیە بۆ دەرەوەی وڵات ڕەوانەبکرێت، نەک ناتوانێت لە داهاتوودا مامەڵەبکات، بەڵکو ناتوانێت بچێتە وڵاتی ئەڵمانیا و لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە تەراتێن بکات.

(ئەریکسۆن) پێش ئەوەی جارێکی دیکە لە سویدەوە سەفەر بۆ ئەڵمانیا بکات، سەردانی ماژۆر برادلی و

سەرهەنگ مانسفێڵد (سەرۆکانی دەزگای سیخوڕیی ئەمەریکا)ی کرد، داوای ئەرکی ئەم جارەی لێکردن.

ماژۆر برادلی ڕایگەیاندبوو: ئەم جارەیان کە تۆ دەچیتە ئەڵمانیا، پێویستە بزانیت پاڵاوگە نوێیەکان بە چ خێرایییەک بەرەوپێش دەچن، چ کاتێک کاری درووستکردنیان تەواودەبێت، پاشان کە ڕاپۆرتی ئەو کارەت بۆ ئێمە نارد، دەزانیت چەند بۆمب بۆ لەناوبردنی ئەو پاڵاوگانە پێویستە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵبدە بزانیت هێزی ئاسمانیی ئەو وڵاتە توانای چەندە.

ئەریکسۆن سەری لەقاند و وتی: بەڵام زۆربەی بابەتەکە لێرەدایە، کە پێموانییە لەمەودوا ئیزنی هاتوچۆم پێبدرێت لەناو ئەڵمانیا، بێگومان درەنگ یان زوو، تێکڕای کۆمپانیا نەوتییەکان، دەبنە هی دەوڵەت و گرێبەستەکەم لەگەڵیاندا هەڵدەوەشێتەوە.

برادلی وەڵامیدایەوە: کەوایە پێویستە ئێمە پێش ئەوەی ئەوان ڤیزاکەی تۆ هەڵبوەشێننەوە، دەستبەکاربین.

ئەو شەوە ئەریکسۆن، پرنس کارڵ و تەواوی هاوڕێکانی چەندین سەعات گفتوگۆیان کرد، سەرەنجام بڕیار لەوە درا، کە ئەریکسۆن بۆ ئەڵمانیا بچێت و چەندی زووترە ڕێک شوێنی پاڵاوگە تازەدرووستکراوەکانیش وەربگرێت، بۆ سوید بگەڕێتەوە.

***

بۆ سبەی شەو، پرنس کارڵ برازای خاوەنشکۆ گۆستاوی پادشای سوید، نانی ئێوارەی لەگەڵ ئەریکسۆن خوارد و لە کاتی نانخواردندا، هەردووکیان قسە و گفتوگۆیان کرد، پرنس کارڵ وتی: ئەوەی ئەڵمانیا لە ئێستادا دەیەوێت ئەوەیە، کە نەوتی سادە و پاک بە تەواوی وڵاتان بفرۆشێت و لەجیاتی نەوتی خاو وەربگرێت، ئەگەر تۆ لێرە نەوتت دەپاڵاوت، دەتتوانی مامەڵەیەکی دۆستانەیان لەگەڵ ئەنجام بدەیت.

ئەریکسۆن لە خۆشیان هاواریکرد و وتی: بەڵێ، بیرێکی باشە و ئێمە نەوت بە ئەڵمانیا دەفرۆشین، چونکە لە ئێستادا زیاتر لە هەمووشتێک پێویستیان پێیەتی. ئێمە وا نیشاندەدەین، کە پاڵاوگەیەکی گەورە لە سوید درووستدەکەین و درووستکردنیشی بە شێوەیەک دەبێت، کە بۆمب و پێویستیی تر هەرگیز کۆڵەکەکانی نەلەرزێنێت و ...

پرنس کارڵ وتی: ئەگەر ئێمە بمانەوێت بەو بیانووە، تا ماوەیەک لەگەڵ ئەڵمانیا هاتوچۆمان هەبێت، فشارمان لێدەکەن بۆ درووستکردنی ئەو پاڵاوگەیە.

- نەخێر. من پێیاندەڵێم، کە دەوڵەتی ئێمە دەیەوێت پاڵاوگەیەکی گەورە درووستبکات، بۆ ئەو مەبەستە پێویستە من سەرەتا پاڵاوگەکانی ئەوان ببینم،تەماشای

کەرەستە و شمەکەکانیان بکەم و پاشان بڕیاربدەم.

- بەڵام لەوانەیە ئەڵمانییەکان بڵێن، کە پێویستی کرد ئەندازیارانی خۆمان بۆ درووستکردنی پاڵاوگەیەکی وەها بۆ سوید بنێرن، تا هاوکاری ئێمە بکات.

- نەخێر. من ڕەزامەندی لەسەر ئەو کارە دەرنابڕم. بە لای ئەڵمانییەکانەوە من بازرگانێکم، بازرگانیش هەمیشە خۆپارێز و پارەپەرستە، لەبەرئەوە پێویستە پێش ئەوەی پاڵاوگەی ناوبراو بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوەوە، من بۆ خۆم بە چاوی خۆم شێوەی کارەکەیان ببینم، پاشان لەگەڵ دەوڵەتی خۆم وەبەرهێنان بکەم.

بۆ سبەینێ بەیانی، پرنس کارڵ لە نووسینگەکەی خۆیەوە تەلەفۆنی بۆ سەرهەنگ مانسفیڵد کرد، لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا و وتی: ئارەزوودەکات پشکە بانکییەکەی بفرۆشرێت و پاشان بەردەوام بوو: ئایا ڕەسیدەکانیانم بۆ دەنێرن؟

- بەڵێ هەڵبەتە.

- سبەینێ بەیانی.

پرنس کارڵ گووشییەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە، مژولی کاری خۆی بوو. مەبەست لە (مامەڵەی ئاسایی) هەمان ژوانگەی هەمیشەیی بوو، مانای بەیانیش (هەمان شەو) بوو.

***

کارمەندانی دەزگای سیخوڕیی ئەمەریکا، هەموویان دەیانزانی ئەرکی (ئەریکسۆن) چییە و ئەو پیاوە بە هاوکاریی هەموو هاوڕێیانی خۆی، واتە ماژۆر برادلی و مانسفیڵد و پرنس کارڵ، هەمان شەو ئەو بەڵگانەی ئامادەکرد، کە تێیاندا نووسرابوو دەوڵەتی سوید بە دروستکردنی پاڵاوگەی زل و زەبەلاح ڕازییە و چاودێریی کاری دروستکردنی دەکات، بژاردەی تەواو درابوو بە ئەریکسۆن.

### سیخوری بەتوانا

بەیانی ڕۆژی داهاتوو، ئەو دوو کەسە چوونە باڵوێزخانەی ئەڵمانیا و قسەیان لەگەڵ (ئۆلریخ)ی پاشکۆی بازرگانی دا کرد، کاتێک ئەریکسۆن ڕایگەیاند دەیەوێت پاڵاوگەیەکی وەها گەورە دروستبکات، ئۆلریخ لە سەرەتاوە خۆشحاڵ بوو، بەڵام پاشان کە زانیی ئەو کارە ملیۆنان دیناری دەوێت، دەوڵەتی سوید ڕەزامەندی دەربڕیوە نەوت بە ئەڵمانیا بفرۆشێت، کەمێک دڵساردبوو، چونکە پێیوابوو دروستکردنی پاڵاوگەیەکی ئەوتۆ، تەنیا کاری دەوڵەتە، نەک کەسانی وەک ئەریکسۆن.

ئەریکسۆن دڵنیای کردەوە کە سەرمایەی پێویستی بەدەستەوەیە، دەوڵەت خاوەنی سەرەکیی دروستکردنی پاڵاوگەکە دەبێت، سەرئەنجام (کۆرتز)، تەلگرافی بۆ ئەڵمانیا

کرد و داوای ئەنجامدانی کارەکەی لێکردن. (بارون نۆردو هۆف) سەرۆکی دەزگای سیخوڕیی گشتاپۆی ئەڵمانیا لە بەرلین، بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لەو پێشهاتە کرد، وەڵامی تەلگرافەکەی دایەوە کە چەندی زووە (ئەریکسۆن) بچێتە بەرلین.

(ئەریکسۆن) بە فڕۆکە چووە بەرلین و لە جانتا دەستییەکەی بەڵگە و قەواڵەی پێویست هەبوو.

ئەو پیاوە کە گەیشتە بەرلین، سەردانی بارون نۆرد و هۆفی کرد، بەڵێنیدا هاوکاری بکات و تا بتوانێت بەرووبوومی نەوتی کۆمپانیای خۆی بە ئەڵمانیا بفرۆشێت. تاکە کارێک کە پێویستبوو ئەریکسۆن ئەنجامی بدات، ئەوەبوو بگەڕێتەوە بۆ ستۆکهۆڵم و چاوەڕوان بێت تا بەرپرسانی وڵاتی ئەڵمانیا پێشنیازەکەی تاووتوێ بکەن.

(ماریان) ژنە سیخوڕی ئەڵمانیا زانیاریی بەسوودی پێبوو، کە هەمووی بۆ ئەریکسۆن بخاتەڕوو. عیشقی ئەو دوو کەسە هەروەک پێشوو بەردەوام بوو، هەرجارێک یەکتریان دەبینی، ڕەنگی ڕوویان دەپەڕی و تەنانەت دەزگای سیخوڕیی بەریتانیاش دەیزانی، کە ئەو دووانە عاشقی یەکترین، بەڵام تا ئەم ساتە باسی ئەو عەشقەیان نەکردووە، تەنیا لە خەیاڵ و مێشکی خۆیاندا پەروەردەیان کردووە.

## تێکچوونی نەخشەکان

ئەریکسۆن بۆ ستۆکهۆڵم گەڕایەوە، ڕاپۆرتی دایە ئەنتلیجێتسی ئەمەریکا، کە پێشنیارەکەی لە جێبەجێکردن دایە. دوو هەفتە بە سستی تێپەڕی، بەڵام هیچ هەواڵێک لە بەرلینەوە نەهات. تا دوانیوەڕۆی ڕۆژێک، (کۆرتز) نوێنەری گشتاپۆ لە سوید، تەلەفۆنی بۆ کرد و وتی: ئالۆو، ئەریک چۆنی؟

– سوپاس باشم. هەواڵی تازە چییە؟

– بۆ ئەوە تەلەفۆنم کرد، چونکە هەواڵێکم بیستووە، کە ئارەزوو دەکەم تۆش بیبیستی.

– چ هەواڵێک؟

(کۆرتز) وەڵامیدایەوە: یەکێک لەو سەرۆک کۆمپانیایانەی ئەڵمانیا، کە گرێبەستی لەگەڵ تۆدا هەیە، واتە (هۆڵتز)، تووشی سەکتەی دڵ بووە و مردووە. پێموابوو تۆش ئارەزوو دەکەیت ئەو هەواڵە ببیستی.

(ئەریکسۆن) بە حەپەسان و نیگەرانییەوە گوشییەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە، بیری کەوتەوە کە یاداشتێکی داوەتە (هۆڵتز) و تێیدا هاوکاریکردنی هاوپەیمانانی پەسەند کردووە، ئەگەر دوای مردن، ئەو کاغەزە بەردەستی هەرکەسێک بکەوێت، هەموو دەزانن (هۆڵتز) (سەرۆکی کۆمپانیای نەوتی...)، هاوکاری (ئەریکسۆن)ی کردووە و ناسنامەکەی ئاشکرادەبێت.

ئەریکسۆن بەناڕەحەتییەوە بابەتەکەی بۆ هاوسەرەکەی باسکردووە، (ئینگرید) وتی: باشە، هەمووشتێک تەواو بووە، تۆ هیچی دیکە ناتوانیت سەفەر بکەیت بۆ ئەڵمانیا.

ئەریکسۆن بەناڕەحەتییەوە وتی: ناتوانم. ئێستا کە تەواوی کارەکان کەوتوونەتە سەرسکە، ناتوانم وازی لێبهێنم. ئەو یاداشتەی داومەتە هۆڵتز، قابیلە لە شوێنێک نەشاردرابێتەوە. چووزانم، لەوانەیە ئەو ڕاسپاردەیەی لە باخێک، یان شوێنێکی دیکە شاردبێتەوە، هەرچۆنێکی بووە، پێویستە بدۆزرێتەوە.

چاوەکانی ئینگرید دەرپەڕین و وتی: گیانەکەم، بەڵام تۆ ناتوانیت بچیت بۆ ئەڵمانیا. نەخێر، سەفەرکردنت زۆر ترسناک دەبێت، ئەوە بۆ سێ ساڵ دەچێت، کە هەفتەی جارێک دەچیتە ئەڵمانیا و وەک پێویست خزمەتت کردووە.

ئەریکسۆن بۆ سەردانیکردنی ماژۆر برادلی و مانسفیڵد ڕۆیشت، بە ڕاوێژ پێکردنیان: بڕیاردرا بچێتە هامبۆرگ و سەرێک لە هاوسەری (هۆڵتز)ی کۆچکردوو بدات و بە هاوکاریی ئەو، تەماشای کاغەز و بەڵگەکانی مێردی ئەو ژنە بکات، بۆ ئەو کارە پارەی پێبدات.

ئەریکسۆن کە هاوسەرەکەی (هۆڵتز)ی دەناسی، بڕیاریدا بەو ژنە بڵێت، لەگەڵ مێردەکەی کارێکی قاچاخییان هەبووە، بەڵگەیەکیان هەیە کە ئەگەر بکەوێتە دەست دەوڵەتی

ئەڵمانیا، بۆ خودی ئەو ژنەش خراپ دەبێت. بۆیە بەیانی ڕۆژی داهاتوو، کەلوپەلەکانی کۆکردووەتەوە، ماڵاوایی لە هاوسەرەکەی کردووە، بەرەو فڕۆکەخانە کەوتەڕێ تا سەفەر بۆ ئەڵمانیا بکات.

## لە گرتووخانەی موبیت

دوای چەند سەعات، فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی تمباریرف نیشتەوە، (ئەریکسۆن) دابەزی و بە تاکسی بەرەو هۆتێلی بەهەشت ڕۆیشت، بەڵام هێشتا هەنگاوی نەهاویشتبووە ناو هۆڵەکەوە، کە لەناکاو کەسێکی مەدەنی لێی نزیکبووەوە، وتی: قوربان کەسێک لە دەرەوە چاوەڕوانت دەکات.

کاتێک ئەریکسۆن سەیری دەموچاوی کەسەکەی کرد، زانی کارمەندی گشتاپۆیە و بەهێمنی لە دەرگاکەوە چووەدەرەوە. ئۆتۆمبێلێکی ڕەش لە دەرەوەی هۆتێلەکە وەستابوو، هەرکە ئەریکسۆن بەرەوپێش چوو، دەرگای ئۆتۆمبێلەکە کرایەوە و دوو پۆلیسی گشتاپۆ هاتوونەتەدەرەوە، هەردوولایان گرتووە و بردوویانەتە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە.

ئەریکسۆن بە دڵێکی لەرزیوەوە پرسی: بۆ کوێم دەبەن؟

– فەرمانمان پێکراوە بتبەین بۆ گرتووخانەی موبیت.

– گرتووخانەی مووبیت؟ ئاخر بۆ؟ چما هیچ ڕوویداوە؟

ئەریکسۆن باش دەیزانی گرتووخانەی موبیت، شوێنێکە کە سیخوڕان و خیانەتکارانی لێ زیندانی دەکەن، زۆرجار ئەشکەنجەیان دەدەن. کەوایە ئینگرید ڕاستیدەکرد: سەرەنجام کەوتبووە داوەوە، دوای کەمێک ئۆتۆمبێلەکە گەیشتە گرتووخانەی موبیت و کەرپووچەکانی ڕووکارەکەی تایبەت بوون. (ئەریکسۆن) بێ ئەوەی نقەی لێوەبێت، لە ژوورێکیان کرد، لە پشتەوە دەرگاکەیان داخست. سەیری دەوروبەری خۆی کرد و جگە لە چەند مێز و کورسییەکی حەسیری، هیچی دیکەی نەبینی. خشەی لێوەنەدەهات، ئەریکسۆن لە پەنجەرە تۆڕدارەکەوە چاوێکی بە دەرەوەدا گێڕا، هەستیکرد لەسەر دیواری گرتووخانەکە دۆشکەی زۆریان داناوە، دوای کەمێک ئەفسەرێک هاتە ناو حەوشەی گرتووخانەکەوە، مەخزەنی بەتاڵی چەکێکی پڕکردەوە لە فیشەک.

ئایا دەیانویست بە بەرچاوی ئەوەوە کەسێک ئەشکەنجەبدەن؟ ئایا دەیانویست بۆ خۆی گوللەباران بکەن، بەڵام چۆن دەکرا بەبێ دادگاییکردن بیکوژن. ئەو خەیاڵانە بەدوای یەکدا بە مێشکیدا گوزەریان کرد، پێیوابوو ئەگەر گومانیان لێکردبێت، تەواو خۆی بێگوناح نیشاندەدات، بەڵام ئەگەر بیانەوێت بێدەنگ بیکوژن بە چ شێوەیەک؟

تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد. هەشت خولەکی مابوو

بۆ دوازدە، هەر ئەو کاتە دەرگاکە کرایەوە و پاسەوانێکی چەکدار هاتەژوورەوە و وتی:

- تکایە لەگەڵمان وەرە.

(ئەریکسۆن) لەسەرخۆ چووە دەرەوە، لە کاتێکدا بەردەوام لەخۆی ڕادەخوڕی، کە هێمن بە پاسەوانەکان چاودێریت دەکەن.

**یەکەی تەقەکردن**

دوای چەند خولەکێک، ئەریکسۆنیان بردە ناو هۆڵی دادگاوە، بە شێوەیەک هەنگاوی دەنا، کە گوایە لە خەودا ڕێدەکات. ژمارەیەک لە سەرۆکانی کۆمپانیاکان لە هۆڵەکە ئامادەبوون، لەسەرخۆ سەری لەقاند و ئەریکسۆن لەڕووی ئاسوودەییەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا. بەرەو لای سەکۆی تەماشاکەرانیان برد و لەناکاو ئەریکسۆن زانیی، کە تۆمەتبار و حوکمدراو نییە، بەڵکو وەک تەماشاکەرێک دەبێت و لەبەرئەوە بۆیە هێناویانەتە هۆڵی دادگا تا دیمەنی دادگاییکردنی ژمارەیەک لە زیندانی سیاسی ببینێت.

دوای ئەوەی هەموو ئامادەبووان لەسەر کورسییەکانیان دانیشتن، ئەریکسۆنیش لەپەنا سەرۆکی کۆمپانیا نەوتییەکان دانیشت، دوای ساتێک دەستپێکردنی دادگاییەکە ڕاگەیەنرا و تۆمەتبارانیان هێنایە ژوورەوە، لەناکاو دڵی ئەریکسۆن

داتەپی، چونکەماریانیش لەناو ئەو ژمارەیەی زیندانییەکاندا، دەبینرێت.

یەکسەر قورگی ئەریکسۆن وشکبوو، سەری گێژی خوارد و بەدیقەتەوە لە ڕوخساری ئەو ژنە ڕاما، بەڵام گومانی تێدانەبوو، کە ئەوە (ماریان) بۆخۆیەتی.

قژی گرژبووە و ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوە و لاواز بووە، ئەریکسۆن زانیی، کە ئەشکەنجەیان داوە و لەسەرخۆ چاوەکانی ئاڕاستەی تێکڕای زیندانییەکان کرد، بەردەوام لە خۆی دەپرسی: ئایا ماریان ئەوی بینیوە یان نا؟ ئایا لەژێر ئەشکەنجەدا ناوی هاوکارانی خۆی ئاشکراکردووە؟ ئەریکسۆن لە ئازار و ئەزیەتی ئەو بیرۆکە نیگەرانکەرەدا بوو، هەرچەند بیری لەوە دەکردەوە، تا ڕێگەیەک بۆ ڕزگاربوون بدۆزێتەوە، نەیدەتوانی. ئایا ئەڵمانییەکان دەیانزانی، ئەریکسۆنیش ناسیاوی ئەو ژنەیە دەیناسێت؟

دادوەر، کە ( ئەفسەرێکی نازی بوو)، بە دەنگی بەرز هاواری کرد: زیندانییەکان بەرنە حەوشەوە.

چەند سەربازێکی چەک بە دەست زیندانیانی جلوبەرگ شڕۆڵیان بردە حەوشەکەوە. هۆڵی دادگاکە بە شێوەیەک درووستکرابوو، دەکرا لە ناوییەوە بەباشی حەوشەکە ببینیت، (ئەریکسۆن) لەسەر کورسییەکەی کەلەکە و کەلەکی کرد، تەماشای دەرەوەی کرد.

زیندانییەکانیان لەپەنا دیوارەکە ڕیزکرد، بۆ ماوەیەکی کەمتر لە چرکەیەک چاوەکانی ئەریکسۆن و ماریان تێک هەڵەنگوتن.

ئەفسەری دادگا لەپشت میکرۆفۆنەکەوە هاواری کرد: دەبێت دوژمنانی ڕایش بمرن. تەقەبکە، چەکەکان لە هاڕژنیاندا و زیندانییەکان بەپشتدا کەوتن، بە لەشی خوێناوییەوە، بەربوونەوە سەر زەوی و ئەفسەری دادگا وتی: بەڕێزان ئەوانە کەسانێک بوون، خیانەتیان لە ئەڵمانیا دەکرد، ئێمە هەموو ئەوانەمان لە شوێنێکی نهێنی دەستگیرکرد، کە لێی کۆببوونەوە و لەبەرئەوە ئێوەمان ئەزیەتدا، چونکە دەزانین دۆستی ئەڵمانیان و ویستمان بە چاوی خۆتان ببینن، کە دوژمنی ئێوە چی بەسەر دێت و هیوادارم ڕازی بووبن.

بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا نەوتییەکان سەریان لەقاند، (ئەریکسۆن) بەناڕەحەتییەوە لە جێگەکەی هەستا و چووەدەرەوە، زانیی لەبەرئەوە هێناویانن تەماشای دیمەنی لەوسێدارەدان بکەن، کە پێشتر ئاشنایەتییان لەگەڵ ماریان و زیندانییەکانی دیکەدا هەبووە، ماریانیش بەو هۆیەوە کە لە حیزبی نیشتمانپەروەران ئەندام بوو، بۆیە دەستگیرکراوە، بە هەمان تاوان (واتە بە تاوانی پشێوی نانەوە) لەسێدارەدرابوو.

پاشان ئەریکسۆن لەو کاتەی، کە لە شەمەندەفەرەکەدا دانیشتبوو، دەچوو بۆ شاری هامبۆرگ، دوا ساتی ژیانی ماریانی بیرکەوتەوە، بیری خۆی هێنایەوە کە ئەو ژنە لە کاتی کەوتن، سەری بەرزکردووەتەوە و تەماشای کردبوو. چەندین سەعات لەناو شەمەندەفەرەکەدا فرمێسک لە چاوەکانی ئەریکسۆن بەخوڕ دادەبارین.

**ترس و ئاشنایی**

شەمەندەفەرەکە وردە وردە لە شاری هامبۆرگ نزیکدەبووەوە و ئەریکسۆن، کە هێشتا مات و سەرگەردان بوو، لەم دیوی شووشەکەوە تەماشای وێرانەکانی شارەکەی دەکرد، ئەو کە یەکەم لەبارەی خیانەتکردنەوە لە ئەڵمانیا نیگەران بوو، لەو کاتەدا نەک تەنیا هەر ئەڵمانیا، بەڵکو نەفرەتی لە تێکڕای بەرپرسانی ئەو وڵاتە دەکرد.

شەمەندەفەرەکە لە وێستگەکە وەستا، ئەریکسۆن دابەزی، بە تاکسی چوو بۆ هۆتێل، ئاوێکی بە خۆیدا کرد، پاشان بەرەو ماڵی خوالێخۆشبوو (هۆڵتز)، ملی ڕێگای گرتەبەر.

(کلارا)ی هاوسەری (هۆڵتز)، بە بینینی ئەریکسۆن زۆر دڵخۆش بوو، لە ڕوخساریدا دیاربوو، کە ئەوەندە بە مردنی مێردەکەی خەمبار نییە، هەڵبەتە ئەو جلوبەرگی تازییەی کە

لەبەریدا بوو، زیاتر لەبەرئەوەبوو سپێتیی لەشی دەربخەن. ئەریکسۆن لە کاتێکدا دەچووە ناو ژووری پێشوازیی ئەو ژنەوە، چاوی بە منداڵێکی دە _دوازدە ساڵە کەوت، کە یونیفۆرمی سەربازانی گشتاپۆی کردبووەبەری، تێگەیشت ئەو کوڕە (هانسی) (کلارا)و (هۆڵتز)ە و تۆقەی لەگەڵ کرد، لەسەر قەنەفەیەک دانیشت و (کلارا) پرسی: ئەریک بارودۆخت چۆنە؟ دەنگوباسی بەرلین؟

ئەریکسۆن دەستی بە قسە کرد، ماوەیەکی زۆر قسەی جۆراوجۆر لەنێوان هەردووکیاندا ئاڵوگۆڕکرا، چەند پەرداخێک مەشرووبیان خواردەوە، سەرەنجام ئەریکسۆن لە کاتێکدا سەیری دەوروبەری دەکرد، وتی: خوایەگیان، زۆر درەنگ بووە. سەعات یەکیش لایداوە. زۆر داوای لێبووردن دەکەم، کە تا ئەم کاتە بوومە چلومل بەسەرتەوە.

(کلارا) لە جێگەکەی هەستا و لە کاتێکدا بزەی لەسەر لێوان بوو، لێی نزیکبووەوە و وتی: نا کەی ئەوە قسەیە تۆ هەرگیز چلومل نیت بەسەر منەوە.

– کلارا وەک ئەوەی کاتی ڕۆیشتن بێت و من...

(کلارا) بە شێوەیەک تەماشای ئەریکسۆنی کرد، دڵی ئەو پیاوە داتەپی و ویستی درێژە بە قسەکانی خۆی بدات، بەڵام (کلارا) ڕێگەی پێنەدا و وتی: ئەمشەو لای ئێمە بمێنەوە.

– ئاخ نەوەڵڵا کلارا. سبەینێ بەیانی دەتبینمەوە. ئەگەر

ئیشکێت بە من بوو، بێ ئەوەی دابمێنیت یان شەرم بکەیت، پێم بڵێ.

- سوپاست دەکەم ئەریک.

(ئەریکسۆن)، کە بۆ مەبەستێکی دیکە چووبووە ئەو ماڵە، وتی:

- بەڕاست ئایا دوای مردنی (هۆڵتز)، هیچ کەسێک تەماشای کاغەز و ئەوراقەکانی کردووە، یان نا؟

(کلارا) سەری لەقاند و وتی: بریکاری مێردەکەم تەلەفۆنی کردووە، بڕیارە تاچەند ڕۆژێکی دیکە بە کاغەز و فایلەکانی مێردەکەمدا بچینەوە.

ئەریکسۆن هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا، چونکە زانیی تا دوو سێ ڕۆژی دیکە کێشەی نابێت و وتی: کلارا، لەوانەیە منیش بتوانم شتێک هاوکاریتان بکەم، ئەگەر بتەوێت لە ڕێکخستنی کاغەز و ئەوراقەکانی مێردەکەت هاوکاریت دەکەم.

- ئەگەر ئەو کارە بکەیت، تا دەمرم مەمنوونت دەبم.

ئەریکسۆن پێکەنی و وتی: لەجیاتی ئەو خزمەتەی دەیکەم، تۆش دەبێت کارێکم بۆ بکەیت. حساباتێک لەنێوان من و خوالێخۆشبوو (هۆڵتز)دا هەبوو، مامەڵەی قاچاخمان دەکرد، کە لەڕووی یاساوە کەمێک بە تاوان ئەژماردەکرا، من بەڵگەیەکم لای مێردەکەی تۆیە و ئێستا دەمەوێت ئەو

بەڵگەیە بسووتێنم، لەجیاتی ئەو پارە قەرزەی مێردەکەی تۆ کە لای منە، بیدەمەوە تۆ.

(کلارا) زەردەیەکی بۆ کرد و چووە پێشتر و لە بەردەم ئەریکسۆن دا وەستا، دەستەکانی کردە ملی. ئەریکسۆن کە دەیزانی ئەو  ژنە ئارەزووی لێیە، داهاتەوە و سەر کوڵمی ڕامووسی و وتی: وا باشترە لە ئێستاوە دەستپێبکەین، ئەو قەباڵە و بەڵگانە بفەوتێنین.

- زۆر باشە. با دەستپێبکەین.

بەڵگەی ونبوو

ئەریکسۆن و (کلارا) چوونە نووسینگەی کاری هۆڵتز و (کلارا) سندوقێکی گەورەی لە چاوەی مێزەکەدا هێنایەدەرەوە، ناوەۆکەکەی کە ئەوراقی جیاجیابوون، ڕۆیکردنە سەر مێزەکە و هەردووکیان بەخێرایی هەڵەوگێڕیان کردن. ئەریکسۆن ناڕاستەوخۆ کلارای تێگەیاندبوو، کە لەگەڵ مێردەکەی دەستیان لە چ کارێکدا هەبووە، ئەگەر حوکومەت بە هەنگاوەکانیان (سیخوڕی) دەزانی، ئێستا (کلارا)شیان دەستگیردەکرد. (کلاراش بەو کارەی زانیوە، بەجیدی خەریکی پشکنینی کاغەزەکان بوو. هەرچەند کە ئەریکسۆن دەیزانی تا ئاستێک ئەو ژنە بە بابەتەکەی زانیوە، لەگەڵ ئەوەشدا زاتی نەدەکرد پێی بڵێت تۆ وازیان لێبهێنە، من بۆخۆم ئیشەکە دەکەم، بەڵام

هەرچەند ئەوان دەگەڕان، کەمتر سەرکەوتوو دەبوون، نەک تەنیا شوێنەوارێک لە بەڵگەکە نەدەبینرا، بەڵکو وەرەقەیەکی زۆریش دیار نەمابوون.

سەرەنجام (کلارا) هەستا و تی: لەوانەیە ئەو وەرەقانەی تۆ بەدوایاندا دەگەڕێیت، لەو سندوقە دابن، کە لە فەرمانگەکەیەتی.

ئەریکسۆن بەپەلە بەرەو تەلەفۆنەکە ڕۆیشت و گوشییەکەی هەڵگرت، تەلەفۆنی بۆ کۆمپانیای نەوتی (هۆڵتز) کرد، کاتێک وەڵامیاندایەوە، وتی: ئالۆو، قوربان من ئەریکسۆنم و لەگەڵ خاتوونی هۆڵتز نیازمان وایە چاوێک بە سندوقی کۆمپانیای ناوبراودا بگێڕین. ئایا دەتوانین؟

- بەڵێ بێگومان، بەڵام کێشەکە ئەوەیە سندوقی کۆمپانیاکە، بردراوە بۆ وەزارەتی وڵات خۆ دەزانیت، ئێستا تێکڕای کۆمپانیاکان، بوونەتە هی حەکومەت و سندوقەکانیش بەڵگەی گرنگیان تێدادەپارێزرێن، بۆ پاراستنیان لە بۆردومانی ئاسمانی، بردوویاننە شوێنێکی ئەمین لە وەزارەتی وڵات.

(ئەریکسۆن) هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا و بەترسەوە سەیری گووشیی تەلەفۆنەکەی کرد، بەردەوام لە دڵی خۆیدا بە خۆی دەوت: ئایا کارمەندانی حوکومەتی ئەڵمانیا ئەو سندوقەیان کردووەتەوە و بەڵگەکانیان دۆزیوەتەوە، یان نا؟

لەناکاو بیرۆکەیەک بە مێشکیدا هات و تێگەیشت تەنیا کەسێک دەتوانێت بچێتە ناو وەزارەتی وڵات و سندوقەکە بکاتەوە، ناوەڕۆکەکەی هەڵەوگێڕبکات، هەمان بریکاری خوالێخۆشبوو (هۆڵتز)ە و هاوسەرەکەی ئیزنی ئەو کارەی پێداوە، بۆیە گووشییەکەی لە شوێنی خۆی داناوەتەوە، گەڕایەوە و لەگەڵ ئەوەی (کلارا) لە ژوورەکەی هاتەدەرەوە، ئەریکسۆن بەپەلە، جارێکی دیکە وەرەقـە و دۆسیێکانی هەڵەوگێڕکرد، پاشان چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا تا لەوانەیە شوێنی نهێنیی بدۆزێتەوە، کە دوورنییە بەڵگەکان لەوێ شاردرابنەوە، بەخێرایی یەک بە یەکی کتێبی ناو دۆلابەکە و تەنانەت چاوێکی بە وێنەی سەر دیوارەکەدا گێڕا، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە، جارێکی دیکە چووەتەوە بۆ لای تەلەفۆنەکە، تەلەفۆنی بۆ کۆمپانیا کرد و کە وەڵامیاندایەوە، داوای لە بەردانگەکەی کرد، کە بە (ئەلدارنست)ی بریکاری (هۆڵتز) بڵێن تەواوی وەرەقەکانی ناو سدوقەکە هەڵبگرێت، بۆی بێنێت، لەجیاتی هەقی ماندوبوونەکەی وەربگرێت.

### عیشق و لەناوچوون

دوای ئەوەی (کلارا) بۆ ژووررری کتێبخانەکە گەڕایەوە، دوو پەرداخ مەشرووب  بە دەستییەکانیەوە دەبینرێت، ئەریکسۆن لە کاتی ویسکی خواردنەوەدا، وتی:

- کلارا من هەوڵدەدەم تا پاشەکەوتییە بانکییەکەی تۆ، بۆ بانکەکانی سوید بگوازمەوە.
(کلارا) سەری لەقاند و وتی: ئەریک تۆ زۆر دڵفراوانیت و من چووزانم بە چ زمانێک لەنوێوە سوپاست بکەم.
(کلارا) دوای تەواوکردنی قسەکەی چووەتەپێشی، داهاتۆتەوە، لێوەکانی خستۆتە سەر لێوی ئەریکسۆن و ماچیکرد، پاشان هەردوو دەستی لە ملی ئاڵاندووە و بە ئامێزی خۆیەوە گوشیوویەتی.
(ئەریکسۆن) بەترسەوە زانیی، کە زێدەڕۆیی زۆری لەو کارەدا کردووە، بەڵام پێش ئەوەی ڕابچڵەکێت، کلارا وتی: ئەریکی خۆشەویستی من، ئێستا بە قەرەواشەکەم دەڵێم، ژووری پێشوازی ڕێکبخات تا تۆ تێیدا بمێنیتەوە، کەلوپەلەکانت لە هۆتێلەوە بهێنیتە ئێرە.
ئەریکسۆن لەسەرخۆ وتی کلارا وا باشترە پەلەنەکەم، من ئەمشەویش لە هۆتێل دەمێنمەوە و لەوانەیە بۆ بەیانی ڕێکیبخەم تا من ...
(کلارا) قسەکەی پێ بڕی و وتی: ئەریک تۆ زۆر سادەیت، بەڵام من ناتوانم تا بەیانی چاوەڕوان بم.
- بەڵام ئاخر...
(کلارا) لە شوێنی خۆی هەستا و لە کتێبخانەکە چووەدەرەوە، تا ژوورەکە بۆ مانەوەی ئەریکسۆن ڕێکبخات.

لە کاتی نانخواردنی ئێوەرەدا، (هانس) کوڕێژگەکەی (کلارا) باسی بەسەرهاتی خۆی کرد، کە لە قوتابخانە بەسەری هاتبوو، کە لە نانخواردن بوونەوە، ئەریکسۆن پەرداخی خۆی و کلارای پڕکرد لە ویسکی و (کلارا) کوڕەکەی ئاگادار کردەوە، کە بچێت بنووێت.

(هانس) لە جێگەی خۆی هەستا و چووە ژوورەکەی خۆی و (کلارا) خۆی هاویشتە ئامێزی ئەریکسۆنەوە و وتی: ئەریک، تۆم خۆشدەوێت و هەرگیز پێموانەبووە، ئەو کاتە بێت.

(ئەریکسۆن) لێوی ئەو ژنەی مژی و پاشان مەوجی ڕادیۆکەی بادا، وێستگەیەک کە مۆسیقای سەمای پەخشدەکرد، کردەوە و هەردووکیان کەوتنە سەما.

کە مۆسیقاکە تەواوبوو، کلارا وتی: ئەریک من دەچم خۆم دەشۆم، وا باشترە تۆش بچیتە ژوورەکەی خۆت و چاوەڕوانی من بیت.

- زۆر باشە.

دوای ڕۆیشتنی ئەو ژنە بۆ گەرماوکردن، ویسکی لە پەرداخەکەی خۆی کرد، جارێک لەسەریەک هەڵیقۆڕاند و پڕی کردەوە. کاتێک (کلارا) بە لەشی تەڕوبڕەوە، کە بۆنی دڵگیری گەرماوی لێدەهات، هاتە ژوورەکەوە، ئەریکسۆن گۆزوگومبەت هەستا و بەرەو کلارا ڕۆیشت و لەئامێزی

گرت.

ئەریکسۆن دەیزانی ئەو عیشقە لەوانەیە بە لەناوچوونی ئەوان کۆتایی بێت، دوورنییە پۆلیسی گشتاپۆ پێی بزانێت، کە ئەو لەگەڵ هاوسەری یەکێک لە سەرۆکەکانی کۆمپانیای نەوتی دەستی تێکەڵکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی لەبەرامبەر تینوویێتی و ئارەزووی ئاگرینی خۆیدا، خۆی بگرێت. کاتێک (کلارا)ی لەباوەش گرت، هەرگیز هەستی نەدەکرد، کە ژنی هاوڕێی خوالێخۆشبووی (ئۆتۆ هۆڵتز) ماچدەکات، بەڵکو ئەو ژنە، ژنێکە ئێستاکانێ بە گڕی عیشقی دەیسووتێنێت. لە نەناسیاوم زیاتر نییە و تەنیا ئارەزەو دەکات غەریزەی خۆی تێربکات. هەر ئەوە و بەس.

### بەڵگەی سیخوڕی

(ئەلدارنست)، بریکاری خوالێخۆش بوو (هۆڵتز)، پیرەمێردێکی سەرسپی بوو، لە سەعات هەشت و سی خولەکی بەیانی ڕۆژی داهاتوو، هاتە ماڵی کلارا و (هانس) ی بچکۆلە بە بینینی زۆر دڵخۆش بوو. بریکاری بەتەمەن پاکەتێکی دایە دەستی (ئەریکسۆن) و وتی: تۆ داواتکردبوو کە وەرەقەکانی ناو سندوقەکەی خوالێخۆش بوو (هۆڵتز) بهێنم، فەرموو. من زۆر بەئەستەم توانیم لە وەزارەتی وڵات

وەریان بگرمەوە.

ئەریکسۆ بەشڵەژاوییەوە پاکەتە گەورەکەی هەڵگرت و پرسی: ئایا کارمەندانی دەوڵـەت تـەماشـای تێکڕای وەرەقەکانی ناو سندوقەکەیان کردووە؟

- نەخێر هەرگیز پۆلیس دەستی نەکردوونەتێ، چونکە یەکەم کلیلی سندوقەکە لای من بوو، دووەم پێویستی نەدەکرد پۆلیس تەماشای وەرەقەکان بکات.

ئەریکسۆن سـەری لەقاند و پێش ئـەوەی پاکەتەکە بکاتەوە، دەستی بۆ باخەڵی برد، بەستەیەک پارەی دەرهێنا و بە بریکارە پیرەکەی دا و وتـی: هیوادارم ئەو پارەیە قەرەبووی ماندووبوونی تۆ بکاتەوە، ئەگەر کەمە، بە بێ لە ڕوودامان پێویستە پێم بڵێیت تا زیاترت پێبدەم.

(ئارنست) بەچاوچنۆکییەوە پارەکانی لە گیرفانی هاویشت و وتی: نەخێر سوپاست دەکەم، ئەو پارەیە قەرەبووی ئەو خەرجییانە دەکاتـەوە، کە لە ڕێگەی وەرگرتنەوەی ئەو وەرەقانە داومە.

بریکارەکە دوای تەواوکردنی قسەکانی ماڵاوایی کردووە، لە ماڵەکە چووەتە دەرەوە و دوای ڕۆیشتنی، ئەریکسۆن بەپەلە سەری پاکەتەکەی کردەوە، ئەوەی تێیدابوو لەسەر مێزەکەی دانا. ئەو بەڵگەیەی بە خەتی خۆی نووسیوویەتی و تێیدا پشتڕاستکرابووەوە، کە (هۆڵتز) سیخوڕی بۆ

هاوپەیمانان دەکات، لەسەر هەموو وەرەقەکانەوە بوو، لە پاکەتێکی گچەکەدا کە ئەریکسۆن بە دەستییەوە گرتبوو، تەماشای مەرەکەبی مۆرەکەی کرد، کاتێک دڵنیابوو هیچ کەس نەیکردووەتەوە، هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا و لەسەر قەنەفەکە دانیشت.

لەم کاتەدا (کلارا) هاتە ژوورەوە و پرسیی: ئایا ئەو کاغەزانەت دەستکەوت، کە دەتویستن؟

- بەڵێ کلارا، مەمنوونم. ئێستا دەبێت بڕۆم، چونکە کارێکی گرنگم هەیە، بەڵام دووبارە دێمەوە بۆ سەردانت و ئەگەر ناچاربووم زووتر ئەو شارە بەجێبهێڵم، نامەت بۆ دەنووسم.

هەرچەندی کلارا پێیداگرت، کە ئەریکسۆن ئەو شەوە لە ماڵی ئەو بمێنێتەوە و نەڕوات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوە ڕازی نەبوو. دوای ماڵاواییکردنێکی گەرم، بەستەیەک پارەی بە (کلارا) دا و ڕێوڕاست بۆ هۆتێل گەڕایەوە.

### چۆن هیملەر کەوتە داوەوە

ئەریکسۆن بە پێچەوانەی قسەیەک، کە بۆ (کلارا)ی کرد، ئەو شەوە بەندەری هامبۆرگی بەجێهێشت، چونکە نەیتوانی پێش ڕۆیشتنی سەردانی هاوکارە ئەڵمانییەکانی خۆی بکات، لەبەرئەوە شەوی لە هۆتێل بەسەربرد و بۆ بەیانی ڕۆژی

داهاتوو، سەردانی یەک بە یەکی ئەو کەسانەی کرد، کە لە ئەڵمانیا سیخوڕییان بۆ دەکرد، ئەو زانیارییانەی لەبارەی کۆمپانیا نەوتییەکانەوە دەستەبەریان کردبوو، بیستی و خستییە مێشکییەوە، پاشان بە شەمەندەفەر بەرەو بەرلین کەوتەڕێ.

***

بەیانی ڕۆژی داهاتوو، (بارون نۆرد هۆف) سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی گشتاپۆ بە (ئەریکسۆن)ی وت، کە حوکومەتی ئەڵمانیا هێشتا لەبارەی پێشنیازەکەیەوە سەبارەت بە کڕینی نەوتی خاو لە سوید، هیچ بڕیارێکی نەداوە و بەردەوام بوو، جەنابی ئەریکسۆن پێویستە تۆ بۆ ماوەیەکی نادیار چاوەڕوان بیت، تا لە بڕیاری حوکومەت ئاگاداربیت، چونکە ئەریکسۆن هیچ کارێکی لەو وڵاتەدا نەمابوو، بە فڕۆکە بەرەو ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید کەوتەڕێ و ڕۆیشتەوە ماڵی خۆی.

دوای هەفتەیەک، (کۆرتز) نوێنەری دەزگای هەواڵگریی گشتاپۆ لە سوید، تەلەفۆنی بۆ ئەریکسۆن کردووە و وتی: گوێ بگرە ئەریک، هەواڵێکی خۆشم بۆ تۆ پێیە، پێویستە چەندی زووە بێیت بۆ ئێرە.

ئەریکسۆن دەستبەجێ بە تاکسی چووەتە فەرمانگەی گشتاپۆ و لە نووسینگەی کۆرتز، بە ژوور کەوت.

نوێنەری گشتاپۆ، هەرکە بینی لە شوێنی خۆی هەستا و وتی: ئەریکسۆن هەواڵی خۆشی من ئەوەیە، کە بەڕێز (هیملەر)، سەرۆکی گشتیی دەزگای گشتاپۆ، بۆخۆی لەبارەی خستنەگەڕی پاڵاوگە و کڕینی نەوتی خاو لە تۆ، دەغلی کردووە و دەیەوێت لەگەڵ تۆ قسەبکات. پێویستە دووبەیانی لە بەرلین بیت تابتوانیت لە کاتی خۆیدا چاوت پێی بکەوێت.

- زۆر باشە.

(کۆرتز) بەردەوام بوو: تەواو ڕوون و ئاشکرایە، کە بەڕێز (هیملەر) لەبەرئەوە دەیەوێت لەگەڵ تۆ گفتوگۆبکات، چونکە ڕەزامەندییان لەسەر ئەو مامەڵەیە دەربڕیوە.

***

کاتێک بۆ ڕۆژی داهاتوو فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی تمپلهۆفی بەرلین نیشتەوە، ئەریکسۆن تێگەیشت، چونکە تەنیا بۆ چاوپێکەوتنی (هیملەر) سەفەری کردووە، بۆ ئەو وڵاتە چووە. بۆیە وەک میوانێکی فەرمی پێشوازی لێدەکرێت، بارون نۆردو هۆف و دکتۆر نیکمان (بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوتی نیکمان)، لە فڕۆکەخانە چاوەڕوانی بوون و ئەویان بۆ هۆتێلی (ئەسپیلاناد) برد. لە تەواوی بارودۆخەکە بە شێوەیەکی شاهانە پێشوازی لە ئەریکسۆن دەکرا، ئەو شەوە توانیی بەوپەڕی مێشکی ئاسوودەوە لە

هۆتێل (ئەسپیلاناد) بنوێت. بۆ بەیانی ڕۆژی داهاتوو، دوو کارمەندی گشتاپۆ چوونە لای (ئەریکسۆن) و ئەویان بۆ باڵەخانەی فەرمانگەی گشتاپۆ و نووسینگەی (هیملەر) برد.

پاسەوانە ڕەشپۆشەکان، کە لە بەردەم دەرگای هیملەر وەستابوون، سەرەتا ئەویان پشکنی و پاش پێشوازیی سەرەتایی، سەرەنجام ئیزنی چوونەژوورەوەی بۆ ژووری هیملەر پێدرا.

(هیملەر) لەپشت مێزێکی گەورە لەسەرووی ژوورەکە دانیشتووە، یونیفۆرمێکی ڕەنگڕەشی لەبەردابوو، بەبێ ئەوەی لە جێگەی خۆی بجوولێت، وتی: بەخێربێیت جەنابی ئەریکسۆن، ئێمە تەنیا جارێک لە میوانداریيەک یەکتریمان بینیوە، بەڵام من لە کارکەرانی کۆمپانیاکانم بیستووە، کە تۆ پیاوێکی زۆر خوێنگەرم، بەئەدەب، کارای و ئەوە دەبێتەهۆی خۆشحاڵیی ئەڵمانیا، کە لەگەڵ پیاوێکی وەک تۆ مامەڵەی نەوت ئەنجامدەدەین، فەرموو دابنیشە.

ئەریکسۆن بۆ ڕێزگرتن چەماوەتەوە و بەرەوپێش چووە، ئینجا لەسەر کورسییەکی گەورە، کە (هیملەر) فەرمووی کردبوو، دانیشت و دەستی بە قسەکردن کردووە، بۆ ماوەی چەند خولەکێک لەبارەی بابەتی مامەڵەی نەوت گفتوگۆیان کرد. چەندجارێک قسەکانیان بەهۆی زەنگی تەلەفۆنەوە پچڕا، بەڵام (هیملەر) بەبێ ئەوەی هەر گوێی

پێبدات، بەردەوام قسەی دەکرد، هەندێک جار لەبارەی بارودۆخی ئابوورییەوە و هەندێک کاتی دیکە لەبارەی چەکی نوێوە. باسی ئەو داهێنانەیان دەکرد، کە لە چاو تروکانێکدا دوژمنی تارومارردەکرد و بڕیاربوو ئەڵمانیا زۆر زوو سوودی لێ وەربگرێت (ئەو چەکە جگە لە بۆمبی ئەتۆمی هیچی دیکە نەبوو، وڵاتی ئەڵمانیا هەرگیز نەیتوانی سوودی لێ وەربگرێت، چونکە پێش تەواوکردنی بۆمبەکە، ئەو وڵاتە شکستیخوارد)

سەرەنجام کاتێک دووبارە قسەی نەوت هاتەوەگۆڕێ، ئەریکسۆن هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا و وتی: قوربان، من بڕیارم داوە لەگەڵ وڵاتەکەی خۆم وەبەرهێنان بکەم، پاڵاوگەیەکی گەورە دروستبکەین و هەڵبەتە ئەو کارە قازانجی زۆرە، من دەمەوێت پێش دەستکردن بە دروستکردنی ئەو پاڵاوگەیە، لەگەڵ یەکەم مشتەریی خۆم، واتە ئەڵمانیا گرێبەست واژۆبکەم، تا مێشکم لەبارەی فرۆشتنی نەوتەوە ئاسوودەبێت.

(هیملەر) سەری لەقاند، ڕەزامەندیی خۆی ڕاگەیاند، پاش ئەوە گفتوگۆیەکی زۆریان کرد، هیملەر لەبارەی جوولەکەوە پرسیاری لە ئەریکسۆن کرد، باسی زۆر بابەتی دیکە کرا کە نووسینەوەیان لێرەدا دەبێتەهۆی ماندوبوونی خوێنەران و سەرەنجام دوای سێ سەعات، دووگمەی تەلەفۆنی سەر

مێزەکەی داگرت و بارون نۆردو هۆفی بانگکرد، فەرمانی پێکرد کە چەندی زووە دۆسیەی تێپەڕینی تایبەتی بە ئەریکسۆن بدرێت تا بتوانێت، بۆ تەواوی شوێنەکانی ئەڵمانیا هاتوچۆبکات، بارودۆخی ئەو وڵاتە، (بەتایبەت پاڵاوگەکان) لە نزیکەوە ببینێت، کەموکوڕییەکانیان بنووسێت. تا پاشان بتوانێت پاڵاوگەیەکی گەورە لەسەر بنچینەی دواشێواز دروستبکات، نەوت و بەنزین بە ئەڵمانیا بفرۆشێت.

## چۆنچۆنی، دەزگای دژەسیخوڕیی ئەڵمانیا چالاکی دەکات

(ئەریکسۆن) دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لەگەڵ بارون (نۆردو هۆف) سەری لەچەند پاڵاوگەیەکی تازە دروستکراو دا، چاوی بە هەموواندا گێڕاو هەرچییەکی دەبینی، بە دیقەتەوە بە مێشکی دەسپارد.

ئەریکسۆن لەو ڕۆژە بەدواوە دەچووە هەرشوێنێک، هەستیدەکرد کەسێک چاودێری دەکات و تەنانەت چەندین جاریش، کە بۆ هۆتێلەکەی خۆی گەڕایەوە، هەستیکرد کەلوپەلەکانی بەسەریەکدا دراوە و ئەوە نیشانیدەدات، یان حوکومەتی ئەڵمانیا گومانی لێی هەیە و یان کارمەندانی دەزگای هەواڵگریی گشتاپۆ، بۆ زیاتر دڵنیابوون، لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکەن.

ئەریکسۆن (کە ئێستا ڤیزای هاتوچۆی تایبەتی

شەخسی هیملەری پێبوو)، دەچووە هەر شارێک چاودێری دەکرا، لەو کارە زۆر تووڕەبووە، دەترسا لەگەڵ هەموو سیخوڕان و کارمەندانی نهێنیی هاوپەیمانان، کە لە ئەڵمانیا دەژیان( ئەو ناوونیشانەکانیانی دەزانی)، پەیوەندی بکات و ئەو زانیارییەی دەستەبەری کردووە، پێیان بدات تا تەلەفۆن بۆ بەریتانیا، یان ئەمەریکا بکەن، چونکە دەچووە هەرشوێنێک، کەسێکی نەناسیاو و گوماناوی چاودێری دەکرد، (ئەریکسۆن) ئەمینترین چارەسەری لەوەدا بینی، کە تەلەفۆن بۆ چەند کارمەندێکی هاوپەیمانان بکات و بە توبێژی ڕەمزی لەگەڵیان، وادەی چاوپێکەوتن لە شوێنی یانەی شەوانە دابنێت. کاتێک دەچووە یانەیەکی شەوانە، چاودێریکاری گوماناوی، لە دەرەوە لە بەردەم دەرگاکە چاوەڕوانی دەکات، نەیدەزانی کە ئەریکسۆن لەناو ئەو خانووە خراپە، چاوی بە تەواوی هاوکارانی کەوتووە و ڕاپۆرتی ئاڵوگۆڕدەکرد.

***

شەوێک شتێک ڕوویدا، ئەریکسۆنی تووشی ترسولەرز و دوودڵی کرد، بەو مانایە کە چاوی بە کەسێک کەوت پێیوابوو پێش چەند ساڵێک مردووە، مەسەلەکە بەم شێوەیە بوو، شەوێک ئەریکسۆن لە شەقامێکی قەرەباڵغی (لیپ زیک)ی ئەڵمانیا پیاسەی دەکرد، چاودێریکاری گوماناوییش

بە مەودایەکی دیاریکراو بەدوای دەکەوت. ئەریکسۆن تازە لە سەردانیکردنی پالاوگەی (بوهلن) هاتووەتەوە و بە شەقامەکاندا پیاسەی دەکرد، بە داخ و پەژارەوە تەماشای باڵەخانە وێرانبووەکانی شارەکەی دەکرد کە لەناکاو دەنگێک لە پشتییەوە هات و وتی: ئاخ ئەوە تۆی ئەریکسۆن؟ چ بەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراوە.

(ئەریکسۆن) خێرا گەڕایەوە و چاوی بە پیاوێکی چوارشانە کەوت، کە بەرەوڕووی وەستابوو، بەزەحمەت بەری بە حەپەسان و ترسی خۆی گرت، بزەیەکی کرد و وتی: خوایە گیان، ئەوە (فرانز شرۆیدەر)ە.

(شرۆیدەر) ڕۆژانی پێش شەڕ چەندین جار لەگەڵ ئەریکسۆن مامەڵە و ئاڵوگۆڕی نەوتی ئەنجامداوە، بە ئەڵمانییەکی دەمارگیر ئەژماردەکرا. هەرگیز نێوان ئەو دووانە گەرموگوڕ نەبووە و ساڵانێکە ئەریکسۆن ئەو پیاوەی نەدیتبوو، کە لە کاتی شەڕدا کوژراوە.

(شرۆیدەر) بەگومانەوە وتی: ئەریکسۆن تۆ لێرە چ دەکەیت؟ من مەبەستم بوو بۆ تاران بچم و چاوەڕوان بووم تۆ لە شوێنێکی ئەو شارە ببینم، کە بۆ کۆمپانیاکانی نەوتی ستاندارد و تەکساس کاری قاچاخ دەکەیت، هاوڕێ پێم بڵێ تۆ لە ئەڵمانیا چ کارێک دەکەیت؟

ئەریکسۆن پێکەنی و ئاخێکی هەڵکێشا و وتی:

بەسەرهاتێکی دوورودرێژی هەیە. ئێستا کە هەردووکمان مەرامێکمان هەیە و نازیین، پێویست بەوە ناکات ڕقمان لە یەکتری ببێتەوە. وەرە با بڕۆین (شرۆیدەر) پەرداخێک مەشرووب بخۆینەوە، من بەسەرهاتی خۆمت بۆ باسبکەم.

(شرۆیدەر) سەری لەقاند و وتی زۆر باشە. با بڕۆین، بەڵام من پێم سەیرە تۆ چۆن گۆڕاوی. ئێمە پێشتر بۆیە ناکۆکیکمان هەبوو، کە تۆ لایەنگریی ئەمەریکات دەکرد، من ئەڵمانیا، بەڵام ئێستا دژی ئەمەریکا کاردەکەیت و ئایا ئەوە سەیرنییە؟

هەردووکیان چوونە ناو ڕیستۆرانتێکەوە و ئەریکسۆن لەپشت شووشەکەوە ئەو پیاوەی بینی، کە لە هەمووشوێنێک چاودێری دەکرد.

گارسۆن مەشرووبەکەی بۆ بردنە سەر مێزەکە و ئەریکسۆن لە شرۆیدەری پرسی، بە چییەوە خەریکە و لەکوێ دەژی، شرۆیدەریش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە.

ئەریکسۆن لەبەرئەوە ترسی لەو پیاوەی هەبوو، کە پێش ساڵانێک دژی ئەڵمانیا کاری دەکرد و بە دەستپێکردنی شەڕ، تەواوی مامەڵەکانی خۆی لەگەڵ ئەو وڵاتە تێکدابوو، ئەگەر (شرۆیدەر) دەیزانی دووبارە کار بۆ ئەڵمانیا دەکات، تەنانەت سەردانی پاڵاوگەکانی ئەوێ دەکات، بێگومان

یەکسەر تێدەگەیشت کە لەژێر کاسەکەدا نیوە کاسەیەک هەیە، چونکە ئەریکسۆن بۆخۆی دەچێتە ناو کاری نەوت و خستنەگەڕی پاڵاوگەکان و پێویست بەوە ناکات سەردانی هەموو پاڵاوگەکانی ئەڵمانیا بکات، بێگومان دەیزانی ئەو سیخوڕە و کەسێک کە شوێنی پاڵاوگەکان دەداتە هاوپەیمانان، خودی ئەریکسۆنە.

لە کاتی نۆشکردنی مەشرووب، (شرۆیدەر) ئەوەندە پەیجووری کرد، کە ئەریکسۆن ناچاربوو هەمووشتێک بڵێت و ڕایگەیاندبوو شرۆیدەر دەزانی من بازرگانێکم، بازرگانیش زۆر لە دوورەوە بۆنی پارە دەکات. من ئێستا لەگەڵ ئەڵمانیا کاردەکەم، سەرەڕای ئەوەی نازیم، لەگەڵ ئەو وڵاتەش گرێبەستم کردووە، کە نەوتی پێویست دابینبکەم.

(شرۆیدەر) سەری لەقاند و هەردووکیان لە ڕیستۆرانتەکە هاتنەدەرەوە، کاتێک گەیشتنە شەقامەکە، ماڵاوایی کردووە، وادەی یەکتربینینەوەیان داناوە، لە یەکتری جیابوونەوە.

ئەریکسۆن دوای ڕۆیشتنی ئەو پیاوە، دڵنیابوو کە بێگومان گومانی کردووە، ڕاپۆرت دەداتە پۆلیسی گشتاپۆ و پێویستە چەندی زووترە بەر بەو کارە بگیردرێت. بۆیە خێرا چووە ناو ڕیستۆرانتەکەوە، لەژێر چاوانەوە بینیی، کە دیسانەوە چاودێریکاریی گوماناوی لە بەر دەرگاکە

وەستاوە.

ئەریکسۆن بەهێواشی بەرەو دەرگای سەرەکیی ڕیستۆرانتەکە چووە، بێئەوەی سەرنجی چاودێریکار ڕابکێشێت، چووەتە دەرەوە و بۆ کۆلانێک بایداوەتەوە و خێرا ڕایکرد، دوای خولەکێک کۆلانەکەی بەجێهێشتووە و پێی ناوەتە سەر شەقامەکە. نە شوێنەوارێک لە ڕیستۆرانتەکە دەبینرێت، نە چاودێریکار، بەهۆی بوونی چوار ڕیانێک و کۆلانێکی تەسک، ئەریکسۆن ڕیستۆرانتەکەی بەجێهێشتبوو لەجیاتی، (شرۆیدەر)، کە بەخێرایی لە پیادەڕەوەکە دەڕۆیشت دەبینرێت، (ئەریکسۆن) لەوپەڕی ترسدا زانی ئەو پیاوە بە ڕێگایەکدا دەڕوات، کە بە دەزگای گشتاپۆ کۆتایی دێت. بۆیە لەسەرخۆ چاودێری کرد، چاوەڕوانی کوشتنی بوو. بیرۆکەی کوشتنی مرۆڤ، جەستەی ئەریکسۆنی بەلەرز خست، بەلام تێگەیشت هیچ چارەیەکی دیکەی نییە.

هەروەک (شرۆیدەر) بەرەوپێش دەچوو، لەناکاو لە بەردەم کابینەی تەلەفۆنێک وەستا و دوای کەمێک بیرکردنەوە، چووە ژوورەوە و ئەریکسۆن لە پیادەڕەوەکەی بەرامبەرەوە ڕایکردووەتە لایەکەی دیکە، خۆی گەیاندە کابینەی تەلەفۆنەکە و گوێی لێ بوو، کە (شرۆیدەر) لە گووشییەکەدا دەڵێت ئالۆو ئالۆ و نۆرد هۆف... گوێ بگرە، من هەر ئێستا سەردانت دەکەم و بۆیە تەلەفۆنم کرد وتم

نەکات بڕوات. بابەتێکی زۆر گرنگە... بەڵێ، سەبارەت بە پیاوێکە کە من دڵنیام سیخوڕی دوژمنە، بەڵێ.. هەر ئێستا دێم.

لەوکاتەدا ئەریکسۆن سەیرێکی دەوروبەری کرد، چونکە دنیا تاریکبوو، کەس لەو دەوروبەرەی نەدەبینرا، بۆیە لەسەرخۆ دەستی لە گیرفانی ڕۆکردووە و چەقۆیەکی گەورەی دوگمەداری دەرهێنا و بە داگرتنی دوگمەکەی، نوکێکی درەوشاوە و درێژ درێژدەرپەڕی و ئەریکسۆن وەک تیسکەی تفەنگ، شۆقاوی بۆ پێشەوە هاویشتووە، دەرگای کابینەی تەلەفۆنەکەی کردەوە و چەقۆکەی لە پشتەملی (شرۆیدەر) ڕۆکرد، دەریهێنایەوە و چەقۆیەکی دیکەیشی لە گازەرای پشتی دا.

(شرۆیدەر) تەنانەت بەبێ ئەوەی نووزەیەکی لێوەبێت، بە لەشی خوێناوییەوە بە پێشدا کەوت، کەوتە باوەشی ئەریکسۆنەوە و دەستەکانی ڕاوەشاند. ئەریکسۆن چەقۆکەی هەڵبڕی تا زەربەی دیکەی لێبدات، بەڵام هەمان کات دەنگێک لەناو تاریکییەکەوە هەستا و پیاوێک وتی: ئایا هیچ ڕوویداوە؟

یەکسەر دڵی ئەریکسۆن داتەپی و سەری گێژی خوارد، چونکە لەژێر چاوانەوە هەستیکرد، کە پۆلیسێکی بەتەمەن چەند هەنگاوێک دوورتر لە کابینەی تەلەفۆنەکە وەستاوە،

لە تاریکییەکەوە تەماشایان دەکات.

ئەریکسۆن خێرا چەقۆکەی خستە ناو گیرفانی شرۆیدەرەوە، سەری بردە پێش و لەناو گووشیی تەلەفۆنەکەدا وتی: داوای لێبوردن دەکەم مارین، خولەکێک چاوەڕوان بکە.

ئەریکسۆن لە کاتی قسەکردندا، بە دەستی ڕاستی خۆی، کە لە ملی (شرۆیدەر)ی هاڵاندبوو، هەوڵیدا تین بداتە قولابی دەرگای تەلەفۆنەکە، پەیوەندییەکە بپچڕێنێت، واتە بڕینی پەیوەندییەکە لەگەڵ دەزگای گشتاپۆ، گووشییەکەی بە دەستی چەپ گرتووە، بەپێکەنینەوە بە پۆلیسە بەتەمەنەکەی وت: ئاخ قوربان هیچ نەبووە تەنیا ئەو هاوڕێیەی من زۆری خواردووەتەوە و دەیەوێت تەلەفۆن بۆ هاوسەرەکەی بکات، بڵێت ئەمشەو ناتوانێت بچێتەوە ماڵەوە. پۆلیسەکە سەری ڕاوەشاند و بەبێ ئەوەی هەست بکات پیاوەمەستەکە، جگە لە جەستەیەکی شەڵاڵی خوێن هیچی دیکە نییە، (چونکە ئەریکسۆن بە شێوەیەک لە بەر دەرگای کابینەکە وەستابوو، نەیدەهێشێت جەستەکە بەتەواوی ببینرێت) لەسەرخۆ پرسیی: دەتوانم هیچ یارمەتییەکت بدەم؟

ئەریکسۆن وەڵامیدایەوە: نەخێر، سوپاست دەکەم. بۆخۆم دەتوانم بیبەمەوە ماڵەوە.

– هاوڕێیەکی دڵسۆزیت.

ئەریکسۆن لەپی دەستی چەپی لەسەر تەلەفۆنەکە دانا و وتی: ئالۆو، مارلین منداڵەکان چۆنن؟ من هەر ئێستا (گریدا) دەهێنمەوە. بەڵێ... بەڵێ دیسانەوە کەمێک مەست بووە. هیچ نییە. ئەریکسۆن دوای تەواوکردنی قسەکانی گووشییەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە، پۆلیس لە کاتێکدا سەری بەخەمبارییەوە ڕادەوەشاند، دوورکەوتەوە و دوای کەمێک، لەسەر پێچی شەقامەکە لەبەرچاوان ونبوو، ئەریکسۆن وەک برووسکە چەقۆکەی لە گیرفانی شرۆیدەردا دەرهێنا و بەرزیکردووەتەوە، جارێکی دیکە نووکەکەی لە سینگی (شرۆیدەر)، کە هێشتاش کەمێک دەجوولا، ڕۆکرد و چەند جارێک دووبارەی کردەوە، دوای ئەوەی بەتەواوی لە مردنی ئەو پیاوە دڵنیابوو، جەستەکەی فڕێداوەتە سەر زەوی و بە ڕاکەڕاک، وەک کەسێک ماخولیای کەوتبێتە لەشییەوە، بەرەو شەقامی (هۆڵتین) ڕۆیشت، کاتێک لە هێڵی ئاسن نزیکبووەوە، دەستەکانی لەژێر بەلوعەیەکدا شووشت و زانیی، کە پێویستە چەندی زووە ئەڵمانیا بەجێ بهێڵێت، چونکە پۆلیس گومانی لێدەکات و بەدوایدا دەگەڕێن.

**داوەکە دادەخرێت**

ئەریکسۆن هەر ئەو شەوە، بە یەکەم شەمەندەفەر

شارەکەی بەجێهێشت. لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە هەستی کردبوو، کە چاودێریکارەکە (کارمەندی گشتاپۆ)، لە قووژبنێک وەستاوە و چاودێری دەکات. بەردەوام لە خۆی دەپرسی، ئایا نەیدەتوانی بە شێوازێکی دیکە کاربکات؟ نەیدەتوانی ئەو پیاوە نەکوژێت؟ ئایا کوژراوەکەش ژن و منداڵی هەیە، یان نا؟

ئەریکسۆن خۆشحاڵ بوو بەوەی ئەو بابەتە نازانێت، لە خۆی ڕادەخوڕی، کە کوشتنی ئەو پیاوە پێویستبوو.

کاتێک ئەو بیرۆکەیە مێشکی هەراسان کردبوو، لەناکاو فیکەی شەمەندەفەرەکە لێدرا و پێش ئەوەی موسافیرەکان بزانن چی ڕوویداوە، دەنگێکی گوێکەڕکەر هەستا و فڕۆکەی هاوپەیمانان لە ئاسماندا بینران، ئەو فڕۆکەی بەسەر ئاسمانی شەمەندەفەرەکەدا تێدەپەڕی، ناپاڵمی بەردەدایەوە.

شەمەدەفەرەکە هەڵگەڕایەوە و دەنگی گریانی ژن و منداڵەکان هەستاو زۆربەی موسافیرەکان کوژران و بەڵایەکی وەهایان بەسەردا هاتبوو، کە (ئەریکسۆن) ئەوەی بە ڕۆژە لەبیرنەکراوەکانی تەمەنی خۆی زانی، بە ئاستێک بە بینینی دیمەنی ئەو کوشتارە دڵتەزێنە ناڕەحەت بوو، کە پاشان لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا بۆ دەزگای سیخوڕیی بەریتانیا نووسی: هەرگیز پێویستی بە کوشتارێکی وەهای نەدەکرد، پێویستە فڕۆکەکان تەنیا هێرش بکەنەسەر سەنگەرەکانی

سوپا، نەک خەڵکی سڤیل بکوژن.

کاتێک شەمەندەفەرەکە ئاوەژووبووەوە، ئەریکسۆن خۆی لە شووشەکەوە هەڵدایە خوارەوە و توانیی ڕزگاری بێت. ناوونیشانی وردی پاڵاوگەکان و تاقیگەکانی لە مێشکیدا ماوەتەوە، هەوڵیدەدا لەبیری نەکات، کە تۆپە تەیارە شکێنەکانی ئەڵمانیا لە چ شوێنێک دانراون، یان کارگەی درووستکردنی چەک کەوتوونەتە کوێوە.

***

ئەریکسۆن لەوێوە بۆ (بەرلین) ڕۆیشت و ڕاستەوخۆ سەردانی دەزگای گشتاپۆی کرد، و چووە نووسینگەی کاری بارون نۆدر هۆف. دەیزانی تا ئێستا پۆلیس بە تاوان و سیخوڕییەکەیانی نەزانیوە و بە بارون نۆدر هۆفی وت، کە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ستۆکهۆڵم و کارەکانی کۆمپانیای نەوتی خۆی بکات.

دەستبەجێ ڤیزای بۆ واژۆکرا و ئەریکسۆن تەلگرافێکی بۆ پرنس کارڵ کرد، جووڵانی خۆی ڕاگەیاند.

ئەریکسۆن دەیزانی ئەرکەکەی بە گەڕانەوەی بۆ سوید کۆتایی پێدێت، فڕۆکەکانی هاوپەیمانان بە بۆردومانکردنی تێکڕای پاڵاوگە تازەدرووستکراوەکان، شکستێکی گەورە بەسەر ئەڵمانیادا دێنن.

بۆ بەیانی بە یەکەم فڕۆکە بەرەو ستۆکهۆڵم فڕی

و له فڕۆکەخانەی ئەو شارە، ژمارەیەک لە کارمەندانی ئەنتلیجیتسی هەواڵگریی ئەمەریکا و بەریتانیا و هەروەها پرنس کارڵ چاوەڕوانی بوون، هەموویان بەیەکەوە چوونە ماڵی ئەریکسۆن. ئەریکسۆن تەواوی ڕاپۆرتەکانی خۆی ڕادەستی ماژۆر (برادلی) کرد، برادلیش ڕاپۆرتەکانی کردە فایلیک و بۆ ئەمەریکای نارد، دەقی ئەو فایلە بەم جۆرەی لای خوارەوەیە:

ڕاپۆرتەکەی ئەریک ئەریکسۆن دەربارەی پاڵاوگەکان و بارودۆخی ناوخۆی ئەڵمانیا، پاڵاوگەکانی شاری (ئەندۆف) لە نویێ چاککراونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پاڵاوگەیەکی گەورە لە ناوچەی باکوور، چواردە کیلۆمەتر دوورتر لە شارەکە، درووستکراوە و ئامادەیە بۆ بەکارهێنان. لە نەخشەی پاشکۆکە شوێنی دەقیقی ئەو پاڵاوگەیە دەستنیشانکراوە.

لە 75%ی پاڵاوگەکانی لیۆناوهیل و مرسبۆرگ تێکوپێکدراون و حوکومەت بڕیاریداوە چاکیان بکاتەوە. هێرشکردنەسەری زۆر بەسوودە و ورەی ئەڵمانیای لەرزۆک کردووە.

لۆتز کۆندرۆف: لە پەلامارەکەی ئەو دوایییەی هاوپەیمانان، شەست هەزار بۆمب بەسەر ئەو شارەدا بەردراوەتەوە، کارگەی بەرهەمهێنانی ئەوێی لەگەڵ زەوی تەختکردووە، زیانەلێکەوتووەکانیان بە شێوەیەکن، کە

بەکەڵکی چاککردنەوە نایەن....

(ڕاپۆرتێکی دیکەش لێرەدا زیادکراوە، کە خۆ لە تۆمارکردنیان دەپارێزرێت، چونکە دەبێتەهۆی بێزاریی خوێنەران)

**ئەنجامی ئەرکەکە**

پاشان فڕۆکە شەڕکەرە ئەمەریکییەکان، بەباشی سوودیان لە نەخشەکەی ئەریکسۆن وەرگرت و هێرشیان کردەسەر چاڵەنەوتییەکانی ئەڵمانیا.

پاڵاوگەکانی ئەڵمانیا بە هاتنی پاییز، دوو ئەوەندەی پێشوویان بەرهەمهێنراوەکانیان زیادکرد، بەڵام ئەڵمانیا ڕۆژ بە ڕۆژ پاشەکشەی دەکرد، چۆکی دادەدا. سوپاکانی ئەڵمانیا زەبوونانە هەوڵیاندەدا لە بەرەی خۆرئاوا خۆیان بگرن و هیتلەر دیسانەوە هیوای هەبوو، سەبارەت بە داهاتووی وڵاتەکەی گەشبینبوو. نەخشەی هیتلەر ئەوەبوو کە قەناعەت بە هێزەککانی خۆرئاوا بکات، هەرگیز ئەوان ناتوانن ئەڵمانیای نازی تێکبشکێنن و بە چۆکی دابێنن.

لە 16ی کانونی یەکەمی 1944، هیتلەر بەڵێنی بە جەنەراڵەکانی خۆیدا، کە بەنزینی پێویست بۆ فڕینی دووری سێسەد میل ئامادەبکات.

بە مێژووی 8ی حوزەیران، ئەڵمانییەکان ناچاربوون

پاشەکشەبکەن. لەو کاتەدا ئایزنهاوەر بڕیاری بۆردومانکردنی ناوچە نەوتییەکانی ئەڵمانیای دەرکردبوو، سوپای ڕووسیا درێژەی بە پێشڕەوییەکانی خۆی و داگیرکردنی شارەکانی ئەڵمانیای دەدا. فاکتەری سەرەکی و گرنگی پێشڕەوی سوپای سوور (سۆڤێت) لە خاکی ئەڵمانیادا، هەڵەی سیاسیی هیتلەربوو، چونکە ئەو تێکڕای هێزەکانی وڵاتی لە بەرەی خۆرئاوا چڕکردبووەوە، کەمیی سووتەمەنی پێش هەمووشتێک کاری لە بەرەی خۆرئاوا کرد.

لە 27ی حوزەیرانی 1945، هیتلەر تەسلیمی ڕای جەنەراڵەکانی بوو، بڕیاریدا سوپایەکی تەواو (لەشکری شەشەمی ئێس ئێس)، ڕەوانەی خۆرئاوا بکات، تا بەر بەپێشڕەویی ڕووسەکان بگرن. بەڵام نەبوونی بەنزین بۆ ئۆتۆمبێلەکانیان، وایکرد سەربازەکان لە ڕێگەی جادەکانەوە سەفەرنەکەن، بەڵکو بەو شەمەندەفەرانە ڕەوانەی بەرەکان بکرێن، کە بە خەڵووزی بەرد ئیشیان دەکرد، بەڵام سەرنج بەوەی کە ویلەکان خراپ زیانیان بەرکەوتووە، چاککردنەوەیان پێویستی بە چەندین هەفتە کات بوو، بۆیە ئەو کارە وادەکات، کە هێزی هاوکاری درەنگ بگات.

لە بەرەی خۆرئاوا، لەو کاتەی، کە لەشکری هاوپەیمانان درێژەی بە پێشڕەویی خۆی دەدا، پالاوگەکانی ئەڵمانیاش

بۆردومان دەکران.

ئایزنهاوەر لە کتێبی شەڕ لە ئەورووپادا دەنووسێت:
24ی مانگی ئادار، ناوچە نەوتییەکان (ڕوهەر) بۆردومان کران، ئەوە وایکرد ڕووداوێکی سەیر ڕووبدات.

بەو مانایەی کە دوای چەند ڕۆژێک لەشکری 2500000 کەسی جەنەراڵ (مدل)، سەرەڕای لەشکری 100000 کەسی (ئارمچ فنک)، لەلایەن هێزەکانی جەنەڕاڵی ئەمەریکی گەمارۆدراون و تەسلیم بوون.

جەنەراڵ (مدل)ی ئەڵمانی خۆی کوشت، 325000 سەربازی ئەڵمانی چەکەکانی خۆیان فڕێدا، (ئەوە لە ستالینگراد ڕوویدا).

ڕێک دوای سێ هەفتە، واتە 10ی مانگی ئاداری 1945، ئەڵمانیا بە بێ پابەند و مەرج تەسلیم بوون.

دواین شەڕ

ئەنجامی ئەرکەکەی ئەریکسۆن و پرنس کارڵ، لە لاپەڕەکانی پێشتر نووسرا، بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە، کە لە شەش مانگی دووەم شەڕی ئەورووپا چ کارێکیان دەکرد؟

ئەو دوو کەسە تا ئەو ڕۆژەی ئەڵمانیا شکستیخوارد، وەک نازی خۆیان نیشاندەدا، بەڵام دوای شکستهێنانی ئەو وڵاتە و خۆکوشتنی هیتلەر و بەدیلگیرانی تەواوی

دەسـەڵاتـداران، ئـەوان ماسکی ڕووی خـۆیان داڕنـی و هەمووان زانییان، کە بە پێچەوانەی بۆچوونی پێشوویان، نیشتمانفرۆش نین و کاریان بۆ دوژمن نەدەکرد، تەواوی سەرۆک کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەڵمانیاش، کە هاوکاریی ئەریکسۆنیان دەکرد، دیاریی مفتیان لەلایەن هاوپەیمانانەوە وەرگـرت، ڕۆژنامەکان بابەتیان لەبارەی ئەریکسۆنەوە بڵاوکردەوە و هەمووان، ناویان دەنا (ئەو پیاوەی گاڵتەی بە هیملەر کردبوو).

**سیخوڕی سیما منداڵانە دەستی لەسەر پەلەپیتکەی حەوت خۆرەکە داناو...**

هیچ کەس سەرنجی لەسەر ئەو گەنجە مێرمنداڵە نەبوو، کە لە ڕیزی پێشوازیکارانی پریزدنت مەک کیلنیدا وەستابوون. (مەک کینلی ساڵی 1901، سەرۆککۆماری ئەمەریکابوو).)

ئەو گەنجە هەروەک وترا ڕوخسارێکی پاکیزەیی هەبوو، هەرگیز نەدەکرا گومانی ئەوەی لێ بکەیت، سیخوڕ و خراپەکار بێت. پارێزەران (گارد)ی سەرۆککۆمار، کە بەردەوام بە بەردەم خەڵکەکەدا تێدەپەڕین و تەماشای بیچم و دەموچاویانیان دەکردن، هەرگیز گوێیان بەو نەدەدا، چونکە بیچمی ئەو منداڵە لە پێوانە بە هەموو تەماشاکەران ، وەک فریشتەیەک بوو لە دراوسێیەتیی شەیتان دا.

گەنجە ڕوخسارمنداڵانەکە بەردەوام سەیری سەعاتە گەورەکەی سەر دیوارەکەی دەکرد، کە زەنگی سەعات چواری دوانیوەڕۆی لێدەدا و هەرخولەکێک کە تێدەپەڕی، زیاتر لە ئامانجەکەی نزیکتردەبووەوە، هەمیشە لە خۆی دەپرسی: دەبێت چەند چاوەڕوان بێت، پەنجا خولەک، دە خولەک؟ ئەوەندەی پێنەدەچوو، کە ئەو ڕووبەڕووی سەرۆککۆمار دەوەستا و بەبێ هیچ لەمپەرێک کارەسات، کە لە ئەورووپا ڕوویدابوو، لە ئەمەریکاش ڕوودەدات.

پیاوێکی کورتەباڵا لە بەردەم ئەو گەنجە

ڕوخسارمندالآنەیە وەستابوو، کە برۆی پڕ و سمێڵێکی درێـژی هـەبـوو، یەکێک لـە پاسـەوانـانـی سـەرۆککۆمار، دووراودوور چاودێریی ئـەو پیاوەی دەکـرد، چونکە پاسەوانەکان هەموویان فەرمانیان پێکرابوو، کە لەگەڵ بینینی هەرکەسێکی گوماناوی، لە ڕیزی تەماشاکەران بیهێننەدەرەوە و نەهێڵن لە پرێزدنت نزیکببێتەوە.

پاسەوانانی سەرۆککۆمار بریتیبوون لە دوازدە پیاوی مەدەنیپۆش، کە لەناو تەماشاکەران بوون، بیست و دوو کارمەندی نهێنی، تیپێک سەربازی چەکدار و تیپێکیش سەربازی سوارە سەرەڕای سی و پێنج پۆلیس، تەواوی ئەوانە وەک بڵێی پێشتر بەیەکەوە کەینوبەینیان کردووە، هەرگیز سەرنجیان لە گەنجە ڕوخسارمندالآنەکە نەدەدا و تەنانەت نەدەزایە مێشکیشیانەوە، کە ئەو مرۆڤێکی ترسناک بێت و نابێت گومانی لێبکەن، بەڵکو پێویستە چاودێریی پیاوە کورتەبالآ، سمێڵبابڕ، پێستڕەش و مل ئەستوورەکە بکەن، کە لەپشت سێ گەنجەکەوە وەستابوو، چونکە سەروکەللەیان ئاگری لێدەباری.

پیاوە گەنجەکە، کە چاوەڕوانی کوشتنی سەرۆککۆمار بوو، بە شێوەیەکی سەیر خوێنساردبوو، دەیزانی لە کارەکەی خۆی سەرکەوتوو دەبێت، زۆر لەو کارە دڵنیابوو، چونکە چوار ڕۆژی تەواو بەرنامە بۆ ئەو کوشتنە دانراوە،

لەو بارەیەوە بیری کردبووەوە. ئێستا رۆژی چوارەم، دەیویست نەخشەی شومی خۆی جێبەجێ بکات، لە خۆی رادەخوری کە هێمن و پشوودرێژ بێت.

پۆلیسێکی یونیفۆرم لەبەر، بە بەردەمیدا تێدەپەڕی و بەپێی ئەو پیشەیەی کە هەیبوو، بەگومانەوە تەماشای هەموو کەسی دەکرد، چەند ساتێکیش لە سیمای گەنجە ڕوخسار منداڵانەکە ڕاما.

پیاوەگەنجەکە لیکی دەمی قووتدایەوە و لەناکاو شەپۆلی ترسبوونی داگرت، لە خۆی پرسی ئەگەر من بناسن... ئەگەر ...، بەڵام ڕستەی خەیاڵەکانی بەهۆی تێپەڕینی پۆلیس بڕدران و هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا و پۆلیس سەیری بیچمی تەواوی ئامادەبووانی کرد.

گەنجە چەکدارەکە، ورەی بە بەر خۆی نایەوە. هیچ کەس نایناسێت و گومانی لێی نەبوو. تاکە کارێک دەبووایە بیکردبایە، چاوەڕوانی بوو. زۆر زوو تەواوی دنیا لە کارەکەی دەکەوێتە لەرزە و هاوڕێکانی لە پێنج کیشوەری جیهان، ئاڵای سوور دەشەکێننەوە، سەرکەوتوانە ڕیزدەبەستن.

ئەو بیرۆکانە یەک بەدوای یەکدا بە مێشکیدا تێدەپەڕین. کەمێک دوورتر لەپشت شوێنی دانیشتنی سەرۆککۆمار، دوورتر لە دەرگای چوونەدەرەوە بەبێ هیچ پاسەوانێک،

سەعاتێکی دیـواری گـەورە هـەبـوو، گەنجە ناجسن و شیکپۆشەکە، بەدڵەکوتەوە، بەردەوام تەماشای دەرگا و سەعاتەکەی دەکرد. نەخشەکەی ئەوەبوو دوای کوشتنی سەرۆککۆمار، بگەڕێتەوە و دەسرێژ لە جەماوەرەکە بکات و پاشان، سوودی لە شێواوی و تێکەوەچرژانی بارودۆخەکە وەرگرتووە، لەو ڕێگایەوە لە دەرگـای چوونـەدەرەوەوە ڕابکات و بۆی دەربچێت.

تەواو بە ئەنجامی کارەکەی گەشبین بوو، دەیزانی تا چەند خولەکێکی دیکە، بە سێیەمین پیاو ئەژماردەکرێت، کە لە ماوەی سی و شەش ساڵ، سەرۆککۆمارێکی ئەمەریکای تیرۆرکردووە. یەکەمین پرێزدنێک کە کوژراوە، ئەبراهام لینکۆڵن، دووەمیان گارفیڵد بوو... ئەمڕۆ... شەشی ئەیلولی ساڵی 1904، ویلیام مـەک کلینی، بیست و پێنجەمین سەرۆککۆماری ویلایەتەیەکگرتووەکان دەکوژرێت.

تا ئەو ڕۆژە (دوانیوەڕۆی شوومی ڕۆژی هەینی)، ڕێک شازدە ساڵ و دوو مانگ پێش شۆڕشی گەورەی ڕووسیا تێدەپەڕی. لە 10%ی ئەمەریکییەکان، پەیوەندییان بە حیزبی کۆمۆنیستەوە کردبوو. ژەهـری ڕێنمایی کۆمۆنیستەکان دزەی کردووەتە سەرانسەری جیهان و فیکری کۆمەڵانی خەڵکی ژەهراوی دەکرد، نەک تەنیا مەرامی (کۆمۆنیزمی مارکسیزم)، بەڵکو کۆمۆنیزمی ئەنارشیستیش لایەنگرێکی

زۆری بۆ خۆی پەیداکردبوو. پەیڕەوانی فەلسەفەی ئەنارشیستی بە ئاستێک ئاژاوەگێڕبوون، خودی (کارڵ مارکس)یش ئەوانەی لە (نێونەتەوەیی) خۆی دەرپەڕاندن، چونکە هەندێک لە پەیڕەوانی مارکسیستی (یەکسانیی نەتەوەیی)، باوەڕێکیان هەبوو، ڕێزیان لە حوکومەت و دەوڵەت و یاسای خۆیان دەگرت، بەڵام ئەنارشیستەکان باوەڕیان بە هیچ شتێک نەبوو، فەلسەفەی مەرامیان، بوونی کۆمەڵگەیەکی بەبێ یاسا و بێ حوکومەت بوو.

لەوانەیە شێت بن و لەوانەشە ئەو فەلسەفەیە پێکەنیناوی بێتەبەرچاو. دروشمی لایەنگرانی نهێنیی ئەنارشیستی (مردن بۆ تێکڕای فەرمانڕەوایان) بوو، ئەنارشیستە بێگانەکان تا ئەو کاتە توانیبوویان ئۆسقۆفی گەورەی پاریس، تزاری ڕووسیا، سەرۆککۆماری فەڕەنسا، پادشای ئێران (ناسرەدین شا)، سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا، ئیمپراتۆریس و پادشای ئیتالیایان کوشتووە. (وەک بەو شێوەیەی وترا، ڕێنمایی کۆمۆنیستی فکری خەڵکی دنیای ژەهراوی کردبوو).

تەنیا بەهۆی چانسەوە، یان ڕێککەوت، یان ویستی خوا بوو، کە ئەنارشیستەکان نەیانتوانی پاپای گەورە، ئیمپراتۆری نەمسا، شاژنی ئیسپانیا، قەیسەری ئەڵمانیا بکوژن، (چونکە دروشمەکەیان لەناوبردنی فەرمانڕەوایان

بوو، بەڵام خۆشبەختانە لە نیەتخراپیی خۆیان دژی پادشا و گەورەکان، کە ناویان لەسەرەوە هاتووە و سەرکەوتوو نەبوون)، بەڵام لەبارەی ویلیام مەک کلینی، بیست و پێنجەمین سەرۆککۆماری ئەمەریکا، نە چانس هەبوو، نە ویستی خوا و گەنجە سیما منداڵانەکە زاتی کردبوو ئەو پیاوە بکوژێت، بڕیاری دابوو کە بە هەرشێوەیەک بووە، نەخشەکەی خۆی جێبەجێ بکات، بەسەر چانس و ویستی خواشدا زاڵبێت.

ڕیزی ئامادەبووان، وەک مارێکی دوورودرێژ، کەوتە جۆشوخرۆش و (لیۆن چول گاتس) (ناوی ئەو گەنجە سیما منداڵانەیە بوو)، هەروەها لەسەرخۆ جووڵاوە و چووەتە پێشتر.

ئەگەر کەسێک نەدەبووە ڕێگر، سەرۆککۆمار دەکوژرا، ئەگەر کەسێک ...

***

(چول گاتس) هەمان گەنجی سیما منداڵانە، لە دوانیوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممە (واتە ئەو ڕۆژەی، کە پریزدنت مەک کلینی چووە شاری بوفالۆ)، لە هەمووشوێنێک لەدوایەوە دەڕۆیشت و چاوەڕوانی دەرفەتێک بوو، زوتر بیکوژێت. (چول گاتس)، پێش پێنج ڕۆژ لە شاری شیکاگۆ بیستبووی سەرۆککۆمار نیازی وایە، لە هۆڵی سینەمای بوفالۆ

ئامادەبێت، لە بەردەم خەڵکدا دەربکەوێت. کاتێک ئەو هەواڵە بە گوێی (چۆل گاتس) گەیشت، تازە لە ئەنجوومەنێکی نهێنی گەڕاوەتەوە، لەو ئەنجوومەنەدا ژنێک بە ناوی (ئاماگۆڵد مەن)، گەورەترین ژنی ئەنارشیستی جیهان، وتەیەکی پێشکەش کردووە، بە شان و باڵی مرۆڤکوژانی ئەنارشیستیدا هەڵیگوتبوو.

وتەکانی (ئاما گۆڵد مەن)، تا سەر ئێسقانی مێشکی (چۆل گاتس)ی ڕۆچووە خوارێ، چنگی لە تاروپۆی بوونی دا و ڕۆحی داگیرساند. خاتوو (گۆڵد مەن) وتبووی: ئەوانەی لەژێر ئاڵای یاسا و حوکومەتدا دەژین، بە خەڵکی ئازاد ئەژمار ناکرێن. ئێمە دەمانەوێت ئازادبین و بەبێ هیچ گەورەیەک بژین، سەرنجتان لای من بێت هاوڕێیانی ئەنارشیستی، هاوڕێیانی ئازای ئێمە، کە فەرمانڕەوایانی ئەورووپایان کوشت، زۆر وریا و ئازادیخواز بوون، نەیاندەویست هیچ کەسێک فەرمانی چاکە و خراپەیان پێ بکات. خوشک و برایانی خۆشەویست، مرۆڤ کوشتن کارێکی ئاساییە، کە لە سەرەتای بوونەوە هەبووە، تا دنیاش دنیایە هەر دەبێت، بە مانای تا ئەو کاتەی کە حوکومەت و یاسا هەبێت، مرۆڤکوشتنیش درێژەی دەبێت.

(چۆل گاتس) دۆشداماو و حەپەساو ئەنجوومەنەکەی بەجێهێشت، بڕیاری دابوو کە کارێک بکات تا خەڵک ئافەرینی

بکات، بەڵام چ کارێک؟ ئەو چ کارێکی لەدەست دێت بۆ ڕووخاندنی حوکومەت؟ لەناکاو زانیی کە دەبێت چ کارێک بکات. ڕۆژنامەکان هەموویان نووسیبوویان، کە پرێزدنت مەک کیلی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک بۆ سەردانیکردنی پێشانگای ناوخۆیی ئەمەریکا لە (بوفالۆ)، هەڵکەوتە لە نیۆیۆرک بەسەردەبات،دەتوانێت کاتێک سەرۆککۆمار لەبەرچاوی خەڵک دەردەکەوێت...

ئەو شەوە، لیۆن چول گاتس دەمانچەی هەڵگرتووە، سواری شەمەندەفەر بووە، بەرەو بوفالۆ کەوتووەتەڕێ.

لەو کاتەدا لە تەلاری میوزیکی پێشەنگاکە وەستابوو، تۆسقاڵێک ترس چییە، بە ڕوخسارییەوە دیارنەبوو. گەرچی تەمەنی 26 ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوت کوڕێکی 19 ساڵەیە و سەروهەیکەلی بە ئاستێک پاکیزەییانە و منداڵانە بوو، کە هەرگیز وای نەدەکرد پاسەوانەکانی سەرۆککۆمار گومانی لێبکەن، هەرچەند دەسماڵێکی سپیی گەورەی لە قۆڵی بەستووە، دەستی بە ملییەوە گرتووە، کەچی هیچ کەسێک گوێی پێنەدەدا و پاشان پاسەوانێک ڕایگەیاند، کە پێموابوو ئەو دەسماڵە سپییە برینی پێچراو بووبێت، کە ئەو لە قۆڵی بەستووە، بەڵام وادەرنەچوو، چونکە دەمانچەیەکی سی و دوو کالیبەر، لەژێر ئەو دەسماڵە سپییە بوو، کە شانەکەی پڕ لە گوللە بوو، تەنیا فشاری کۆمەڵانی خەڵک

و هێرشبردنیان بۆ بینینی سەرۆکوەزیران بووەهۆی ئەوەی، کە ئەو نەتوانێت پێش سێ ڕۆژ، سوود لەو چەکە وەربگرێت، بەڵام ئەمڕۆ هیچ کەس نەیدەتوانی ببێتە لەمپەر، چونکە هەموو خەڵکەکە بەڕێکوپێکی وەستابوون و جووڵانی خەڵک بە بێ فشار بەدوای یەکدا بووە، هەرکەسە کە نۆرەی دەهات، بە پلیکانەکانی سەکۆیەکەدا سەردەکەوت و تۆقەی لەگەڵ سەرۆککۆماردا دەکرد، ئینجا دووردەکەوتەوە. چول گاتس لێوەکانی خۆی دەکرۆشت تا پێکەنینی نەیەت، چونکە ئەو کارە بە ئاستێک ئاسان و سادە ئەنجام دەدرا، کە هیچ کەس ناتوانێت پێشی پێبگرێت.

(چۆل گاتس) لەگەڵ ئەوەی لە سەرۆککۆمار نزیکتر بووەوە، دەستی لەسەر پەلەپیتکەی دەمکانچەکەی، کە لەبن دەسماڵی سەرقۆڵی بوو، دانا و زامنەکەی هەڵدایەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا لەناکاو دەستێک کەوتە سەرشانی و گەنجە سیما منداڵانەکە، لە زەندەقچوونی لە جێگەی خۆی وشکبوو، لەشی کەوتە لەرزین و بە دوو چاوی دەرپۆقیو، لەشی سوورهەڵگەڕاوی، ئاوڕیدایەوە و چاوی بە پۆلیسێکی نهێنی کەوت.

لە کاتێکدا پۆلیسەکە ژمارە (1)ی ئاسنی لە (چۆل گاتس) وەردەگرت، سەری ڕاوەشاند و پرسیی: ئایا دەستتان ئازاری هەیە؟ واباشترە بچیتە دەرمانخانەیەک و قۆڵت نیشانی دکتۆرێک بدەیت.

(چۆل گاتس) سەری لەقاند و وتی: هەڵبەتە دوای ئەوەی چاوم بە پریزدنت کەوت، سەردانی دکتۆر دەکەم.

پۆلیسی نهێنی شانەکانی هەڵتەکاند و پێیوابوو، ئەو دەستماڵە برینە و پێچاویەتی، کە گەنجە سیما منداڵانەکە لە قۆڵی برینداری و لەوانەیە شکاوی بەستووە، دەستی بە ملی هەڵواسیوە پێکەنیوە و دوورکەوتووەتەوە.

چرکەکان بەسستی تێدەپەڕین. چوار و چوار خولەک... پیاوە کورتەباڵاکە لەپێش (چۆل گاتس)یەوە وەستابوو، بۆ تەوقەکردن لەگەڵ سەرۆککۆمار چووە پێشتر، دەستی سەرۆککۆماری گوشی و پۆلیسێک کە لەسەرەتاوە چاودێری دەکرد، دەستی خستە سەرشانی و وتی: واباشە برۆین.

لەناکاو (چۆل گاتس) دەوروبەری خۆی بە چۆڵ و هۆڵ بینی، کەس لەنێوان ئەو و سەرۆککۆماردا نەدەبینرا و چەند مەتر لە یەکەوە دوورنەبوون. گەنجە سیما منداڵانە ئەنارشیستەکە هەنگاوێک چووە پێشەوە، لە (مەک کلینی) نزیکبووەوە و سەرۆککۆماری خۆشەویست، پێکەنی و دەستی ڕاستی درێژکرد، تا دەستی چەپی (دەستە ساغەکەی) ئەو گەنجە بگوشێت.

(چۆل گاتس) ڕێگەی دا سەرۆککۆمار دەستی لەناو دەستی خۆیدا بگرێت، لە هەمان کاتدا لەناکاو دەمانچەکەی

دەرهێنا و هاواری کرد: مردن بۆ تەواوی فەرمانڕەوایان!

دوای تەواوکردنی قسەکەی فیشەکێکی تەقاند، فیشەکەکە ڕاستەوخۆ بەر سینگی سەرۆککۆمار کەوت، ئەو پیاوە بەپشتدا کەوت و چۆل گاتس لە کاتێکدا لێکدا لێکدا تەقەی دەکرد، ورگی مەک کلینی کردبووە ئامانج، هاواری کرد: بمرێت!

بە ئاستێک ئەو ڕووداوە چاوەڕواننەکراو و لەناکاو بوو، هیچ کەس لە شوێنی خۆی نەجوولا و تەنیا خێرایی پێسترەشێکی بەتوانا، کە لە پشتەوەی (چۆل گاتس) وەستاوە و چاوەڕوانە تەوقە لەگەڵ سەرۆککۆمار بکات، وایکرد ئەو گەنجە نەتوانێت گوللەی سێیەم بتەقێنێت.

پێسترەشە بە تواناکە، کە بە (پارکەر) بانگ دەکرا، پەنجە بە هێزەکانی خۆی لە شانی چۆل گاتس توندکرد، هەڵیسووڕاند و بە دەستی چەپ مستێکی وردوهاڕکەری بە چەناگەی داکێشا، کە گەنجە سیما منداڵانەکە بە لۆژەلۆژە کشاوەتەوە دواوە، کەوتووەتە سەر زەوی و دەمی پڕبووە لە خوێن.

بەو هۆیەوە، لەناکاو تەواوی تەلارەکە کەوتە جۆشوخرۆش و پاسەوان و پۆلیسەکان بە هاتوهاوارەوە بەرەو (چۆل گاتس) هێرشیان برد، یەکێکیان دەمانچەکەی هەڵگرتەوە و دوای چەککردنی بکوژە گەنجەکە، گەمارۆیاندا.

(چۆل گاتس) هەوڵیدا بەرەو دەرگای چوونەدەرەوە ڕابکات، بەڵام پۆلیسیک لەدواوە پێوەی نووسا و پۆلیسێکی سوارەی دیکە پێلاقەیەکی بە سینگی دادا. لە هەموو لایەکەوە بارانی مست و پێلاقەی بەسەردا دەباری، کە دوای کەمێک دەستیان لە جەستەیدا بینیان بووراوەتەوە، بەڵام خەڵکەکە وازیان نەهێنابوو. لەشی شەلاڵی خوێن بووە و لووتی شکابوو.

پریزدنت مەک کلینی لە باوەشی یەکێک لە یاریدەدەرانی خۆی، جۆرج کۆرتیلیۆدا کەوتووە و بە کزولاوازییەوە بڕیاریدا: پێشیان پێ بگرە، هۆڵەکە چۆڵبکەن و واز لەو پیاوە بهێنن.

دەستبەجێ بڕیاری مەک کلینی جێبەجێکرا، پۆلیسەکان لە ماوەی کەمتر لە چەند خولەکێک خەڵکەکەیان لە تەلاری میوزیک بردە دەرەوە.

هەواڵی نییەتخراپی بەرامبەر سەرۆککۆمار بەخێرایی لەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە، یەکسەر ئەمبولانس هات و سەرۆککۆمار نۆ خولەک دوای ئەوەی کە پەلاماری درا، لە نەخۆشخانەی پێشانگاکە خەوێنرا، پۆلیسی سوارەی سەربازی سەردانی تەواوی نەشتەرگەریکارانی شای کرد و بانگهێشتی کردن.

لەناو تەلاری میوزیکی، کارمەندێکی نهێنی، سەتڵێک ئاوی ساردی بە سەری چۆل گاتس دا کردووە، بە تێڕاخوڕینەوە

وتی: هەستا گەمژەی بیژو. فەرمانم پێکراوە بەزیندوویی بتبەم بۆ گرتووخانە.

(چۆل گاتس) هەرگیز توانای ڕێکردنی نەبوو، دوو پۆلیس ناچاربوون هەردوو قۆلی بگرن و لە هۆڵەکە بیبەنە دەرەوە،بۆ ژوورێکی گچکەی هەڵگرن. (چۆل گاتس) لەوێ خوێنی ڕوخساری سڕی و کەمێک پشوویدا. تا توانیی کەمێک گوڕ وەبەرخۆی بنێتەوە، لەناو لێوە هەڵاوساوەکانی خۆی وەڵامی پرسیاری ئەفسەرەکانی دایەوە، وتی کە ناوی (نایمن)ە و ئەوە ناوێکی خوازراوبوو، کە ئەو هەمیشە لە کاتی پێویستدا بەکاری دەهێنا.

یەکێک لە لێکۆڵەرەوان بەنهێنی پرسیی: بۆچی تەقەت لە سەرۆککۆمار کرد؟

(چۆل گاتس) وەڵامی دایەوە: من ئەنارشیستم و ئەرکی خۆم ئەنجامداوە.

ئەو ئاپۆرایە کە لە بەردەم تەلاری پێشانگەکە وەستابوون، کردیانە هەرا و ژمارەیەک لە سەربازەکان بۆ کپکردنەوەی هەراکە هاتن و بە نێزە هەڕەشەیان لە خەڵکەکە کرد، و وایان لێکردن بەرەو دواوە بکشێنەوە، بەڵام ئاپۆراکە ئەوەندە زۆربوو، کە سەربازەکان نەیانتوانی کۆنترۆڵیان بکەن، چونکە بەسەریەکەوە زیاتر لە پەنجا هەزار کەس، لە بەردەم تەلاری پێشانگاکە ئاپۆرەیان

بەستووە و دەیانویست (چۆل گاتس)، بە سزای تاوانەکەی بگەیەنن و ژنێک لەناو ئاپۆرەکدا هاواریکرد: پێویستە ئێمە کوت کوتی بکەین و سەربازەکان ناتوانن پێشمان پێبگرن. بابچینە پێش.

هەزاران کەس بەرەوپێش ڕۆیشتن و بەرەو سەربازەکان جوولان.

سەربازەکان بە ئاگادارکردنەوەوە وتیان: بکشێنەوە، بکشێنەوە، بەڵام خەڵکەکە لە بارودۆخێکدا بوون و وا شڵەژابوون، کە هەریگز نەیاندەبیست و درێژەیان بە بەرەو پێشچوونیانداوە، ڕیزی سەربازەکانیان بڕی. سەربازەکان دەترسان نێزەکانیان بە کاربێنن، بە قۆنداغی تفەنگەکانیان کەوتنە لێدانی خەڵکەکە. سەر دەشکان و دەموچاوەکان بریندارده‌بوون، بەڵام کۆمەڵێک سەرباز لەپێش ئەو ئاپۆرایەوە بە تنۆکێک ئەژماردەکران لە بەرامبەر دەریا.

سەربازەکان یەک بەدوای ئەوی دیکەدا دەکەوتن، لەناکاو گالیسکەیەکی ئەسپڕاکێشەر بەخێرایی لە بەردەم دەرگای تەلارەکە وەستا، دەرگایەک کرایەوە و (چۆل گاتس)، کە دوو لێکۆڵەر دەیانهێنایە دەرەوە، هەڵیاندایە ناو گالیسکەکەوە و هەردوو لێکۆڵەرەوەکەش سەرکەوتن و لێکۆڵەرەوەی سێیەم لەتەنیشت گالیسکەچییەکە دانیشت و چوار ناڵەکی کەوتنەڕێ.

ژمارەیەک لەناو ئاپۆرەکەدا هاواریان کرد: بردیان، بەدوایان بکەون!، بەڵام کار لە کار ترازابوو، (چۆل گاتس) وردە وردە لە فەرمانگەی پۆلیس نزیک دەبووەوە.

ئاپۆرەی شکستخواردوو، بڵاوەیان لێکرد و ژن و منداڵەکان چوونەوە ماڵی خۆیان، نیوەی زیاتری پیاوان بەرەو فەرمانگەی پۆلیس بەڕێکەوتن، ئەوانی دیکە لە شوێنی خۆیان نەجووڵان تا بزانن سەرۆککۆمار چی بەسەرهاتووە. سەدان کەس بریندار بووە، بەڵام کەس نەکوژرابوو.

پزیشکەکان، لە نەخۆشخانە سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوون بۆ نەشتەرگەریکردنی (مەک کلینی)، زامی سینگی زۆر ترسناک نەبوو، بەڵام ئەو گوللەیەی چووبووە ناو ورگییەوە، مەترسی زۆربوو.

ئەگەر زانستی پزیشکی وەک ئەمڕۆ پێشکەوتوو بوو، بێگومان (مەک کلینی) نەدەمرد، بەڵام شەش نەشتەرگەریکاری شار، تەنانەت بە هاوکاریی دەزگا تازەداهێنراوەکانی جۆری (تیشکی ئێکسی درووستکراوی ئەدیسۆن)، نەیانتوانی گوللەی دووەم بدۆزنەوە و لە ورگی بریندارەکە بیهێننەدەرەوە. پرێزدنت مەک کلینی بەهۆی ژەهراویبوونی قورقوشمەکە، بە مێژووی چواری ئەیلولی 1901، واتە هەشت ڕۆژ دوای برینداربوونی، ماڵاوایی لە ژیان کرد.

(چۆل گاتس) کە لە گرتووخانە دابوو، هەرگیز زانیاری نەبوو سەرۆککۆمار هەشت ڕۆژ دوای بریندازبوونی ژیاوە، پێیوابوو هەر یەکەمجار مردووە و بەو پزیشکانەی بۆ پشتڕاستکردنەوەی شێتییەکەی چووبوونە گرتووخانە، وتی: من باوەڕم بە یاسا نییە و پێویستە تەواوی فەرمانڕەوایان لەناوبچن، حوکومەت برووخێنرێت.

(چۆل گاتس) پاشان وتی: چۆن چووەتە شاری (بوفالۆ) و بە چوار دۆلار و پەنجا سەنت، دەمانچەکەی کڕیوە، هەر لەوکاتەوە سەرۆککۆمار چووەتە ناو تەلارەکەوە چاودێری کردووە و بەردەوام بوو: کاتێک سەرۆککۆمار و یاوەرەکانی هاتنەناو شارەوە، من چوومە وێستگەی هێڵی ئاسن و ویستم لێی نزیکببمەوە، بەڵام پۆلیسێک پاڵەستۆی دام، واتە نەک تەنیا من، بەڵکو پاڵەستۆی هەموو خەڵکیان دەدا تا سەرۆککۆمار بتوانێت تێپەڕێت.

لەو کاتەدا زۆر لێی نزیکبووم، بەڵام بۆیە تەقەم لێنەکرد، چونکە دەترسام نەکا نەیئەنگاوم و هەڵبەتە من لە پاسەوان و پۆلیسەکان نەدەترسام، بەڵکو لەوە دەترسام نەکو پێش تەقەکردن دەستگیرم بکەن، نەخشەکەم ببێتە بڵقی سەر ئاو.

بۆ بەیانی، چوومە تەلاری میوزیکی و چەندجارێک ویستم پریزدنت بکوژم، بەڵام زۆر لێی نزیک نەبووم: بۆ ڕۆژی داهاتوو بڕیاربوو پریزدنت خەڵک ببینێت، لە

بارودۆخیان بپرسێت و منیش پەڕۆیەکی سپیم لە دەستم هاڵاند و دەستم والێکرد کە هەرکەس دەیبینی وایدەزانی دەستم شکاوە و بە ملم هەڵمواسی، لە کاتێکدا بەردەوام دەمانچەکە بە دەستمەوە بووە، کە کەوتمە بەرامبەر سەرۆککۆمار، چەکەکەم دەرهێناوە و دووجار تەقەم لێکرد، پێش ئەوەی فیشەکی سێیەمیشی پێوەبنێم، زەربەیەکی توند بەر چەناگەم کەوت و دنیام لە بەرچاوان ڕەش بوو، نەمزانی چۆن بوو.

***

لە 23ی ئەیلول، واتە نۆ ڕۆژ دوای مردنی سەرۆککۆمار، ئەو گەنجەیان بردە دادگا و هەزاران هەزار کەس لە بەردەم تەلاری دادگا کۆبوونەوە، بەڵام ئەوجارەیان ئاژاوە و پشێوی نەبوو، هیچ کەس داوای سزادانی تاوانباری نەدەکرد. دوو پارێزەری داکۆکیکار بۆ (چۆل گاتس) دیاریکرابوو، بەڵام هیچ کامیانی بە پارێزەریی قبووڵ نەکرد و وتی: من باوەڕم بە دادگا نییە،ئەو یاسایەش بە سەروەر نازانم.

دادگاییکردنی بکوژەکە دوو ڕۆژی تەواو درێژەی کێشا، سەرەنجام دەستەی دادوەری ئەو پیاوەیان بە دانیشتن لەسەر کورسیی کارەبایی سزادا،مێژووی لەسێدارەدانی، 28ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1901 (واتە هەمان ساڵ) لە گرتووخانەی (ئیۆبۆرن) دیاریکرا.

(چۆل گاتس) لەو کاتەوە کە سەرۆککۆماری کوشت، تا ئەو کاتەی بەرەو کورسی کارەباییان برد، تەنیا جارێک ترسی پێوەدیاربوو، ئەویش لە 26ی مانگی ئەیلول، واتە کاتێک بوو کە لە گرتووخانەی بوفالۆ بۆ گرتووخانەی (ئیۆبۆرن)، واتە شوێنی جێبەجێکردنی لەسێدارەدانەکە، دەیانگواستەوە و کاتێک بردیانە ژووری زیندانەوە، لە قوولْپی گریانی دا، لەشی وەک بیی ناو ئاو لەرزیی، پاشان کەوتە سەر زەوی و پاسەوان پرسیی: ئایا دەتەوێت بەدوای کەشیشدا بنێرم؟

(چۆل گاتس) سەری بە ئاماژەی نەرێنی جوولاند، بەلام یەکسەر بڕیارەکەی خۆی گۆڕی و لەناکاو بژاردەی تووڕەیی خۆی بە دەستهێنایەوە، ترسی نەما و وتی: کۆمۆنیستەکان پێویستیان بە کەشیش نییە، ئەگەر ئێوە کەشیش بنێرن بۆ ئێرە، مێشکی دەتەقێنم.

کەمێک پێش سەعات حەوتی بەیانی 29ی ئۆکتۆبەر، پاسەوانانی زیندان دەرگای ژوورەکەی (چۆل گاتس) یان کردووەتەوە، بە ڕاڕەوێکی تەسکدا بەرەو ژووری لەسێدارەدانیان بردووە، دوو کەس لە پاسەوانەکان خێرا بکوژەکەیان لەسەر کورسیی کارەباییەکە بەستووەتەوە، پێش ئەوەی پلاکی کارەباییەکە دابدرێتەوە، (چۆل گاتس) وتی: من بۆیە سەرۆککۆمارم کوشت، چونکە ئەو دوژمنی خەڵکی باش و کرێکاران بوو، من لەو تاوانەی خۆم شەرمەزار و خەمبار نیم.

پاسەوانەکان بە ئاماژەی سەرۆکی زیندان، پلاکی کارەبایەکان دادایەوە و (چۆل گاتس) بەرەوپێش چەمایەوە و تینی بۆ قاییشی کورسییەکە هێنا و گیانی کێشرا: پاسەوانەکان خولەکێک کارەباکەیان نەکوژاندەوە. حەوت چرکەی یەکەم، یەک هەزار و حەوت سەد ڤۆڵت کارەبا بە جەستەی (چۆل گاتس)دا تێپەڕیوە، ئازارێکی توند و کوشندەی هەبووە، وردە وردە فشاری کارەباکە بۆ 300 ڤۆڵت کەمبووەتەوە و جارێکی دیکە بۆ هەمان بڕی یەکەم زیادکراوەتەوە، سەرەنجام بە تێپەڕینی 26 چرکە، سەرلەنوێ بۆ 300 ڤۆڵت کەمبووەتەوە و کوژێنراوەتەوە.

پزیشکی یاسایی، بۆ دڵنیابوونی زیاتر، فەرمانیکرد بڕی 1800 ڤۆڵتی دیکە کارەبا بخرێتە سەر جەستەی تاوانبار، ئەو کارە پێنج چرکە درێژەبکێشێت.

پاسەوانەکان جارێکی دیکە پلاکی کارەباکەیان دادایەوە، پاشان بە ئاماژەی دکتۆر، کووژاندیانەوە و کارەبا نەما.

دکتۆر بەرەو لای جەستەکە چووە، قاییشی کورسییەکەی کردووەتەوە، سەری چەماندووەتەوە و گوێی لەسەر سینگی تاوانباری کارەبالێدراو داناوە، پاشان هەناسەیەکی قووڵ و ئاسوودەی هەڵکێشا. ئیدی دڵی چۆل گاتس لێی نەدەدا. پیاوێک کە بیست و پێنجەمی سەرۆککۆماری ئەمەریکای تیرۆرکردبوو، ئیدی گیان لە لەشیدا نەمابوو.

ئاپۆرەی جەماوەریی جڵەوپساو بەرەو یاریدەدەری سەرۆک کۆمار هورووژمیان بردو...

ئاپۆرەکە هاواری دەکرد و پیاوەکان چەقۆ و تفەنگ و تەنانەت دەمانچەیان پێبوو، وەک شەپۆلێکی سەرشێت لەسەر گردەکەوە سەربەرەوژێربوونەوە. ئامانجیان ئۆتۆمبێلێکی ڕەش بوو، کە لەپێش نۆ ئۆتۆمبێلی هاوشێوەوە دەڕۆیشت و تازە لە فڕۆکەخانەی (مایکوتیا)وە بەرەو (کاراکاس) کەوتبووەڕێ.

زیاتتر لە پێنج سەد قوڕگی پیاوی توورە، هاواری مویرا نیکسۆن، مویرا نیکسۆن (مردن بۆ نیکسۆن)، دەهاتە دەر.

ڕچارد نیکسۆن یاریدەدەری سەرۆککۆماری ئەمەریکا، لەسەر کورسیی دواوەی ئۆتۆمبێلی یەکەم، لەپەنا وەزیری دەرەوەی ڤەنزویللا (سکار گارسیاو نیۆنی) دانیشتووە و بە ترس و نیگەرانییەوە سەیری دەورووبەری دەکرد، یەکەم کوچکە بەرد بەر شووشەی ئۆتۆمبێلەکە کەوت.

بەرکەوتنی ئەو بەردە، مانای پەلاماردانی دەگەیاند، چونکە بەدوایدا سەدان بەردی دیکە وەک تاوی باران بەسەر شووشەکاندا بارین و دوای کەمێک، ئاپۆرەکە دەوری ئۆتۆمبێلەکەیاندا.

نیکسۆن بەتوورەییەوە، تیلەئاوڕێکی داوە تا لە

شووشەی دواوەی ئۆتۆمبێلکەی، تەماشای ئۆتۆمۆبێلی دووەم بکات، کە هاوسەرەکەی پات و سینۆرینا (گرسیاو نیۆن)ی تێدا دانیشتبوون. لەو ئۆتۆمبێلەشدا دوو کارمەندی نهێنی (پاسەوان) دانشتبوون، بەڵام نیکسۆن دەیزانی، کە ناتوانێت هەرگیز هاوکاری هاوسەرەکەی بکات، و تەنانەت بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆیشی، هیچی پێناکرێت.

هەموو ئۆتبێلەکان، لە جادەی دەرەوەی شارەکە وەستاون و پێنج سەد کرێکاری ڤەنزویللایی دەورەیان دابوون. نیکسۆن بە مەبەستی (نیازباشی) سەفەری بۆ ئەمەریکای باشوور کردبوو، بەو شێوەیە پێشوازی لێکرا، ڕەنگی ڕوخساری وەک گەچ سپی ببوو، تێگەیشت ئەوە هەمان پیلانی کوشتنە، کە شەوی پێشوو لە کاتی بەجێهێشتنی شاری (بۆگاتا)ی پایتەختی کۆلۆمبیا، لێی ئاگادارکراوەتەوە. وا دەردەکەوێت ئەو ڕۆژە، واتە 13ی مانگی ئاداری 1958، دوارۆژی ژیانی دەبێت.

لەپڕ، لەپشت شووشەی لای چەپی نیکسۆن، سەروکەللەیەکی شێتانە دەرکەوت، لێوی ئەستوور و ڕەشی ئەو پیاوە، هەڵگەڕاونەتەوە و ددانە سپییەکانی دەبینران، گاڵتەپێکردن و گاڵتەجاڕی لە ڕوخساری دەخوێنرایەوە، تاوان و مرۆڤکوشتن لە چاوانی دا دەباری.

نیکسۆن بە ترس و حەپەسانەوە تەماشای ئاپۆرەکەی

کرد، کە پێشیان بە ڕۆیشتنی سەیارەکە گرتبوو. پیاوە پێست ڕەشەکە لە کاتێکدا پێکەنینی گاڵتەجاڕانە لەسەر لێوی دەبینرا، شێتانە قۆچەقانییەکەی بەرزکردووەتەوە، بە هەموو توانای خۆی، بە شووشەی ئۆتۆمبێلەکەیدا کێشاوە. قۆچەقانییەکە بەتوندی بەر شووشەی پەنا نیکسۆن کەوتووە و دووبارە بەرزبووەتەوە بۆ ئاسمان و هاتەخوارەوە، لێدانی لێکدا لێکدای سەر ئەو شووشە گوللەنەبڕەی ئۆتۆمبێلەکە دووبارەبووەوە. نیکسۆن لەخۆڕا لێدانەکانی دەژماردن:

یەک ... دوو ... چوار ... پێنج ...

نیکسۆن دۆش دامابوو، بیری لەوە دەکردەوە، کە ئەو شووشەیە چەندە بەرگە دەگرێت، بەڵام ئەوەی مسۆگەر بوو، سەرەنجام درەنگ یان زوو، شووشەکە ورد دەبێت و زەربەی بەرد و قۆچەقانیەکان، لەجیاتی شووشەکە، بەر ئەو دەکەوێت.

(نیکسۆن) زمانی ئیسپانی باش نەدەزانی و هەر ئەوەندە لە نەڕە و هاواری ئەو کۆمەڵە، کە دەوری ئۆتۆمۆبێلەکەیان دابوو، تێگەیشت دەڵێن ئیمپریالیستی فاشیست.

لەناکاو نیکسۆ ڕووی لە (گارسیاو نیۆنی) وەزیری دەرەوەی ڤەنزویللا کرد، کە لەپەنای دانیشتبوو، وتی: ئەوانە هەموویان کۆمۆنیستن؟

وەزیری دەرەوە بە ڕوخسارێکی غەزەب لێباریو و لێوەلەرزەوە، وتی: نەخێر، ئەوانە کۆمۆنیستی ڕاستەقینە نین، هەموویان شێتن ... ئەو شێتانە دەمانکوژن.

نیکسۆن جارێکی دیکە دووبارە تەماشای شووشەی ئۆتۆمۆبێلەکەی کرد، دەستی کردەوە بە ژماردنی قۆچەقانییەکان: حەوت ... هەشت ...

دەستی بۆ دەسکی ئۆتۆمۆبێلەکە درێژکرد، بەڵام لە هەمان کاتدا کارمەندی دەزگای هەواڵگریی نهێنیی ئەمەریکا، کە ناوی شرۆیدەر بوو، لەسەر کورسیی دواوەی ئۆتۆمبێلەکە دانیشتبوو، مەچەکی گرت و وتی: بۆ خاتری خوای نەچیتە دەرەوە. ئەوانە شێت بوون و دەتکوژن.

نیکسۆن وتی: بەڵام ئەوان بەو زووییە ناتوانن و ئێمە پێش ئەوەی بکوژرێین، چەند کەسێکیان لێ دەکوژین.

نیسکۆن چاوی بە دوو پاسەوانی خۆیدا، کە لەپەنا یەکتری دانیشتبوون، گێڕا. ئەو دووانە دەستیان لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکانی خۆیان داناوە و تەماشای ئاپۆرەکەیان دەکرد.

سەرهەنگ (ورنۆن ئەلفرز)، کە پۆستی وەرگێڕی نیکسۆنی هەبوو، لە لای ڕاستی دانیشتبوو، بەنیگەرانییەوە ڕایگەیاند بوو، کە بۆ خۆی چەکی پێ نییە.

(شرۆیدەر) پاسەوانی نهێنی ڕووی لە هاوکاری خۆی،

(ڕودهام) کردووه و وتی: هەتا دەتوانن خۆ لە تەقەکردن بەدووربگرن. ئەو گەمژانە ناتوانن ئێمە بەو ئاسانییە لە ئۆتۆمۆبێلەکانەوە دەربکێشنە دەرەوە و ئێمە پێش مردن، چەند کەسێک لە ئەوانیش دەکوژین.

نیکسۆن جارێکی دیکە تەماشای ئەو پیاوە شێتەی کرد، کە بە قۆچەقانی بەردی لە شووشەی ئۆتۆمبێلەکە دەدا: دە ... یازدە.

زەربەی یازدەیەم کاریگەر بووە و شووشەکە وردوهاڕ بووە، کەوتووەتە سەر زەوی. پارچەیەک شووشەی شکاو، بە ناوچەوانی نیکسۆن کەوت و خوێن ناوچەوانی داگرت.

بە هۆی شکانی شووشەکەوە، دەنگی هاوار ڕوونتر گەیشتە گوێ.

خەڵکەکە هاواری دەکرد: بمرێت نیکسۆن، بمرێت نیکسۆن!

سەرهەنگ واڵتەرزی وەرگێڕ لە (گارسیا نیۆن)ی پرسیی: پۆلیس و سەربازەکان لە کوێن؟

(ونتۆنی) بە دەنگی لەرزیوەوە وەڵامی دایەوە: چووزانم. چووزانم.

نیکسۆن دەیزانی ئەو پۆلیسانەی ئۆتۆمبێلەکەی ئەوانیان دەپاراست، ڕایانکردووە و هۆی ئەو کارەش ئەوەبوو، کە یەکەم لەو خەڵکە تووڕەیە دەترسان و دووەم نەیاندەویست

بەهۆی غەریبەیەکەوە، هاووڵاتیان و هاوڕێیانی خۆیان بکوژن و خوێنیان بڕێژن.

شیشە ئاسنێکی درێژ لە پەنجەرەشکاوەکەوە هاتە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە و سەری نیکسۆنی کردە ئامانج، بەڵام شرۆیدەری کارمەندی نهێنی دەستبەجێ هەنگاوی ناوە و لە شوێنی خۆی، خۆی هەڵدا و دەمانچەکەی بردە دەرەوە، لوولەکەی بە دەستەوە گرت، بە پیاکێشانێکی توند لە مەچەکی ئەو دەستەی، کە بە شیشەئاسنەکەوە بوو.

هاوارێکی بە ئازار هەستا و دەستی پەلامارەدەر ڕاکێشریە دەرەوە، شیشەئاسنەکە کەوتە سەر پشتی ئۆتۆمبێلەکە. سەرهەنگ واڵتزی وەرگێڕ بەتوندی ئەو شیشەیەی هەڵگرت، وەک چەک بە دەستییەوە گرت.

هەروەک خەڵکەکە دەورەیان لە ئۆتۆمبێلەکە داوە، بەردی زیاتر بەر هەموو شووشەکان دەکەوتن. لەناکاو ئەو شووشەیەی پەنا وەزیری دەرەوە شکا و وردە شووشەی تیژ بە سەر و ڕووی وەزیری دەرەوەی ڤەنزولـلا و سەرهەنگ واڵتزدا هەڵڕژان.

نیکسۆن بەپەلە لە سەرهەنگی پرسیی: سەلامەتی؟

سەرهەنگ لە کاتێکدا کە خوێن بە چەناگەیدا دەهاتە خوارەوە، تفێکی لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکە کرد، هەندێک خوێن لە دەمییەوە هاتەدەر و وتی:

– ووردە شووشە چوونە ناو دەممەوە، بەڵام خراپ نیم.
نیکسۆن بەنیگەرانییەوە وتی: هیوادارم باش بیت، چونکە ئێمە ئیشمان بە تۆیە و پێویستە تەرجومەمان بۆ بکەیت.
نیکسۆن دەیزانی وتنی ئەو قسەیە، هەرگیز بەجێ نەبوو، بەڵام لەو کاتەدا، دۆخی ناڕەحەتی و ترسی سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە نەماوە و تۆزێک غیرەتیان هاتووەتەوە بەر و وەزیری دەرەوە وتی:  زۆر داوای لێبوردن دەکەم لەوەی، کە هاتووەتەپێش.
شووشەی دواوە شکا و نیکسۆن وردەشووشەکەی لەپشت سەر و ملی خۆی تەکاندە سەر زەوی و پاشان ئاوڕیدایەوە، تا چاوێک بە دەرەوەدا بگێڕێت ،کە بینی پەلاماردەران تەنیا ئەوانیان گەمارۆداوە، هیچ هەقیان بەسەر ئەو ئۆتۆمبێلەوە نەبوو، کە هاوسەرەکەی تێدابوو، هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا.
سەرهەنگی وەرگێڕ پرسی: خۆزگە حەوت تیرێکم پێدەبوو. چۆن دەتوانم خۆم لەو گێچەڵە ڕزگاربکەم؟
(شروود) کارمەندی نهێنی وتی: هیچ سوودێکی نییە و هەرکە دەرگەکەمان کردەوە، ئەوانە پارچەپارچەمان دەکەن.
سەرهەنگ واڵتز بەتووڕەییەوە پرسیی: کەوایە دەبێت چ بکەین؟

(شروود) وەڵامی دایەوە: بە هەمان شێوە پەنا بە خوا دەمێنینەوە. لەوانەیە زوو تووڕەیی ئەو خەڵکە دابمرکێتەوە و ئەگەر ئاوهاش نەبوو، تەقەی دەکەین، بەڵام ئەگەر زووتر تەقە بکەین و کەسێک بکوژین، تووڕەیی خەڵکەکە زیاتر دەبێت، ئەوانیش چاوەڕوانی ئەو دەرفەتەن، دەیانەوێت تەقەکردنەکە لە ئێمەوە بێت.

ئاپۆراکە، بەڕواڵەت چاوەڕوانی کاردانەوەی نەبوو، دوو کەس لە کارمەندانی نهێنی چاویان لەو شێتە بڕیبوو، کە شووشەکەی شکاندبوو.

هەروەک پەلاماردانی ئۆتۆمبێلەکە بەردەوام بوو. کەسانێک کە تیر و شیشەئاسن، یان بەردیان بە دەستەوە نەبوو، تفیان لە ئۆتۆمبێلەکە دەکرد، تفەکە بەسەر شووشەی پەنجەرەی سەیارەکەدا دەهاتە خوارەوە.

سەرهەنگ واڵتز بەنیگەرانییەوە وتی: خوایەگیان! تەماشای ئەوێ بکەن! یەکێکیان نارنجۆکی پێیە.

هەموو سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە سەریان سووڕاند و تەماشای ئەو شوێنەیان کرد، کە سەرهەنگ واڵتز ئاماژەی پێدەکرد – لاوێک بە سنگەخشکێ دەهاتەپێش و بە جۆرێک بەسەر زەویدا دەخشکا، کە دەتوت مەبەستییەتی لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا بزربێت، شیشە ئاسنێکی درەوشاوە بە دەستییەوە دەبینرێت.

(ڕودهام) کارمەندی نهێنی بە مینگەمینگ وتی: دەڵێی نارنجۆکە.

(نیکسۆن) هەرچەندی هەوڵیدا لەشی نەلەرزێت نەیتوانی، چونکە دەیزانی ئەگەر نارنجۆکەکە خلۆربکەنەوە بۆ ژێر ئۆتۆمۆبێلەکە، نەک هەر ئۆتۆمۆبێلەکە، بەڵکو تەواوی سەرنشینانیشی دەچنە ئاسمان و هەلا بەهەلا دەبن، بەڵام ئەو بیرۆکەیەش وەک هەموو بیرۆکەکان، زوو لە خەیاڵی سڕایەوە، بیرۆکەی دیکە جێیگەی گرتەوە.

لەناکاو نیکسۆن هەستیکرد کە ئۆتۆمۆبیلەکە لاژەلاژ دەکات، سەرەتا لاژەلاژەکەی زۆر کەم بوو، جووڵەجووڵی دەکرد، بەڵام بە تێپەڕینی هەرچرکەیەک، وردە وردە لاژەلاژەکە زیاتر دەبوو.

(نیسکۆن) بەترسەوە هاواری کرد. ئەوانە دەیانەوێت ئۆتۆمبێلەکە ئاوەژووبکەنەوە.

(شروود) و (ڕودهام) (کارمەندانی نهێنی) و سەرهەنگ واڵتز، بەبێ بەفیڕۆدانی کات، دەستبەکاربوون و لە کاتێکدا دوو پاسەوان، لوولەی دەمانچەکەی خۆیان گرتووە، سەرهەنگ واڵتزیش شیشە ئاسنەکەی لە مشتی خۆیدا دەگوشی، لەودیو شووشە شکاوەکانەوە، کەوتنە لێدانی پەلاماردەران.

وەک پشیلەی کێوی شەڕیان دەکرد. سێ پشیلەی کێوی

گەمارۆدراو. سەدان پیاوی تووڕە و مرۆڤکوژ.

کلکەدەمانچەکە و شیشە ئاسنەکە وەک تۆپ بەردەوام هەڵبەزودابەزیان بوو، بەر مەچەک، قۆڵ، بەر دەستەکان دەکەوتن.

ڤەنزویللا خوێنخۆرەکان، لە کاتێکدا هاواری بەئازار لە قورگیانەوە دەهاتەدەر، یەک بەدوای یەکدا دەکشانەوە و دەستە برینندارەکانی خۆیان دەبەست. ژمارەیەک لەو جەماوەرە، لێکدالێکدا ناوی نیکسۆن (یاریدەدەری سەرۆککۆماری ئەمەریکا، ئایزنهاوەر)یان بە ئەنارشیست و ئیمپریالیست دەهێنا، داوای مردنیان دەکرد.

پیاوە تووڕەکان کە ئاگر لەناو چاوانیان دەباری، لە چوارلاوە ئۆتۆمۆبێلەکەیان گەمارۆداوە، هەوڵیاندەدا لە جێگەی خۆی بیجووڵێنن و پاشان ئاوەژووی بکەنەوە.

(شروود) بەئارامی ڕووی لە شوفێرەکە کردووە و وتی: باشە، ئێستا بابەتی مرۆڤ کوشتن و هی تر لەگۆڕێ نییە، کەوایە تۆ قاچت تا دوائاست لەسەر بەنزین دابگرە تا ڕابکەین.

(گارسیا ونتونی) وەزیری دەرەوە، بە مینگە مینگ وتی: زۆر شەرمەزارم، تابڵێی خەجاڵەتم. نازانم بۆ ئەو خەڵکە بەو شێوەیە شێت و هار بوون.

سەرهەنگ واڵترز چاوەکانی وێکهێناوەتەوە، تەماشای

وەزیـری دەرەوەی ڤەنزویللای کـردووە و وتـی: ئـەوە بەتەواوی ئاشکرایە کە کۆمۆنیستەکانی ئێوە ئەو پیلانەیان دانــاوە، دەیـانـەوێت لـەو ئـاژاوەیـە سـوودوەربـگـرن. بە بیانووی پەلاماردانی میللەت، یاریدەدەری سەرۆکوەزیرانی وڵاتەیەکگرتووەکان بکوژن. پێشتر حوکومەتی ئێوەیان ئـاگـادارکـردبـووەوە، حوکومەتیش سەلامەتیی جەنابی نیکسۆنی دابیینکرد، جەنابی نیکسۆنیش هەر بەو دڵنیاییەوە ژیانی خۆی خستووەتە مەترسییەوە و هاتووەتە ئێرە. هەر بەڵایەکی بەسەر بێت، ئێوە بەرپرسیار دەبن.

***

ئـەوەی سـەرهـەنگ واڵـتـز وتـی، تـەواو ڕاسـت بـوو، چونکە ڕۆژی پێشتر، واتە 13ی مانگی ئادار، سکرتێری نووسینگەی ڕیچارد نیکسۆن، ناسراو بە (ویلیام کی) ئاگاداری کردبووەوە، کە ئاگای لە خۆی بێت، چونکە دوو پیلان لە دژی گێڕدراون، لە شاری (کاراکاس)، لەلایەن کارمەندانی دژە سیخوڕیی ئەمەریکاوە ئاشکراکراون.

پێش ئەوەی نیکسۆن سەفەر بۆ ڤەنزویللا بکات، یەکێک لە یـاریـدەدەرانـی باڵوێزی گـەورەی ئەمەریکا (ئێدوارد سپارکس)، خۆی گەیاندووەتە ئەمەریکا و لە بارودۆخی پشێوی (ڤەنزویللا) ئـاگـاداری کـردبـووەوە، بـەڵام دوای ئەوەی لەلایەن حوکومەتی (ڤەنزویللا)وە پەیام گەیشت،

کە ئاسایشی تەواو لەو وڵاتە هەیە و تێکدەران هەموویان دەستگیر کراون و دەتوانن سەلامەتیی نیکسۆن دابینبکەن.

(کـی) یـاریـدەدەری بـاڵـوێزی گــەورەی ئەمەریکا لە ڤەنزویللا، لە نیکسۆنی پرسی: باشە قوربان، بڕیارت چییە؟

نیکسۆن وەڵامی دابووەوە: بێگومان دەچم. ئێستا ناتوانم پەشیمان ببمەوە. تێکدەران لە هەمووشوێنێک هەن، ئەگەر حوکومەتی ڤەنزویللا، وەک بانگەشەدەکات، بارودۆخی ئاڵۆزی وڵاتی بێدەنگ کردووە، پێویست بەوە ناکات ئێمە سەفەرەکەمان نەکەین.

سەفەرەکەی نیکسۆن بە مەبەستی نیازی چاکە، بە مێژووی 23ی نیسان دەستی پێکردووە و بۆ هەشت وڵاتی (ئۆرگوای) چیللی، ئەرجەنتین، ئیکوادۆر، پیرۆ، کۆڵۆمبیا و ڤەنزویللا سەفەری کردووە، لە هەمووشوێنێک بە ڕووی خۆش پێشوازی لێکرا، بـەڵام کۆمۆنیستەکان بـەردەوام مەبەستیان بـووە، چـزووی خۆیان بوەشێنن و ژەهـری خۆیان بڕێژن.

هیچ کام لە وڵاتانی لاتین، تەنانەت واشنتۆنیش چاوەڕوانی سەرهەڵدانی ئـاژاوەیـان نـەدەکـرد. ڕۆژی ئاشکراکردنی دەسەڵاتی (سوورەکان) لە واشنتۆن زیاددەکات، بواری پیلانی (سوورەکان) وردە وردە فراوانتر بوو، ڕێگەی نەدا بکەوێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە.

لە پێنجی مانگی ئادار، ژمارەیەک خوێندکاری کۆمۆنیست لـە لیما، کـۆبـوونـەتـەوە، پیلانی تێکدانی نەخشەکانی نیکسۆنیان، کە بڕیاربوو دوای سێ ڕۆژ سەفەر بۆ ئەو وڵاتە بکات، دارِشت. شوێنی کۆبوونەوەکە، زانکۆی (سان مارکس) بوو، خوێندکاران ئەو ڕۆژەی نیکسۆن چوو بۆ ئەو شارە، پەلاماریاندا و بارانی جوێن و تۆمەتهەڵبەستنیان بەسەردا باراند، بەڵام نیکسۆن و یاوەرانی توانییان خۆیان ڕزگاربکەن، بکەن و بە فڕۆکە بچنە وڵاتی کۆلۆمبیا.

کۆمۆنیستەکانی ئەمەریکای لاتـیـن، کـە لـەو بابەتە ئاگادارکرانەوە، یەکسەر نەخشەیەکی دیکەیان دارِشت، بە مێژووی هەشتی مانگی ئادار (ڕۆژی شۆڕشی لیما)، بیست و چوار بەرپرسی کۆمۆنیستیان لە خانوویەک، کە کەوتبووە شاری بۆگۆتای کۆلۆمۆبیا کۆبوونەوە.

ئەوێ خانوویەکی زیندانی ڕاکردووان بە ناوی (ژوان دۆمینکۆ پول گارویدا) بوو، سێ کەس لە ئامادەبووانیش، بە مرۆڤکوژی پرۆفیشناڵ ئەژماردەکران.

ئەو کەسانە بڕیاریاندابوو نیکسۆن بکوژن و (ڕایۆل ئەلماداسپینا)، سەرۆکی بانگەشەی حیزبی کۆمۆنیست، لە کاتی وتاردانی، ڕایگەیاند: هاوڕێیان، ئێوە تەنیا سێ ڕۆژ دەرفەتتان هەیە، کاری خۆتان ئەنجامبدەن، دەنا کار لە کار دەترازێت، دەبێت نیکسۆن بکوژرێت.

ئامادەبوویەک وتی: بەڵێ، ئەگەر سەرۆکی ئەمەریکا بکوژرێت، تێکڕای غولام و بەدیلگیراوە بەدبەختەکانی ئیمپریالیستەکانی باکوور لە ئەمەریکای لاتین، ئازاددەبن. ئەگەر ئەو کارە ئەنجامبدرێت، ئێمە بە گەورەترین پاڵەوانانی ڕۆژئاوا ئەژمار دەکرێین.

ئەنجوومەن کۆتایی هات و ئامادەبووان هەموویان هەستان و ڕۆیشتن. بۆ بەیانی ڕۆژی داهاتوو، فڕۆکەکەی نیکسۆن لە فڕۆکەخانە نیشتەوە و لەگەڵ هاوسەرەکەی دابەزین و سینۆر (گارسیا ونیۆنی) بەرەو ئەو ئۆتۆمبێلە ڕێنمایی کردن، کە ئامادەی جووڵان بوو.

هاوسەری نیکسۆن لە ئۆتۆمبێلی حوکومەت (لەتەنیشت هاوسەری وەزیری دەرەوەی ڤەنزویللا)، دانیشت و تەواوی پێشوازیکارانیش لە حەوت ئۆتۆمبێلی دیکەدا دانیشتن. ئۆتۆمبێلەکان بە خێراییەکی زۆر ڕێیانکرد و پۆلیسەکانی سواری ماتۆڕیش بەدوایاندا کەوتنەڕێ. دوای دوازدە خولەک، کاتێک گەیشتنە گردەکەی نزیکەی شار، لەناکاو جەماوەری پێشوازیکاران (کە لەقەراغ جادەکان ڕیزیان بەستبوو، یاریدەدەری سەرۆککۆمار ببینن)، هوتافیان کێشا و بە نەڕە و هاوارەوە پەلاماری ئۆتۆمبێلەکانیان دا.

***

زۆربەی نیگەرانیی نیکسۆن بۆ هاوسەرەکەی بوو، هەرچەند شوفێرەکە دەیویست ئۆتۆمبێلەکە بئاژوێت، نەیدەتوانی، چونکە خەڵکە تووڕەکە هەموویان خۆیان هەڵدایە سەر ئۆتۆمبێلەکە و بەردەکان یەک بەدوای یەکدا بەر میچی ئۆتۆمۆبێلەکە دەکەوتن.

پۆلیسەکانی ماتۆڕسوار هەموویان ڕایانکردبوو، پاسەوانەکانی نیکسۆن، کە بارودۆخەکەیان وەها بینی، زانییان تا چەند چرکەیەکی دیکە ئۆتۆمبێلی یاریدەدەری سەرۆککۆمار ئاوەژوودەبێتەوە، بۆیە هەموویان چەخماخەی تفەنگەکانیان ڕاکێشا و چەند گوللەیەکیان بۆ ئاسمان هەڵتۆقاند.

کاتێک دەنگی گوللەکان هات، خەڵکەکە کەمێک کشانە دواوە، شوفێرەکە لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و پێی لەسەر بەنزین داگرت، ئۆتۆمۆبێل وەک تیرێک کە لە کەوانی کەمان دەرچووبێت، جووڵا و هەشت ئۆتۆمبێلەکەی دیکەش سەریان لەدووی نا.

دوای ساتێک، خەڵکە نیگەرانەکە، لە جێی خۆیان نەجووڵان و ئۆتۆمبێلەکان بەخێرایی دوورکەوتنەوە، بەڵام کاتێک لە گۆڕەپانە گەورەکەی شار نزیکبوونەوە، نیکسۆن بیری خۆی گۆڕی و ڕووی لە وەرگێڕەکەی، سەرهەنگ واڵتەرز کرد و وتی: واڵتەرز، پێموانییە ئاژەوەگێڕان بەو

زووانە وازبهێنن، واباشترە کە ڕێگەکەمان بگۆڕین.

(واڵتەرز) شوفێرەکەی لە بڕیاری نیکسۆن ئاگادارکردەوە، شوفێرەکە بایدایەوە و لە جادەیەکی لاوەکییەوە بەرەو شار ڕۆیشت.

نیکسۆن هەرگیز تێنەگەیشت کە ئەو خۆپارێزییەی چەند بە قازانجی خۆی تەواوبوو، چونکە ڕێک لە گۆڕەپانەکەی دیکە، ئاژاوەگێڕان چاوەڕێ بوون بێت و بیکوژن، بەڵام بەو ڕێکەوتە چاوەڕواننەکراوە (ڕێگەگۆڕینە)، تەواوی ڕیسی نەخشەکەیان لێ بووەوە بە خوری.

***

کاتێک نیکسۆن پێی خستەسەر یەکەم پلیکانەی باڵوێزی ئەمەریکا، ڕوخساری زەردهەڵگەڕابوو، لەشی وەک مێژۆک دەلەرزی. تەواوی یاوەرەکانی خوێناوی بوون و دەموچاویان تێکنابوو. ژمارەیەکی زۆر هەواڵنێر، لە بەردەم دەرگای باڵوێزخانەکە کۆببوونەوە، لە بینینی نیکسۆن بەو خوێنساردییەوە، سەیر سەراسیمە بوون.

نیکسۆن لە وەڵامدانەوەی هەواڵنێران، کە لە چۆنچۆنیی ڕووداوەکەیان پرسیبوو، وتی: هیچ ڤەنزویللایەکی نیشتمانپەروەر، وەک ئەو خەڵکانە، وڵاتەکەی خۆی، شەرمەزار ناکات، بەڵام وەک زانیومە، هەرگیز ڕووداوەکەی ئەمڕۆ دووبارەنابێتەوە.

بە پێچەوانەی ڕاگەیاندنەکانی نیکسۆن، هەواڵی ئەو ئاژاوەگێڕییە بە واشنتۆن و بە گوێی پرێزدنت ئەیزنهاوەر لە کۆشکی سپی گەیشت، لەو هەواڵەدا کە برووسکەیان بۆ کرد، نووسیبوویان ئاژاوەگێڕان شاری کاراکاسیان داگیرکردووە.

ئایزنهاوەر دەستبەجێ بڕیاریدا پەیوەندی بە نیکسۆنەوە بکەن، وردەکاریی ڕووداوەکەی لێ بپرسن، بەڵام نیکسۆن و یاوەرانی لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا وەک زیندانی وابوون، خەڵکی تووڕە و ئاژاوەگێڕان، باڵوێزخانەکەیان گەمارۆدا، نەیاندەهێشت هیچ کەس بچێتە ژوورەوە، یان بێتە دەرەوە و هەوڵیاندەدا پۆلیسەکان ناخافڵ بکەن، تا بتوانن هێرش بەرنەژوورەوە و بەردەوام دروشمیان دەدا، دەیانویست داواکانی خۆیان بسەپێنن.

ئایزنهاوەر کە لە ئەمەریکا بیستی یاریدەدەرەکەی لە باڵوێزخانە گیری خواردووە، یەکسەر دەستبەکاربوو، فەرمانی بە وەزیری بەرگری کرد چەندی زووە نیکسۆن لەو شارە بێننەدەرەوە و ڕزگاربکەن.

ڕۆژنامەکان هەموویان ئەو ڕووداوەیان بڵاوکردەوە، بە هاتنی نیوەشەو، سوپای ئەمەریکا، دەریایی و ئاسمانی، هەموویان ئامادەی پەلامار و دەستپێکردنی شەڕ و هێنانەئارای کارەساتێکی مێژوویی بوون.

شەش کەشتیی شەڕ، جێتێکی شەڕ و چەند یەکەیەک فڕۆکە و پاپۆڕ بۆ شەڕ بەرەو شاری کاراکاس کەوتنەڕێ. هەزاران سەرباز لە سنوورەکانی کوبا و پۆتۆریکۆ ئامادەی شەڕ بوون، کاتێک هەموویان ساز و ئامادەبوون، چاوەڕوانی بڕیاری پەلاماریان دەکرد.

لە باڵوێزخانەی گەورەی ئەمەریکا لە (کاراکاس)، یاریدەدەری سەرۆککۆماری ئەمەریکا و هاوسەرەکەی لە ژوورێکدا دانیشتوون و قسەیان لەگەڵ گارسیا ونتۆنی وەزیری دەرەوەی ڤەنزویللا دەکرد.

بیست و چوار کاتژمێریان بەم شێوەیە تێپەڕاند، تا بۆ سبەینێ بەیانی، بە دەستێوەردانی بەرپرسانی سیاسیی ڤەنزویللا و پۆلیسی ئەوێ و سووپای ئەمەریکا، بڵاوە بە خەڵکەکە کرا و نیکسۆن و هاوسەرەکەی بە پاسەوانی سەدان سەربازی ئەمەریکا، لە باڵوێزخانەکە هاتنەدەر و سواری ئۆتۆمبێلێکی گەورە بوون، بەرەو فڕۆکەخانە ڕۆیشتن. خەڵکی شارەکە کە زانیبوویان ژمارەیەک خیانەتکار و بەرژەوەندخواز مەبەستیان بووە بیانکەنە دەسکەلا و نیکسۆن بکوژن، هەموویان لە کردەوەکەی خۆیان هەستیان بە پەشیمانی دەکرد، لە فڕۆکەخانەی شار، هەزاران هەزار بەڕێکار کۆببوونەوە، دروشمیان دەکێشا و کاتێک نیکسۆن سواری فڕۆکەی حوکومەت بوو، چەند

فیشەکێک بەرەو ئاسمان تەقێنران و ئۆرکسترای سەربازی دەستی بە ژەنینی میوزیک کرد، جارێکی دیکە خەڵکەکە مژولی هەستدەربڕین بوون، بەڵام هیچ کەس نەیزانی، ئایا ئەو هەستدەربڕینە لە ترسی ئەمەریکا و سوپای ئەو وڵاتە بووە، یان لەڕاستیدا خەڵک لە کردەوەی خۆیان پەشیمان ببوونەوە؟!

ئێمە هەموومان چەک بەدەستەوە وەستاوین و چاوەڕوانی جەنەراڵ یانچو ڤیللا دەکەین تا...

من تاکە بەجێماوی ئەو هەشت کەسانەم، کە هەریەکەیان لەپێناو وەرگرتنی چەند بڕە پارەیەکی مەکزیکی، ئەرکی کوشتنی جەنەراڵ (فرانسیسکۆ پانجو ڤێللا)مان پێ سپێردرابوو. هەموو هاوڕێکانم مردوون. هەندێکیان لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکە کوژران و ئەوانی دیکەش پاشان هەر کوژران.

لەو ژمارەیە تەنیا من و کەسێکی دیکە ناسراو بە (جیزس سالاس بارلزاس)، ماوین و ئەو کەسەش کەسێک بوو، کە نەخشەی کوشتنی (پانچو ویلا)ی کێشا و بەرپرسیارێتیی کوشتنی ئەوی گرتەئەستۆ، لە بەرچاوی خەڵکدا بە کەمتەرخەم ناسرا. بەڵێ، تەنیا من و ئەو، (پدرۆ فلیز)، بەزیندوویی ماوینەتەوە.

شەش کەسەکەی دیکە، کە دەستیان لەو پیلانەدا هەبوو، بریتیبوون لە (گابرێل شاواز) نوێنەری فرۆشتنی ئۆتۆمبێل، (میلتۆن لۆزویا) بکوژێکی پرۆفیشناڵ، ژوان ژوسی سایز و خوزێ پرادۆ، ئامۆزاکان و دوو برای دیکەی ناسراو بە (گویرا)کان.

ئێمە، لە دەرەوەی شاری (پاراڵ) پەلاماری ئۆتۆمبێلی (پانچو ویلا)مان دا، بۆ خۆی و یاوەرانیمان دایە بەر ئاگری گوللە و بێجگە لە یەکێکیان، هەموویانمان کوشت.

***

پانچو ویلا لە شاری (دوروتیۆ ئارانکا) بە مێژووی حوزەیرانی 1878 هاتووەتەدنیاوە،  تا تەمەنی 16ساڵی خولام بووە، پاشان ڕایکرد، بەڵام جارێکی دیکە دۆزرایەوە و گەڕایەوە ماڵی ئاغاکەی و لێیاندا.

دوای ماوەیەک کوڕی ئاغا، دەستدرێژی کردە سەر خوشکی پانچو ویلا، بەڵام بەزوویی سزای کردەوەکەی خوارد و خولامی خوێنگەرم و نیگەران، واتە پانچو ویلا دەستدرێژیکاری سەر خوشکەکەی کوشت، پاشان بووە چەتەیەکی بەناوبانگ. ماوەی حەڤدەساڵی تەواو (پانچو ویلا) بە کاری دزێو و نایاسایی خۆی، ترسێکی گەورەی لە سەرتاسەری مەکزیک چاند. دزی دەکرد، لە خەڵکی دەدا و بێویژدنانە دەیکوشتن. تا ساڵی 1911، پەیوەندی بە شۆڕشگێڕانەوە کرد، بووە فەرماندە.

بەو شێوەیە ڕەوتی ژیانی (پانچو ویلا) گۆڕا و وەک دیکتاتۆری مەکزیکی باکوور و (جاکتاس) باشوور، سەرقاڵی فەرمانڕەوایی بوو، سوپایەکی لە سی هەزار سەرباز پێکهێنا. لەو ماوەیەدا، واتە لە 1911 تا 1915، (پانچو ویلا) بەردەوام خواردن و پارەی بەسەر هەژار و نەداراندا دابەشییەوە. ڕێگاوبان و قوتابخانەی جیاجیای درووستدەکرد. تا بە نیشتمانپەروەرێکی گەورە ناسرا، هەموو دەیانزانی ئەوەندەی پێناچێت، دەبێتە سەرۆککۆمار،

بەڵام لە تشرینی دووەمی 1915، بە ناکۆکییەک، کە لەگەڵ سەرۆککۆماری مەکزیک و ئەفسەرانی سوپا بۆی درووست بوو، دەستی لە کاری خۆی کێشایەوە، جارێکی دیکە یاخی بووەوە.

(پانچو ویلا) پێنج ساڵی تەواو لەگەڵ ژمارەیەک کەس، کە لێیان دڵنیابوو، دەستیکردەوە بە چەتەیی و تەواوی ئەو کەسانەی، کە پێیوابوو لە پێشوو خیانەتیان لێیکردووە، سزای دان. (ویلا) تەنانەت بە جۆرێک یەکێک لەو کەسانەی پێشتر خیانەتی لێکردبوو، کوشت، کە مێشکی ئەو پیاوە پەرتوبڵاو بوو، (پانچو ویلا) هاوسەری کوژراوەکەی ناچارکرد، مێشکی هاوسەرەکەی بە بێڵ کۆبکاتەوە و بیکاتە چاڵێکەوە. (پانچو ویلا) ئەو شەوە دەستدرێژی کردە سەر ژنی ناوبراو، بۆ سبەینێ بەیانی دایە دەست 10 کەس لە یاوەرانی و دوای هەفتەیەک بە گوللە کوشتی.

لە ساڵی 1919ەوە تا ئێمە (پانچو ویلا)مان کوشت (واتە 20ی حوزەیرانی 1923)، دەسەڵاتێکی گەورەی پەیداکرد و بووە ملیۆنەر، خاوەن بانک، جەنەراڵی سوپای مەکزیک، (چونکە حوکومەت لێخۆشبوونی بۆ دەرکردووە، بەزەیی پێداهاتبووەوە). ئەو کە زیاتر لە 200000 کەسی کوشتووە، هێشتاش لەسەر کوشتنی خەڵک بەردەوامە. کاتێک بۆ جاری دووەم بووەوە بە جەنەراڵ، لە هەمووشوێنێک

لافی لێدەدا کە ئەو تاوانانەی تەنیا لەبەر خاتری نیشتمانە خۆشەویستەکەی مەکزیک، ئەنجامداوە.

بەڵێ، پیاوێک کە ئێمە لە دەرەوەی شاری (پارالّ) کوشتمان، هەمان کەس بوو. ئێمە دوازدە فیشەکمان لە جەستەی قەڵاوی خاڵی کردەوە، چوار فیشەکیشمان بەسەریەوە نا.

***

پرۆسەکە بەم شێوەیە دەستیپێکرد، ڕۆژێکیان بەنهێنی پێموترا سەردانی (میلتۆن لوزویا) بکەم و ئەو سەربازێک بوو، کە لە لای جەنەراڵێک، وەک خزمەتکار و تەنانەت پیاوکوژ، کاری کردبوو.

من دواکەس بووم لە ماڵی خۆی بینینم، بۆ متبەق ڕێنمایی کرام و گڵۆزێک جگەرەیان پێدام، بەڵام باسی مەشرووب و تەنانەت قاوەش لەگۆڕێ نەبوو.

لێم پرسرا، ئایا دەزانی بۆچی بانگکراویتە ئێرە؟

وەڵامم دایەوە: بەڵێ و ئەوانەی منیان هێنایە ئێرە، پرۆسەکەیان بۆ باسکردم.

- ئایا لای (پانچو ویلا) خزمەتتکردووە؟

- من لە نیسانی 1912 پەیوەندیم بە سوپاکەیەوە کردو...

- پاشان...

ئاخێکم هەڵکێشا و وەڵامم دایەوە: من لە نیسانی 1919 بۆ هەمان شار، واتە شاری (پاراڵ) گەڕامەوە و ئەوە کاتێک بوو، کە (پانچو ویلا) دوای چەند ساڵ یاخیگەری و ئاژاوەنانەوە، جارێکی دیکە سەرقاڵی کاری حوکومەت بووە و ژمارەیەکی لەلەسێدارەدا . ئەوان باشترین هاوڕێیانی ئێمە بوون و من هەرگیز یادەوەریی مردنیان لەبیرناکەم. ئەو کاتێک یاخیی حوکومەت بوو، نابێت ئەو مردنە لەبیربکرێت و ئەگەر ئێستاش، کە بووەتە جەنەراڵی سوپا، بڵێت دەبێتە لایەنگرمان، باوەڕی پێمەکەن.

بەرامبەرەکەم لێی پرسیم: ئایا ئارەزوودەکەیت مەکزیک لە شەڕی ئەو جانەوەرە ڕزگاری بێت؟

لە کاتێکدا بەترسەوە تەماشای ڕوخساری ئەو کەسەم دەکرد، وەڵامم دایەوە: قوربان من مرۆڤێکی هەژار و داماوم.

ئەوە هەمان وەڵام بوو، کە (فەرماندە)، واتە (بارازاس) چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی بوو، واتە (من مرۆڤی داماوم). لەبەرئەوەی مرۆڤی بەدبەختم. کەوایە بێگومان پێویستم بە پارەیە و بۆ پەیداکردنی پارە، ئامادەم (پانچو ویلا)، واتە پیاوێک کە بە دزی و تاوانی لەژمارنەهاتوو ببووە ملیۆنەر، بکوژم. (لوزویا) دەیزانی بوونی (پانچو ویلا) هەرگیز سیپاڵێکی پاش مێشانیش ناهێنێت، منیش دەمزانی ئەگەر

چانس و دەرفەتێکی وەها لەدەست بدەم، هەرگیز ناتوانم لە ژیاندا ڕووی دوو هەزار (پزو) زێڕ (یەکەی پارەی مەکزیک)، ببینم.

ئەگەر بچووکترین قسەیەک لەوبارەیەوە، کە دژی (پانچو ویلا) پیلان دارێژرا دەگەیشتە گوێی کەسێک، گۆزگومبەت پاسەوانانی دەڕژانە شارەوە و پیلانگێڕانیان لەسەر شەقامی شار بە بەرچاوی خەڵکەوە لەسێدارە دەدا.

دوای سێ ڕۆژ، لە سەعاتەکانی سەرەتای بەرەبەیان، پێنج کەسمان (ئەوانە ئەرکی کوشتنی (پانچو ویلامان پێ سپێردرابوو)، بەرەو خانوویەک، کە لەوێ وادەی چاوپێکەوتنمان لەگەڵ سەرۆکی خۆمان دانـاوە و فەرمانمان وەرگرت، جووڵاین و ئەو کەسەش کەسێکی دیکە نەبوو بێجگە لە جیزس سالاس بارازاس، ئەندامی پەرلەمانی مەکزیک. دوای وەرگرتنی بڕیاری پێویست، هەمووومان بەرەو هوتێلێک، کە خاوەنەکەی (پانچو ویلا) بوو، ڕۆیشتین و چاودێریمان کرد. نەخشەی کارەکە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە ڕێکخرابوو، چەند ژوورێکمان بەکرێ گرت.)

دوو هەفتەی تەواو لەوێ ماینەوە و بەردەوام چاوەڕوان بووین، کە بچووکترین دەرفەت هەڵکەوێت، تا سەعات

دووی دوای نیوەشەو (دوای دوو هەفتە)، تەقە لە دەرگای ژوورەکە هەستا و من (لوزویا)م لە خەو هەستاند. (لوزویا) دەرگاکەی کردەوە و سیخوڕێک، کە بۆ چاودێریکردن لە خانووی (ویلا) ناردبوومان، هاتە ژوورەوە و مینگە مینگ ئاسا پرسیی: ئایا سەنیور (بارازاس) لێرەیە؟

(لوزویا) بەتووڕەییەوە وتی: نەخێر، چما پەیامێکت هەیە؟

- (پانچو ویلا) و یاریدەدەرەکەی کۆلۆنێل (تریلۆ) و سێ پاسەوانی دیکەی، نیازیانوایە بەیانی زوو سەفەر بکەن، پێش ڕۆیشتن، دێتە ئەو هوتێلە تا ئێرە بە پیاوێکی ئیسپانی بسپێرن. نابێت دیقەت لەدەست بدرێت.

بەڕاستیش هەر وابوو، نەدەبوو کاتمان بەفیڕۆ دەدا. ئەو ڕێگایەی کە (پانچو ویلا) پێیدا دەڕۆیشت، کەوتووەتە دەرەوەی شار و زۆر چۆڵ و هۆڵ بوو، ئێمە دەمانتوانی گەمارۆی بدەین.

(لوزویا) دەستبەجێ منی بەدوای هاوڕێکانماندا نارد و من بەپەلە خۆم گەیاندە ئەو خانووەی، کە جاری یەکەم بۆ مامەڵەکە بانگی ئەوێ کرابووم و چوومە ژوورەوە و بینیم فەرماندە، هێشتا هەر خەوتووە، بەڵام خەبەرم کردەوە. فەرماندە (ئەندامی پەرلەمان)، پیاوێکی زۆر خۆر بوو، لێوی ئەوەندە ئەستوور بوون دەتوت خەپلە نانن، و

ملی لە ئەستووریان بە هیچ لایەکدا دوولا نەدەهاتەوە، یان نەدەسوڕا دەتوت ملی بەرازە.

من بەزەحمەت خەبەرم کردەوە، بابەتەکەم پێوت..

(بارازاس) بەپەلە جلەکانی کردەبەر، چەکی پێشتنی بەست و پاشان لوێچێک ئاوی بە دەموچاوی گیپنی داکرد. کاتێک هەنگاومان نایە سەر شەقامەکە، (بارازاس) هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و سییەکانی پڕ لە هەوا کرد.

(پانچو ویلا) پێشتر لەبەر خاتری کچێکی دێهاتی، بە کلکی دەمانچەکەی لەسەری (بارازاس)ی ئەندامی پەرلەمانی مەکزیکی داوە، لای هەموان سووکایەتی پێکردبوو، من پێموایە ئەوە گرنگترین فاکتەربوو، کە ئەو پیاوەی هاندا پەنجا هەزار پزو بۆ کوشتنی (پانچو ویلا) بدات.

ئێمە بەپەلە بە شەقامەکەدا ڕۆیشتین و سەرەنجام گەیشتینە هۆتێلەکە، لەوێ تەواوی هاوکاران، واتا (لوزویا) و (چاوێز) و ئەوانی دیکەش ئامادەبوون.

کاتێک هەرسێکمان لە دەوری یەک کۆبووینەوە، کارەکەمان ڕێکخست و بەرەو شوێنێک لە دەرەوەی شار، کە بێگومان ئۆتۆمبێلەکەی (پانچو ویلا) بە وێدا ڕەتدەبوو، ڕۆیشتین و لە پشت بەردەکانەوە بۆسەمان نایەوە.

بە دەرکەوتنی خۆر، هاوڕێییەکمان کە بە (خوزێ پرادۆ) ناسرابوو، نێردرایە سنووری سەد مەتر پێشتر تا لەگەڵ دیتنی ئۆتۆمبێلی (پانچو ویلا) ئاماژەمان بۆ بکات.

هەموومان لەپشت بەردەکانەوە خۆمان ماتکردووە، تەماشای فەرماندە (ئەندامی پەرلەمان)مان دەکرد، کە بەتووڕەییەوە کلکی دەمانچەکەی دەگوشی.

ئێمە هەرسێکمان، حەوت تیر و تفەنگمان پێ بوو، بڕیاروابوو لەگەڵ وەرگرتنی ئاماژە، لەپشت بەردەکان بێینە دەرەوە و ڕێگەکە بگرین، بە تفەنگەکانمان، دەستڕێژی لێ بکەین و کاتێک ئۆتۆمبێلەکە زۆر لێمان نزیکبووەوە، سوود لە چەکە بەهێزەکان ببینین.

***

خۆر دەرکەوت، کات تێپەڕی و لەشمان ئارەقەی کرد، بەڵام (پانچو ویلا) هەر خەبەری نەبوو، هەموومان لە خۆمان دەپرسی: نەوەک ئەو سیخوڕە (کە کاری بۆ دەکردین)، ئاشکرای کردبین. ئایا خەڵکانی (ویلا) نیازیانوایە گەمارۆمان بدەن؟ ئایا وبلا بڕیاری خۆی گۆڕیوە و لەجیاتی ئۆتۆمبێل، بە سواریی ئەسپ دەچێتە شار؟

هەموو ئەو پرسیارانە لە مێشکماندا بێوەڵام مانەوە. (پانچو ویلا) خانو و ڤێللای لە دەرەوەی شار زۆرە، دیار نەبوو کەی دەچێتە شار. ئایا خۆی لە یەکێک لەو

خانووانەی لایەنگرانی خۆی شاردووەتەوە، خەریکی سەفا و ڕابواردنە.

هەر بەو خەیاڵانەوە بە درێژایی شەو و ڕۆژ چاوەڕوان بووین، لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر لە ڕۆژی داهاتوو، سیخوڕەکەمان هەواڵی هێنا، کە (پانچو ویلا) نەخشەکەی خۆی گۆڕیوە و دەیەوێت بۆ ئەنجامدانی هەندێک لە کارە بازرگانییەکانی، بچێتە شاری (ژیمەنز) و هۆکاری دواکەوتنیشی هەر ئەوە بووە. هەر لەو شوێنەی بۆسەمان لێ نابووەوە، ڕێگای شاری (ژیمەنز) کۆتایی دەهات، بەرەو ڕاست لایدا و ئێمە بەناچاری سەنگەرەکانی خۆمان گۆڕی.

سەرەنجام سەعات حەوت و چل و پێنج خولەکی بەیانی، چاوەڕوانیمان کۆتایی پێهات، من هەرگیز ئەو ساتە فەرامۆش ناکەم. جەنەراڵ ویلا و هاوڕێیانی (یاریدەدەری پاسەوانان)، بە ئۆتۆمۆبێلی دۆجی گەورە لە دوورەوە دەرکەوتن.

دەنگی هاوڕێیەکمان هات کە وتی: ئاماژەکە کرا... ئاخ... خوایەگیان... (پانچو ویلا) ئۆتۆمبێلەکە لێدەخوڕێت!

لە جێی خۆم بازم دا و تەماشایەکی (بارازاس)م کرد. ڕەنگ لە ڕوخساری ئەو پیاوە پەڕیوە،لێوەکانی دەلەرزن و تیشکێکی سەیر لە چاوەکانی دەدرەوشایەوە.

حەوت کەس لەو ئۆتۆمبێلەدا بوون، کۆنلێڵ (تریلۆ)، یاریدەدەری (پانچو ویلا)ش لە پەنا خۆی بوو.

پەنجە تەڕەکانی خۆمان لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکان دانا و چووینە خوار جادەکە. ئۆتۆمبێلی دۆجی مۆدیل 1923، بە خێرایی سەعاتی دوازدە میل لە سەعاتێکدا بەرەوپێش دەچوو، (پرادۆ) هاوکارەکەی ئێمە، کاتێک ئۆتۆمبێلەکە بە بەردەمیدا ڕەتبوو، لەپشت بەردەکەوە خۆی هەڵدایە دەرەوە و دەمانچە بە دەستەوە بەدوای ئۆتۆمبێلەکەدا ڕایکرد، ڕێک ئێمەش هەر لەوکاتەدا ڕژاینە سەر جادەکە، من بەرەوپێشەوە ڕامکرد تا دەرگای ئۆتۆمبێلەکە بکەمەوە، هاوڕێکانم دەستیان بە تەقەکردن کرد.

پێش هەمووان پیاوێک کە لە پێشەوە دانیشتبوو، من پێموابوو جەنەراڵ (تۆناپۆ) بێت، کوژرا و ئینجان تایەی ئۆتۆمبێلەکە تەقی و ئۆتۆمۆبێلەکە وەستا. لە هەمان کاتدا کۆلێنێل (تریلۆ) یاریدەدەری (ویلا)ش بە لەشی دابێژرا و وەک بێژینگ، لەناو ئۆتۆمۆبێلەکە کەوت و (پانچۆ) جوولا، پێش ئەوەی چەکەکەی بهێنێتەدەرەوە، چەند فیشەکێک لە لەشی قەڵاویدا خاڵی کرانەوە. ئێمە بە یەکەم فیشەکی دەمانچەی شەش تیری خۆمان، تەقەمان لێکرد، ئەوجا تفەنگەکانمان بەکارهێنا.

کۆلێنێل (روساریۆ مۆراڵد) کە لەسەر کورسیی دواوە

دانیشتبوو، لەگەڵ دوو کەسی دیکە بووەتە ئامانجی گوللە و دەستبەجێ گیانیان لەدەستدا، تەنیا یەکێک لە سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە توانیی کە دەرگاکە بکاتەوە، بەرەو شاخەکە تێی تەقەنێت، وەک فیشەکی ئێمە تەواوبووە و وێڕای بەدواکەوتنیمان بە پێویست نەدەزانی، بۆیە گوێمان پێنەدا و لەو ڕۆژەوە بەدواوە هەرگیز لە مەکزیک هەواڵێک لەو پیاوە بەدەست نەهات.

ئۆتۆمبێلەکە کە هێشتا هەر نەکوژابووەوە، بۆ خۆی بەرەوپێش ڕۆیشت و زرمبەی لە قەدی دارێک هێنا. کابرێتەکەی تەقی و بەهۆی خۆداکێشانی بە دارەکەدا وایکرد لاشەی (پانچو ویلا) بکەوێتە خوارەوە، بارازاس خێرا بەرەوپێش ڕایکرد و گوللە پێماوەکانی لە مێشکی دوژمنەکەی خۆیدا خاڵی کردەوە.

پێشتر بەرنامەمان بۆ کارەکە دانابوو، چەند ئەسپێکمان لە نزیکەوە ئامادە کردبوو، من خێرا بەرەو ئەسپەکەی خۆم ڕامکرد، سواربووم و چوار ناڵەکەی ئەسپەکەم لینگدا.

هەرچەند دووردەکەوتمەوە، کەمتر دەنگی خەڵک و کەسانێکم دەبیست، کە ماڵەکەیان لەو دەرووبەرە بوو. لەگەڵ بیستنی دەنگی گوللەکان، خۆیان گەیاندووەتە شوێنی ڕووداوەکە و سەربازەکان داوای هاوکاریان دەکرد.

❊❊❊

لاشەی (پانچو ویلا) و یاوەرانی بردرانە هۆتێلی (هیدالکۆ) و پاشان بۆ وێنەگرتنیان بردرانە هۆڵی پێشوازی. کاتێک هاوسەری (ویلا) هەواڵی کوشتنی مێردەکەی بیست، یەکسەر لەگەڵ سێ منداڵی جەنەراڵ، (کە لە ژنەکانی پێشووی بوون)، لە شاری (چی هوواهووا)ەوە چوو بۆ (پاراڵ) و لە بەردەم خەڵکەکە ڕایگەیاند: بکوژەکانی مێردەکەی بێجگە لە سەرۆککۆمار (ویبەرگن) و جەنەراڵ پلوتارکۆ کەسانی دیکە نین، بەڵام ناوبراوان دوای ئاگاداربوونەوە لە مەسەلەکە، ئەو ژنەیان بەدرۆخستەوە.

قوربانیان لە گۆڕستانی شاری (پاراڵ) بەخاک سپێردراون، پۆلیسەکان و حهوکومەت، هەرگیز لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ (بارازاس) نەکرد، ببڕای ببڕ گومانیان بۆی نەچوو، چونکە (بارازاس) دوای تاوانکردنەکە، وەک من ڕایکردووە و چووەتەوە ماڵێ و دوای گۆڕینی جلوبەرگی، جارێکی دیکە لەسەر جەنازەی ویلا ئامادەبووە، تەنانەت لە وێنەیەکیشدا کە هەواڵنێران وێنەی لاشەکەیان گرتووە، ئەو پیاوە دەبینرا. پاشان پۆلیسی فیدراڵ، (بارازاس)ی دەستگیر و دادگایی کردووە، سەرەنجام سزای بیست ساڵ گرتنی بۆ دەرکردووە، بەڵام دوای دوو مانگ ئازادکرا و بۆ شارێکی دیکە ماڵی گواستەوە، دەستی بە ژیانێکی

خۆشکرد و هیچ هەواڵێکی نەما تا 34 ساڵ دوای ئەو ڕووداوە، واتە لە ساڵی 1951 بە مردنی ئاسایی لە شاری مەکزیک کۆچی دوایی کرد.

(چاوێز) (یەکێک لە هاوکارەکانمان)، درێژەی بە کاری خۆی داو وەک پێشوو، خەریکی بازرگانیی کڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبێل بوو، ڕۆژێکیان لە کاتی پەڕینەوەی لەو شوێنەی، کە (ویلا)ی تێدا کوژرا، کۆمەڵێکی نەناسیاو پەلاماریاندا و کوشتیان.

هەرگیز بکوژانی نەناسران!

پاشان دوو کەسی دیکە لە هاوکارانمان لەلایەن هەمان نەناسیاوانەوە کوژران، ئەوانی دیکە بە مردنی ئاسایی مردن.

ئەگەر ئێوەش ڕۆژێک ڕێتان کەوتە گەرووی (ئال پاتۆ) لە جادەی (پارال)، بە ئەندازەی سەد مەتر لە جادەکە بچنە پێشەوە، لەوێ دارێکی گەورەی بەهێز دەبینیت، کە ئۆتۆمبێلی پانچو ویلا خۆی پێداکێشا و لەسەر ئەو دارە قاپێک برنج دانراوە، کە ڕێز لە (نیشتمانپەروەرانی نەناسراو، واتە بکوژانی پانچو ویلا) گیراوە، ڕووداوی لەبیرنەکراوی مانگی حوزەیرانی پێش چل ساڵیان لەسەر هەڵکۆڵیوە.

لەناکاو ئۆتۆمۆبێلێکی سەربازی تەقییەوە و ترسێکی زۆری لە ....

ئۆتۆمۆبێلێکی ڕەنگ زەیتوونیی گەورە بە خێرایی چل کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، لەسەر جادەی ڤێرسای، بەرەو پارس ڕێیدەکرد، لەسەر کورسی پشتەوەی، فەرماندەیەکی سەربازی دانیشتووە، مژولی بڕێک کاغەز و بەڵگەیە. لەگەڵ ئەوەی ئۆتۆمبێلەکە لە جادەی ڤێرسای دوورکەوتەوە، لەناکاو ئیڤایەک لەپشت دارەکانەوە دەرکەوت، بەرەو ئۆتۆمبێلە سەربازییەکە ڕۆیشت دوای کەمێک، چەند دەستێک لە چادری دواوەی ئیڤایەکە هاتنەدەرەوە، چەدین نارنجۆکیان فڕێدایە ناو ئۆتۆمبێلە سەربازییە ڕەنگ زەیتوونییەکەوە. دوای چەند تەقینەوەیەکی گوێ کەڕکەر و بەدوای یەکدا، ئۆتۆمبێلەکە ئاوەژووبووەوە و گڕی گرت.

دوای چەند خولەکێک، پۆلیسی سەربازی، تەواوی ئەو ناوچەیەی گەمارۆدا. ژمارەیەک لە پۆلیسەکان، چاکەتەکەی خۆیان بەسەر سەری خۆیان داداوە، هەوڵدەدەن بەناو گڕ و دووکەڵدا بەرەوپێش بچن، هەندێک جار سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە ئەگەر نەمردبن، ڕزگاربکەن، بەڵام گڕ و گەرمی بە ڕاددەیەک توندبوو، مسی ئۆتۆمبێلەکە تواوەتەوە و سوورهەڵگەڕاوە، وردە وردە سپی دەچووەوە. بۆنی تایەی

سووتاو و پارچەی ئۆتۆمۆبێلەکە، بە ئاستێک زۆر و بێزراو بوو، تەنانەت پۆلیسی (ئێم، پی)، کە توندوتیژترین جۆری پۆلیسن، تووشی نیگەرانی بوون.

هەمان کات، ئۆتۆمۆبێلێکی دیکەی سەربازی بە هێمای (هەواڵگری) لە شوێنی ڕووداوەکە نزیکبووەوە و وەستا، پیاوێکی لێ دابەزی و بە حەپەسان و سەرسوڕمان، تەماشای ئۆتۆمبێلە پارچەپارچەبووەکەی کرد، پاشان بە هەردوو دەستی سەریگرتووە و بە فڵقوهوڕی گریانەوە هاواری کرد: خوایە گیان! ئەوە ئۆتۆمۆبێلی ئایزنهاوەرە! ئەوان ئایزنهاوەریان کوشتووە، (لە ئەمەریکا، بە ئایزنهاوەر دەڵێن ئایک و لەم بەسەرهاتەشدا، لە هەمووشوێنێک بە ئایک ناوی هاتووە).

❊❊❊

ئیڤایەک کە سەربازانی نارنجۆک هاوێژ، لەناویەوە بەرەو ئۆتۆمبێلە سەربازییەکە نارنجۆکییان هاویشت و تەقاندبوویانەوە، چەندین فرسەنگ لە شوێنی مەترسی دوورکەوتوەتەوە،وەک تیسکەی تفەنگ بەرەوپێش دەڕۆیشت، بەڵام پاشان، واتە هەمان ڕۆژی بەیانی 13ی مانگی ئەیلولی 1944، ئۆتۆمۆبێلەکە لە وێستگەیەکی بەنزین وەستا، شوفێرەکە بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: تکایە تانکییەکەم بۆ پڕ بکە لە بەنزین.

کارمەندی وێستگەی بەنزینەکە، کە کەسێکی سەرباز بوو، (چونکە وێستگەی بەنزینی تایبەت بوو بە سوپا) دەستی بۆ پەمپەکە درێژکرد، بەڵام پێش ئەوەی سۆندەکە هەڵگرێت، سەری سووڕاند و تەماشای سەرنشینەکانی ئۆتۆمۆبێلەکەی کرد، لە کاتێکدا ئاماژەی بە دوو پۆلیسی سەربازی (M.P)ی دەکرد، کە لەو نزیکە پیاسەیان دەکرد، پرسی: ئێوە سەربە کام یەکەن؟

شوفێری ئۆتۆمبێلەکە نە وەڵامی پرسیاری کارمەندی وێستگەکەی دایەوە، نە دەرفەتیدا دوو پۆلیسە سەربازەکە لێیان نزیکببنەوە و وەک بروسکە، گێڕی گۆڕی و پێی لەسەر بەنزین داگرت، ئۆتۆمۆبێلەکە وەک تیرێک کە لە کەوان دەرچووبێت، لەسەر جادە بەستراوەکە بەرەوپێش چوو. دوای چەند چرکەیەک، سیرە سیرِی ئیستاپ هەستا و ئۆتۆمبێلەکە خۆیکێشا بە ئۆتۆمۆبێلێکی دیکەدا، کە لە سایدەکەی بەرەوڕووی دەهات و زرمبەی بەریەککەوتنی ئۆتۆمۆبێلەکان بەرزبووەوە، ئۆتۆمبێلەکە ئاوەژوو بووەوە و پێش ئەوەی لە گۆشەیەک بوەستێت، سێ جار لەسەر یەک ئاوەژوو بووەوە.

ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک لەو شوێنە کۆبوونەوە، جەستەی سەرنشینانی ئۆتۆمۆبێلەکەیان هێنادەرەوە ،لەسەر بەفرەکە دایاننان. بەفر ئەوەندە زۆر باریبوو، کە

زیاتر لە پێیەک زەوی داپۆشیوە، تا چاو بڕی دەکرد بێجگە لە سپییەتی، هیچ شتێکی دیکە نەدەبینرا.

لـەم ڕووداوەدا، تەنیا شوفێری ئۆتۆمۆبێلەکە، بە سەلامەتی دەرچوو، بە لۆژەلۆژ لەوێ هەستا و لەو کاتەی، کە بەرەو ئەمبولانس ڕێنماییدەکرا، پۆلیسە سەربازەکان گەیشتن و کارمەندەکە بە ڕوویەکی گرژەوە وتی: ئەوانە، هەموویان کروتسن!

ئەفسەری پۆلیسەکە بەسەرسامییەوە پرسیی: تۆ چۆن زانیت؟

- من هەرکە ئەوانەم بینی زانیم ئەمەریکی نین، چونکە بە منیان وت (تکایە تانکییەکەمان بۆ پڕ بکە لە بەنزین) لە کاتێکدا ئەمەریکییەکان زۆر بە وشک و برینگییەوە دەڵێن (بەنزین). ئاخ، تۆ کە بۆخۆتان لە من باشتر ئاگادارن، یەکێک لە ئەفسەری پۆلیسەکان، دەمانچەی چل و پێنجی کالیبەری خۆی هێنایەدەر، سەرەتا بە ورگی شوفێری ئۆتۆمبێلە نیوە گیانەکەیەوەی نا، بە هەڕەشەلێکردنەوە وتی: قسە بکە، ئێستا ڕیخۆڵەت بە گۆڕێ وەردەکەم.

ئەو پیاوە بێئەوەی نقەی لێوەبێت، پێداگرانە دەستەکانی خستە ناو زنجیری هێلەکەکەی و هەرگیز گوێی بە سەری برینداری خۆی نەدەدا. ئەفسەرە پۆلیسەکە بەپەلە دەستی شوفێرەکەی بۆ دواوە ڕاکێشا و زنجیری هێلەکەکەی

کردەوە. لەژێر هێلەکەکەی، (کە هی سوپای ئەمەریکابوو)، یونیفۆرمی درەوشاوەی خۆڵەمێشی ئەڵمانییەکان دەبینرا.

نزیکەی دوای سەعاتێک، زیندانی لە نووسینگەکەی جەنەراڵ (هۆج) ئامادەیی بەیەک گەیاند، سەرهەنگ (ماکسوێڵ فرید) ئەفسەری دەزگای دژەسیخوڕیی ئەمەریکاش لەوێ دەبینرا، ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی گرتووەتەئەستۆ، لە کاتێکدا کە جگەرەی فەرمووی دەستگیرکراوەکەی خۆی دەکرد، وتی:

- فەرموو جگەرە بکێشە. ناوت چییە؟

دەستگیرکراوەکە، کە پەڕۆیەکی لە ناوچاوانی بەستبوو، بەتووڕەییەوە گازی لە لێوەکانی گرت، هەستایە سەرپێ و بێئەوەی هیچ وەڵامێک بداتەوە، سەری چەماندەوە بۆ خوارەوە.

سەرهەنگ (ماکسوێڵ) دوای کەمێک چاوەڕوانی، قامکی ڕاوەشاند و وتی: خۆت گێل مەکە من دەزانم باش زمانی ئینگلیزی دەزانیت و شارەزای، پێم بڵێ ناوت چییە؟

دەستگیرکراوەکە پیاوانە وتی: فرانتز کسلەر.

(ماکسوێڵ) بەخاکەڕایی پرسی: کارت چییە؟

دەستگیرکراوەکە بەسەری چەماوە وەڵامیدایەوە: لە کۆمەڵی (سکور زەنی)م و لە تیپی ژمارە یەک خزمەتدەکەم.

بیچمی ماکسوێڵ گرژبووە و بەتوندی دەستی درێژکرد، گووشیی تەلەفۆنەکەی هەڵگرتووە و وتی: تکایە سەرهەنگ (وید)م بۆ وەربگرە. دوای وەرگرتنی، (ماکسوێل) بە توندی ڕایگەیاند: ئالۆو، قووربانن کۆماندۆیەکی (سکورزەنی) دەستگیرکراوە و ئێستا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکەین.

دەستگیرکراوە ئەڵمانییەکە بزەیەکی کرد، قسەی فەرماندەکەی خۆی بیرکەوتەوە پێی وتبوون، کە دەستگیرکران، بێگومان ناوی (سکورزەنی) بێنن. (ماکسوێڵ) بەتووڕەییەوە گووشییەکەی لە شوێنی خۆی داناوەتەوە، لە ڕوخساری دەستگیرکراوەکە ڕاما و وتی: ئێستا خودی سکورزەنی لەکوێیە؟

- چووزانم.

- ڕۆڵی تۆ لەم ڕووداوەدا چییە؟ پێش ئەوەی وەڵام بدەیتەوە، دەبێت ئەوەت پێ بڵێم، چونکە بە جلوبەرگی ئەمەریکییەوە دەستگیرکراوی، بۆیە بە تۆمەتی سیخوڕی دادگایی دەکرێیت و لەوانەیە لەسێدارەت بدەن. ئەگەر هاوکاریمان بکەیت، لێت دەبوورن و ئازادت دەکەن.

دەستگیرکراوەکە بێئەوەی بوەستێت، سینگی بردەپێشێ و هەروەک بڵێی جگە لە بیری مردن هیچ خەیاڵێکی دیکەی نییە، بە دەنگێکی بەرز وتی: ئێمە نیازمانوایە ئایزنهاوار بکوژین.

سەرهەنگ ماکسویڵ، هەرگیز سەری لەو دانپێدانانە خێرایە نەسووڕما، چونکە دەزگای دژەسیخوڕیی ئەمەریکا، پێش چەند هەفتەیەک زانیبووی، کە (باندی گرایف) لەو پێناوەدا هەنگاوی جیدیان ناوە.

ئەوان دەیانزانی بیرۆکەی کوشتنی ئایزنهاوەر، لە تاکتیکەکانی هیتلەر بۆخۆیەتی و دەزگای دژەسیخوڕیی ئەمەریکا، ئەوەی زانیبوو کە پێشەوای ئەڵمانیای نازی، گوێڕایەڵێکی خۆی، واتە ستوانی دەزگای نهێنی (ئێس، ئێس)ی بە ناوی (ئۆتۆ سکورزەنی) ڕاسپاردووە ئایزنهاوەر بکوژێت.

سەرهەنگ ماکسویڵ، شەش سەعاتی ڕەبەق بە هەرفرتوفێڵێک، کە بە خەیاڵیدا دێت، لێکۆڵینەوەی لەگەڵ (گسلەر) کرد، بەڵام دەستگیرکراوەکە هەمووشتێکی ڕەتکردەوە، بێئاگایی خۆی لەبارەی هەموو بابەتەکان دەربڕی. بۆ بەیانی (گسلەر)، لەسێدارەدرا، بەڵام لە هەمان کاتدا، کە گوللەکان کردبوویانە ئامانج و دەنگی هاوکارەکانی، کە جلوبەرگی ئەمەریکی و بەریتانی و ڕووسەکانیان کردبووە بەر، لە ڕیزی هاوپەیمانان بوون و خۆیان وەک هاوپەیمانان دەنواند، بۆیە بەباشی دەیانتوانی هاموشۆی هەموو شوێنێک بکەن، بەناو یەکە سەربازییەکانی ئەمەریکادا بسووڕێنەوە. ئامانجی سەرەکییان، نزکیبوونە بوو لە

بارەگای فەرماندە، هاوپەیمانان لە ڤێرسای و کوشتنی جەنەراڵی سوپای ئەمەریکا، واتە دوایت ئایزنهاوەر بوو. (لە کاتی شەڕدا ئایزنهاوەر جەنەراڵی سوپا بوو، هێشتا نەببووە سەرۆککۆمار.( و. ف)

ناوی (ئۆتۆ سکورزەنی)، ترسی خستبووە ناو دڵی دانیشتووانی هەمووشوێنێک و ئەو پیاوە، کە کۆمەڵێک سیخوڕی نهێنی لە بەردەستدا بوو، بە ئاستێک لە کارەکانیدا هۆشیار بوو، ناوبانگی گەورەترین سیخوڕی دنیای وەرگرت، تەنانەت مارشاڵ (پی ترو بادو گلیۆ)ی ئیتالی لەبارەیەوە وتی: ئەگەر ماوەی شەش مانگ دەرفەت بۆ شرۆڤە و توێژینەوە لە سکورزەنی تەرخانبکرێت، ئەو بێ هەراوهۆریا، بەریتانیا ڕزگاردەکات.

***

نەخشەی کوشتنی ئایزنهاوەر لە ناوەندی فەرماندەیی ئەدۆلف هیتلەر کێشرا، مەسەلەکە بەم شێوەیە بوو، کە بەیانی ڕۆژی 20ی تشرینی یەکەم 1944، (سکورزەنی) کە سێ ڕۆژ مۆڵەتی هەبوو، بەوپەڕی ئاسوودەیی لە هۆتێلی لەندەن پاڵکەوتبوو، وتی: پێشەوا بڕیاریداوە یەکسەر ڕاپۆرتەکانی خۆتانی بۆ بنێرن، لە فڕۆکەخانەی تمپلهۆف فڕۆکەیەک چاوەڕوانتان دەکات.

کۆماندۆی بەناوبانگ بەتوندی هەستا و لە هۆتێلەکە وەدەرکــەوت،بــەرەو فڕۆکەخانەی تمپلهۆف کـەوتـەڕێ. دوو ماتۆڕی پۆلیس، لەپێش ئۆتۆمبێلە مارسیدسەکەیەوە دەڕۆیشتن و ڕێگایان بۆ دەکردەوە. دوای چەند خولەکێک گەیشتنە فڕۆکـەخـانـە. (سـکـورزەنـی) لـە ئۆتۆمبێلەکە هاتەخوارەوە، بەرەو فڕۆکەکە ڕۆیشت. دەرگای فڕۆکەکە لــەدوایــەوە داخــرا و فـڕۆکـەکـەیـان پێکرد، دوای چەند چرکەیەک، فڕۆکەکە بەرزبووەوە و فڕی. ئەو فڕۆکەیە هی خودی هیتلەر هەبوو، دوو مەکینەی بەهێزی هەبوو. تەنیا مارشاڵ رومێڵ و کسلەرنیگ، لەوجۆرەیان هەبوو.

(سکورزەنی)، کە پیاوێکی باڵابەرز و کەتەی زلەبوو، لەسەر کورسییەکە پاڵیدایەوە، تەماشای دەرەوەی کرد و پاشان پەرداخێک ویسکی لە بتڵەمسینە گچکەکە تێکرد، هەڵیقۆڕاند.

سەرەنجام فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی (پروس) نیشتەوە، (سکورزەنی) دابەزی و بەرەو مارسیدسێکی بێنزی دیکە ڕۆیشت.

وێـنـەی هیتلەر لـەسـەر هــەردوو دەرگــای دەرەوەی دەبینرێت.

ئۆتۆمبێلەکە بەهێواشی ڕێیکرد و (سکورزەنی) لە هەر سەد پێیەک، چـاوی بە تۆپی دژەئاسمانی دەکـەوت، کە

ڕوویان لە ئاسمان بوو. تۆپچییەکان کە لەسەر شەقامەکان پیاسەیان دەکرد، بەسەرسوڕمانەوە تەماشای سکورزەنیان دەکرد، کە لەسەر کوشنی دواوەی ئۆتۆمبێلێک دانیشتبوو، ئەوان دەیانناسی، سڵاویان بۆ دەکرد و ئەوانی دیکەش لەخۆڕا سەری ڕێزیان بۆ دادەنەواند.

سکورزەنی تەماشای سەعاتەکەی مەچەکی خۆی کرد، کە دیاریی مۆسۆلینی بوو لە ساڵی 1942، پاشان کە گەیشتنە بەردەم کۆشکی تایبەتی هیتلەر، کە لەسەر شوێنێکی بەرز درووستکرابوو، دابەزی و بە یاوەریی دوو ئەفسەری دیکە چوونە ژوورەوە، ئینجا بەتەنیا چووەناو هۆڵە ڕازێنراوەکەوە.

دڵی بەتوندی لێیدەدا و سەری گێژی دەخوارد. چرکەی پاشان دەرگایەک کرایەوە، سکرتێری هیتلەر دەرکەوت و وتی: کۆلێنێل (سکورزەنی) پێشەوا پێشوازیت لێدەکات فەرموو بەدوامدا وەرە.

(سکورزەنی) خۆی توندوتۆڵ کردووە، قۆپچەکانی داخست و لەسەرخۆ بەدوای سکرتێرەکەدا، سەرەنجام گەیشتنە دەرگایەک کە شەش ئەفسەری چەکدار لە بەردەمی ئێشکیان دەگرت.

دەستە ڕاهێنراوەکان بەپەلە جلوبەرگی سکورزەنیان پشکنی، کە دڵنیابوون ئەو پیاوە چەکی هەڵنەگرتووە لەگەڵ خۆیدا، فەرمووی ژوورەوەیان کرد.

سکورزەنی بەتەنیا هەنگاوی نایە هۆڵەکەوە. دەرگایەکی مس لە گۆشەیەکی ئەو هۆڵەدا دەبینریت، کە بۆ خۆی کرایەوە و سکورزەنی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. چووە ژوورەوە. لەوێ، ئەدۆلف هیتلەر، لەپشت مێزێکی گەورە دانیشتبوو، تەواوی دیواری ژوورەکە بە وێنەی شەڕ داپۆشرابوو، سوچێکی کەمی مێزەکە مس بوو، ئەم دەستەواژەیەی لەسەر هەڵکۆڵرابوو: قاپی تایبەتی نانخواردنی ناپلیۆن پۆنابارت، لە سەردەمی ئیمپراتۆری 1804 – 1810.

پێشەوا لە کاتێکدا بزەی لەسەر لێو بوو، دەستی درێژکرد و (سکورزەنی بە لەشی هەڵلەرزیوەوە سەرەتا سەلام قوتێکی کرد، پاشان دەستی هیتلەری گوشی. لە شێوازی ڕەفتار و وتاریان تەواو دیاربوو، کە زۆر ڕێز لە یەکتری دەگرن، تەنانەت هیتلەر پێشتر لە بەردەم ئەفسەرە پلەباڵاکان، (سکورزەنی) بە ئەڵمانییەکی ڕاستەقینە ناساندبوو.

سکورزەنی هەرگیز پێشتر لەگەڵ هیتلەر بەتەنیا نەبووە، قەتیش باوەڕی نەدەکرد وەک هاوڕێیەک، لە بەردەم پێشەوای ئەڵمانیا وەستاوە.

لەو کاتانەدا، شەڕ بە زیانی ئەڵمانیا تەواوبووە، ئەو وڵاتە شکستێکی قەرەبوو نەکراوەی خواردووە، هیتلەر

بەردانگ بە (سکورزەنی)، ئەفسەری فیداکار و سیخوڕی گەورە وتی: دنیا پێیانوایە کاری ئەڵمانیا تەواوبووە، پێویستە لە ئامادەسازیی ڕێوڕەسمی پرسە و ڕۆژی بە خاکسپاردنیدا بین، بەڵام مردووەکان زیندوودەبنەوە و خۆرئاوا دەلەرزێنن!

سکورزەنی سەری ڕاوەشاند و هیتلەر بەرەو نەخشەیەکی گەورەی سەر دیوارەکەی برد، کە بەرەی ئەورووپای نیشاندەدا. دەمبوسی ڕەش و سووریان لەسەر ئەو نەخشەیە چەقاندبوو، دەمبووسە ڕەشەکان لەو شوێنانەبوون، کە پەیوەندیان بە ئەڵمانیاوە هەبوو، دەمبووسە سوورەکان پەیوەندیان بە هاوپەیمانانەوە هەبوو، کە ئەڵمانیا لە ماوەی چوارساڵی ئەو دواییە پاشەکشەی پێکراوە. فەڕەنسا لە شەڕەکەیان چووەتەدەرەوە و هەموو وڵاتە گچکەکان سەرکەوتبوون و بەریتانییەکان، کە لە دونکەریک بەرەو دەریا پاشەکشەیان پێکرابوو، جارێکی دیکە گەڕاونەتەوە، لەگەڵ ئەمەریکییەکان لە کیشوەرەکە پێشڕەویان دەکرد، بەرەو دڵی ڕایش دزەیان دەکرد.

هیتلەر هیواداربوو کە بە نەخشەی شیاو، کە لە سەریدا باریدەهێنا، توانیی جارێکی دیکە ناوچە لەدەستچووەکانی بۆ ئەڵمانیا بگێڕێتەوە، لە کاتێکدا ئاماژە بە نەخشەکە دەکرا، چاوەکانی وێکهێناوەتەوە، وتی پەلاماردانێکی (ئاردنس)

وادەکات سوپای هاوپەیمانان تووشی دڵەڕاوکێ و ترس و لاوازی بێت. هەرچۆنێک بێت سکورزەنی، سەرکەوتن، یان شکستی ئێمە، هەمووی پەیوەندی بە تۆوە هەیە، لەوانەیە لەڕاستیشدا داهاتووی ئەڵمانیا، پەیوەندی بەو کارەوە هەبێت.

(سکورزەنی) بەسەرسامییەوە گوێیەکانی قوتکرد، هیتلەرە بەردەوام بوو: تەنیا پەلاماردان و بۆردومان بەس نییە، کە هاوپەیمانان تێکبشکێنێت، بەڵکو پێویستە زەربەیەکی وەهایان لێبدرێت، کە تا ماوەیەکی زۆر نەتوانن بارودۆخی خۆیان ئاسایی بکەنەوە، ئەو زەربەیەش هەرگیز ئاسان نییە مەگەر بە کوشتنی ئایزنهاوەر و گوێ بگرە سکورزەنی، تەنیا تۆی کە دەتوانیت ئەو زەربەیە بوەشێنیت و بەس.

(هیتلەر) پاشان چۆنیەتیی کوشتنی ئەو پیاوەی شیکردووەتەوە و وتی پێویستە دارودەستەکەت جلوبەرگی دوژمن بپۆشن، بە ئۆتۆمبێلەکانی ئەوان بێن و بچن، ڕێگە بۆ لەشکرەکانی ئێمە بکەنەوە و بەرەو ڤێرسای بچن تا ئایزنهاوەر بە بێ سەرئێشە بکوژن.

(سکورزەنی) لەدەفتەری یادەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێت: قسەکانی پێشەوا زۆر کاریان تێکردم و تابلێی لەخۆبایی بووم و دوای بیستنی فەرمان و سەلام

قوت کردن، ڕەزامەندیی خۆم دەربڕی و ڕێک ئەو کاتەی دەمـەویـسـت ژوورەکــە بەجێبهێڵم، هیتلەر فەرمانیکرد، بۆخۆم لەو ئەرکەدا بەشداری نەکەم، بەڵکو سیخوڕەکانی خۆم بنێرم و پێشەوا پاشان وتی، کە نابێت ئەڵمانیا من، واتە (سکورزەنی) لەدەست بدات.

(سکورزەنی) هەرگیز ئارەزووی نەدەکرد داروودەستەکەی بە جلوبەرگی ساختەوە بنێرێتە بەرەکانی دوژمن، چونکە نەیدەتوانی فزەی بکات ڕازیبوو، بەڵام پاشان بە یەکێک لە هاوڕێیانی خۆی ناسراو بە (کارڵ ڕادڵ)ی وت: ئێمە سیخوڕ نین، بەڵکو مرۆڤی بەشەرەفین، ئامادەین لە ڕێگای نیشتمانی خۆمان گیانفیدایی بکەین، نابێت بە تاوانی بەکرێ گیراو و سیخوڕی بە دەستی دوژمن گوللەباران بکرێین.

بێجگە لە هیتلەر، تەنیا دوو بەرپرسی دیکە لە نەخشەی ناوبراو ئاگاداربوون، (سکورزەنی) بەناچاری، خەریکی خۆئامادەکردن بوو بۆ ئەرکەکەی، وەک نەیدەزانی پێویستە چۆنچۆنی ئەڵمانییەکان بـە جلوبەرگی ئەمەریکییەوە، ڕەوانـەی پاریس بکات، بۆیە داوای یارمەتی لە مارشاڵ (کاتیل) کرد و ئەویش ڕێوشوێنی بۆ دانا، کە بووەهۆی ڕزگاربوونی گیانی ئایزنهاوەر لە مردنی حەتمی.

(کاتیل) بە بێ قووڵبوونەوە و بیرکردنەوە، بە جیهاز ئەم پەیامەی خوارەوەی بۆ یەکەکانی سوپای ئەڵمانیا نارد:

نهێنی: بۆ سەرۆکانی سوپا و پۆلیس ... ئەو ئەفسەرانەمان بۆ بنێرن، کە لاتانن و دەتوانن بە ئینگلیزی قسەبکەن، پێویستمان پێیانە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی گرنگ. ئارەزوومەندانە دیاریان بکەن. بۆ یەکەیەکی نوێ بە فەرماندەیی کۆلێنێل ئۆتۆ سکورزەنی دەگوازرێنەوە. با داواکاران سەردانی نووسینگەی سکورزەنی بکەن. کاتیل.

کاتێک سکورزەنی پەی بەوەبرد بڕیاری ناوبراو بۆ تێکڕای یەکەکانی سوپا نێردراوە، زۆر ترسا، چاوەکانی نوقاند، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیوە، پاشان بەبێ کات بەفیرۆدان، نامایەکی بۆ هیتلەر نووسیوە و تێیدا، داوایکرد بڕیاری ئەرکەکەی هەڵبوەشێتەوە، ئەوەی بۆ زیادکرد کە بێگومان لە سوپای ئەڵمانیادا، سیخوڕانێکی زۆر بوونیان هەیە و تا ئەو کاتە، بێگومان هەواڵی ئەو بڕیارە گەیشتووەتە ڤێرسای.

هەرگیز ئەو نامەیە بەدەستی هیتلەر نەگەیشت. چونکە نامەکانی هیتلەر، یەکەم جار جەنەراڵ (فژلین) دەیکردنەوە، دەیخوێندنەوە و کاتێک ئەو نامەیەی خوێندەوە، (سکورزەنی) بانگ کردووە، پێیوتوە ئەگەر ئەو نامەیە بە دەستی پێشەوا بگات، ئاکامی ترسناکی دەبێت، چونکە لە ناوەڕۆکەکەیدا وا دەردەکەوێت، کە خودی هیتلەر و فەرماندەکانی سوپا، عەقل، شعووریان نییە و ناتوانن باش و خراپ لە یەکتری جیابکەنەوە.

(سکورززەنی) بێئەوەی یەک قسەیەکی دیکە چییە بیکات، دەستبەکار بوو، دەستبەجێ ژمارەیەکی زۆری لە سەربازگەی مەشقی (فریدننالڵ)، یان (دۆڵی ئاشتی) کۆبوونەوە، ئەو شوێنە کە نزیکی بەرلینە، بە شوێنی پەروەردەکردنی گەورە ئەژمار دەکرا، (سکورزەنی) و ژمارەیەکی دیکە لە جەنەراڵەکان، خۆبەخشەکانیان فێری ڕەمزی سیخوڕی دەکرد، وانەکانی شوفێریی و سەرنقومەی ناو ئاو بە باری قورسەوە بەردەوام دەخوێنران، وەبیریان دەهێنانەوە، کە چۆن نان بە شێوەی ئەمەریکییەکان بخۆن، یان چۆن دەستەکانیان بخەنە ناو گیرفانی پانتۆڵەکانیانەوە، کاتێک بەرپرسێک بە پەنایاندا تێپەڕی، هەرگیز ڕێک ڕاناوەستن و ئەوەی، کە لە سەردەمی مەشقدا لە هەموویان ناخۆشتربوو، پێچانەوەی سیگار بە دەستێک ئەژمار دەکرا، لە سێ هەزار خوێندکاری فەردیننالڵ، تەنیا دوو کەس توانیان سیگار بە دەستێک بپێچنەوە.

پڕکێشەترین قۆناغی ئەنجامدانی نەخشەکە، چوونە ناو کۆشکی ڤێرسایەوە بوو، سەرەنجام بڕیاردرا، کە (سکورزەنی) بۆ خۆی جلوبەرگی ئەمەریکی بپۆشێت و لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە، بچێتە ناو ئیدارەی فەرمانگەی هاوپەیمانانەوە، دوای چەند خۆهەڵکێشانێک، بارودۆخەکەی ئاڵۆزکردووە چووەتە ژووری ئایزنهاوەرەوە و بە دەستی خۆی دەی کوژێت.

لە هەفتەی دوەمی مانگی دیسامبەری 1944، تاقمەکەی سکورزەنی بەرەو بەرەی (ئەردنس) کەوتنەڕێ. یەکە پێشڕەوی کارەکان توانییان لە شاری (مینۆ)وە بچنەناو لەشکری یەکەمی ئەمەریکییەکانەوە، هەر لەو کاتەوە، کارمەندانی دژەسیخوڕیی ئەمەریکا، هەوڵیاندەدا بزان مەبەستی ئەڵمانییەکان لە خڕکردنەوەی ئەفسەرانی ئینگلیزیزان چ بووە (پەیوەست بە بڕیارێک، کە مارشاڵ کانیل دەری کرد). ئەوەندەی پێنەچوو مەتەڵەکە هەڵهێنرا، تەواوی هاوپەیمانان لە مەبەستی شوومی ئەڵمانییەکان گەیشتن و هەموویان بەیەکتریان دەوت، ئەڵمانیا نیازی کوشتنی ئایزنهاوەریان هەیە، سکورزەنی بۆ خۆی سەرۆکایەتییان دەکات.

سەربازەکان لە بەرەی شەڕ، بەگومانەوە سەیری دەورووبەری خۆیان دەکرد، تەنانەت ژمارەیەکی زۆریان دەترسان، کە شەوانە بخەون. کاریگەریی دەروونیی ئەو دەنگۆیە بە ئاستێک ورەی سەربازەکانی دابەزاند، کە بارودۆخی سەربازگەکان بەگشتی گۆڕا. هەموو دەیانزانی سیخوڕەکانی دوژمن لەناویاندان و چاوەڕوانی دەرفەتن بۆ کوشتنی ئایزنهاوەر و تەواوی پلەدارانی سوپا.

ئایزنهاوەر کە لەقەبی (سەربازترین سەرباز)ی هەبوو، هەموودەمێک بەپێی نەریتی خۆی تێکەڵی سەربازەکانی

دەبوو، هەرچەندجارێک جارێک بۆ ئۆردووەکە سەرکێشی دەکرد.

لە هەمووشوێنێک باس باسی ئەوەبوو (سکورزەنی)، واتە پیاوێک کە گیانی مۆسۆلینی لە مردن ڕزگارکردووە، ئێستا نیازی کێشانی گیانی ئایزنهاوەری هەیە، بە گێڕانەوەیەک، کە هیچ توانایەک ناتوانێت بەری پێبگرێت.

ژمارەیەک لە تاقمەکەی سکورزەنی دەستگیرکران، بەڵام هەموویان بە زمانێک ڕایانگەیاند، کە لە هاوکارانی سکورزەنین و نیازی کوشتنی ئایزنهاوەریان هەیە.

یەکێک لە ئەڵمانییەکان کە بە جلوبەرگی دوژمنەوە چوبووە بەرەی شەڕەوە، ڕۆژێکیان توانیی خۆی بگەیەنێتە کۆشکی ڤێرسای، بەرەو حەوشە گچکەکەی ڕابکات، بەڵام پۆلیسێک بینی و سیخوڕی ناوبراو خۆی هەڵدایە سەر دیوارەکە، تا بچێتەناو کۆشکەکەوە و ئایزنهاوەر بکوژێت، بەڵام نەیزانیبوو دیوارەکانی ئەوێ کامیررەیان لەسەرە، دەستبەجێ کارەبا گرتی و پزیسکێکی شین درەوشایەوە، دووکەڵێکی زۆر بۆ ئاسمان بەرزبووەوە و جەستەی کەوتە سەر زەوی. سکرتێری ئایزنهاوەر، ستوان کی سامرسبی لە کتێبی بەرپرسی من، ئایزنهاوەردا دەنووسێت: دوای ئەو ڕووداوە ژمارەی پاسەوانەکان دوو هێندە کراوە، تەلی دڕوویان بۆ زیادکردووە. هەرکە دەنگی ئۆتۆمۆبێلێک لە

دەرەوە دەبیسترا، هەموومان وازمان لە کارەکانمان دەهێنا، دەتوانم بەبوێرییەوە بڵێم، کە ورەمان پلە بە پلە لە ورەی سەربازەکان لاوازتر ببوو.

دەزگـای ئاساییشی ئەمەریکا بۆ خسـتنـەداوەوەی (سکورزەنی)، نەخشەیەکی نوێی کێشا، لە فیڵ و تەڵەکەی (هـاوشـێوەی مـرۆڤ) سـوود وەرگـیـرا. بـەو مانایەی کە کۆلێنێل بالدوین سمیتی شیکاگۆیی کتومت لەگەڵ ئایزنهاوەر دووانەن، لە هەموو شوێنێک ناوبانگی بەوە دەرکردبوو، کە هەمیشە بزەی هاوشێوەی بزەی سەر لێوی بەناوبانگی ئایزنهاوەر، لەسەر لێوەکانی ئەویشە. بەپێی نەخشەکەی پێشوو، هەموو ڕۆژێـک لە ڤێلای سـەن جێرمەنەوە بۆ کۆشکی ڤێرسای دەچێت، هەڵبەتە بەردەوام بە ئۆتۆمبێلە پێنج ئەستێرە بەناوبانگەکەی جەنەراڵ (ئایزنهاوەر) دەچوو.

(سـمـیـت) هـەوڵـیـدەدا هـەرگـیـز خـوێـنـسـاردی خـۆی لـەدەسـتـنـەدات، هــەروەک لـەسـەر کـورسـیـی دواوەی ئۆتۆمبێلەکە دادەنیشت، بـەردەوام پێدەکەنی و سڵاوی لە سەربازەکان دەکرد، هەمیشە چاوەڕوانیی دەستڕێژی گووللەکان، یان تەقینەوەی نارنجۆکەکانی دەکرد.

لـە 27ی کانونی یـەکـەم، سـکـورزەنـی نـەخشـەیەکی نوێی بۆ چوونەناو کۆشکی ڤێرسایەوە کێشا، بەو مانایەی دەیوسیت دوازدە کەس لە تاقمەکەی خۆی هاوشێوەی

پۆلیسی سەربازیی ئەمەریکی لێبکات، بە جۆرێک سیناریۆیەکە دابڕێژێت، کە بۆ نموونە ئەو پۆلیسانە، (سکورزەنی)یان گرتووە، کەلەپچەیان لە دەستی کردووە، دەیبەن بۆ بەردەمی ئایزنهاوەر، هەڵبەتە ئەو کەلەپچەیە هەرگیز دانەخرێت.

پێش ئەوەی سکورزەنی ئەو نەخشەیە جێبەجێ بکات، ئاگادارکرایەوە کە ئایزنهاوەر بۆ ڕۆژی داهاتوو بڕیاریداوە بەرەو شاری (ڕایس) بچێت، لەبەرئەوە نەخشەیەکی دیکەی دانا و بڕیاریدا، کە ڕێگاکە بگرێت و بیکوژێت. بۆ شەش کەسی لە تاقمەکەی خۆی سواری ئیڤایەک کردووە، وێنەی ئایزنهاوەری داوەتە هەرشەشیان، وتی: لە کوێ خۆیان بشارنەوە و چۆنچۆنی و چ کاتێک هێرش بکەنە سەر جێبی سوپای ئایزنهاوەر و بیتەقێننەوە.

ئیڤاکە کەوتەڕێ و لە بیشەلانێکی نزیک ڤێرسای وەستا، ئەوەندە چاوەڕوانی کرد، تا ئۆتۆمۆبێلی ڕەنگ زەیتوونی گەورە، لە دوورەوە دەرکەوت و بەرەو داوەکە هاتەپێش. سەرۆکی ئەو دەستەیە فەرمانی بە شوفێری ئیڤایەکە کرد، بجووڵێت و سندوقی نارنجۆکەکان کرایەوە، بە هەمان جۆر کە لە سەرەتادا وترا، بکوژانیش هەموویان لە ڕووداوێکدا کە ڕوویدا، بێجگە لە شوفێرەکە (پاشان ئەویش گوللەباران را)، کوژران.

(سکورزەنی) سەری دەسوڕما، کە بۆچی نەخشەکە سەری نەگرتووە، ئەگەر ئایزنهاوەر لەو ئۆتۆمۆبێلەدا نەبووە، کەوایە بۆچی تاقمەکەیان تەقاندوویانەتەوە، وێڕای خودی ئایزنهاوەر لەکوێیە؟

دوای ئەو بەدگومانییە، لە هەرپرسیارکردنێکی جۆراوجۆر لە ئیدارەی فەرماندەیی لەبارەی ساغ بوونی ئایزنهاوەر دەکرا. نەک تەنیا ئایزنهاوەر لە شوێنی کاری خۆی نەبوو، بەڵکو هیچ کەسیش بەوردی نەیدەزانی لە کوێیە و تەنانەت خودی ئەمەریکییەکانیش لەو کارەی بێئاگابوون، لەلایەن حوکومەتی ئەمەریکاوە فشار لە فەڕەنسا دەکرێت، کە هەرچی زوە ئاشکرای بکات، ئایزنهاوەر چی بەسەرهاتووە.

دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژی یەکەم، ئایزنهاوەر لە کاتێکدا کە بزەی لەسەر لێوان بوو، چووەناو نووسینگەکەی خۆیەوە،ئەو کەسانەی لەوێ کۆببوونەوە، هەموویان بەپەلە لە شوێنی خۆیان هەستان و دەستیان بە هاتوهاواری خۆشی کرد، تەنانەت فرمێسک لە چاوی ژمارەیەکی زۆریان سەربەرەوژێر بوو.

کاتێک پرسیار کرا ئایزنهاوەر لە سەعاتەکانی ڕوودانی ڕووداوەکە لەکوێ بووە و چی دەکرد، ئەو وەڵامی ئەو پرسیارەی بە شوفێرەکەی وت، ئەویش وتی: ئێمە نزیکەی پازدە فرسەنگ لە پاریس دووربووین، کە

لەناکاو پیرەمێردێک و پیرەژنێکمان بینی، لە قەراغ جادەکە لەسەر بەفر دانیشتبوون. پیرێژن دەگریا و ئایزنهاوەر فەرمانی پێکردم ئۆتۆمۆبێلەکە بوەستێنم، هۆی نیگەرانیی هەردووکیان بپرسم و پاشان دەرکەوت، کە ئەو دووانە دەیانەوێت بۆ ماڵی کچەکەیان کە لە پاریسە، بڕۆن و تەواوی ڕێگەکەیان تا ئەوێ بەپێ بڕیوە. ئیدی ماندوو و هیلاک بوون، توانای ڕۆیشتنیان نەماوە. کاتێک ئایزنهاوەر ئەمەی بیست، بانگی سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بىن و فەرمانی پێکردم ڕێک و ڕاست بچمە ماڵی کچەکەیان، من بە سەد دەردیسەری، سەرەنجام ماڵی کچەکەیانم دۆزییەوە.

***

بەم شێوەیە بوو کە تاقمەکەی سکورزەنی بەهەڵە ئۆتۆمۆبێلێکی دیکەیان، کە پێیانوابوو ئەوەی ئایزنهاوەرە، تەقاندووەتەوە، (چونکە بڕیاربوو ئۆتۆمبێلی ئایزنهاوەریش لە هەمان کات و ساتدا، بەسەر ئەو جادەدا تێبپەڕێت). دوای ئەو شکستە، سکورزەنی و باقیی تاقمەکەی بۆ ئەڵمانیا گەڕانەوە، هیتلەر میدالیای بەو پیاوە بەخشی و وتی، کە هۆی پێشڕەوینەکردنی ئەڵمانیا، کەمیی کەرەستە و هاوکار نەبوونی کەشوهەوا بوو، بەڵام کاتێک ئەڵمانیا شکستیخوارد، (سکورزەنیش) ڕێکپۆش بە جلوبەرگی تەواوی فەرماندەیی خۆی، لە کاتێکدا هەموو میدالیایەکانی بە سینگییەوە

داکردووە و سەری هەڵبڕیبوو، بەلوتبەرزییەوە هاتەناو نووسینگەی فەرماندەیی ئەمەریکاوە لە (سالزبورگ) و سەلام قووتی بۆ فەرماندەی ئەویٚ کردوە، بەئەدەبەوە وتی: کۆلێنێل ئۆتۆ سکورزەنی خۆی تەسلیم دەکات.

ئەفسەرانی دەزگای ئاسایيشی وڵاتەیەکگرتووەکان، بۆ یەکەم جار بە درێژایی مانگی کانونی یەکەم، هەناسەیەکی ئاسوودەییان هەڵکێشا و دۆخی بەدگومانی سەبارەت بە هاوکار، لە چاوی سەربازەکاندا نەما و بە گوللەبارانکردنی (سکورزەنی)، هەموویان هەستیانکرد، کە سێبەری مردن لەسەر سەریان ڕەویوەتەوە، نابێت ترسیان هەبێت.

بڕیاربوو خرۆشۆف وتارێک لە بەردەم فەرماندەکانی سوپا و سیاسەتکاران بدات، بەڵام بۆمبی تەوقیت کراو ..

سـەعـات 10ی بـەیـانـی حـەوتـی نیسـانـی 1958، ئۆتۆمۆبێلی (ڤۆڵکا)ی ڕەش لەسەر جادەیەک، کە بۆداپستی پایتەختی هەنگاریای بە شاری ناتابانیا (ناوەندی خەڵووزی بەردین) دەبەستەوە، بەرەوپێش دەڕۆیشت. لەنزیک شاری (ناتابانیا) ئۆتۆمبێل (کە دروستکراوی سۆڤێت بوو)، لە بەردەم کوڕێژگەیەکی لاواز و قژزەرد، کە لەقەراغ جادەی بەرداوی و چۆڵ و هۆڵ وەستابوو، وەستا.

هەم سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە و هەم ئەو کوڕێژگە دوازدە ساڵە، کە ناوی (پەی تەرسیدۆ) بوو، چاوەڕوانی نیکیتا خـرۆشـۆفی دەکـرد. سەرنشینانی ئۆتۆمبێلەکە پاسەوانییان لە فەرمانڕەوای دنیای کۆمۆنیست دەکرد، کوڕێژگەکە نیازی کوشتنی هەبوو.

(پەی تەر) سەرەڕای کەمیی تەمەنی خۆی، زانیارییەکی زۆری لەبارەی خرۆشۆف و سوپای سـوورەوە هەبوو، چەندین جار دەبابە و سەربازەکانی سۆڤێتی دیتبوو، کە لە سەردەمی شۆڕشدا، بەرەو شاری (ناتابانیا) دەجووڵان.

دوای دامـرکـانـەوەی شـۆڕش، جـادەی (ناتابانیا – بۆداپست)یش تـەواو گـۆڕا، تەنیا گەلابەکانی هەڵگری خەڵووزی بەردین و فارگۆنەکانی جووتیاران بەسەریدا

دەڕۆیشتن، بەڵام لە حەوتی مانگی نیسانی ئەو ساڵە، ئەو جادە چۆڵ و هۆڵە جارێکی دیکە پڕبووەوە لە سەرباز، ئۆتۆمبێلی پۆلیس، ئیڤای پڕ لە سەربازی چەکدار و دەبابە. لە سەرەتای دەرکەوتنی خۆرەوە، پۆلیسەکان و سەربازەکان لە پایتەختەوە بەرەو ئەو جادەیە کەوتبوونەڕێ تا ڕێگاکە بۆ تێپەڕبوونی خرۆشۆف بکەنەوە.

ئەرکی (پی تەر) چاودێری بوو. لێزمەی بارانی بەهار، جادەکەی قوڕاوی کردبوو، بۆنی شێ دەگەیشتە لووت. دواوەی (پی تەر) دارستانێکی فراوان بوو، هاوشێوەی ئۆقیانووسێکی سەوز، کە لایەکەی دیکەی دیارنەبوو.

(پی تەر) بزمارکوت لە شوێنەکەی خۆی وەستابوو، تەماشای ئۆتۆمبێلە ڤۆلگاکەی دەکرد، کە لە بەردەمی وەستابوو، هەستیکرد کە ئەو ئۆتۆمبێلە هاوشێوەی ئۆتۆمۆبێلی (پلیمۆت)ی پێش دە ساڵە و شووشەکانی دژەگوللەن و لە ناویشیدا سێ پێچکەی خولاوە دەبینرێت، کە ڕەشاشێکی تێدا دانراوە و لوولەی ڕەشاشەکە لە شووشەی دواوەوە هاتبووە دەرەوە، سێ خاوەن پلەی سۆڤێتی (کە هەموویان پۆلیسی نهێنی بوون)، دانیشتوون و سەربازێکی ئاساییش لەپشتی سوکانی ئۆتۆمۆبێلەکەوە بوو. یەکێک لە ئەفسەرە پۆلیسەکان، سەری لە پەنجەرەکەوە هێناوەتەدەرەوە، بە دەنگێکی بەرز بەردانگ بە (پی تەر)

وتـی: من خەریکە کەروێشک ڕاودەکــەم، لە ماڵی ئێمە خواردن نییە و قوتابخانەش بە شانازییەوە. هر بی بزەر کە، واتە هاوڕێی خرۆشۆف پشووی وەرگرتووە. بڕیارە ئەو ئەمڕۆ بێتە ناتابانیا. ئەفسەری پۆلیس وتی: زۆرباشە واباشترە، لە جادەکە نزیک نەبیتەوە و ئەمڕۆ هیچ کەس مافی ئەوەی نییە لێرە پیاسەبکات.

جارێکی دیکە ئۆتۆمبێلە ڤۆڵگاکە کەوتەوە جووڵە و بە ڕێگای خۆیدا بـەرەو کانی خەڵووزی بەردینی (ناتابانیا) درێژەی بە ڕێگەکەی خۆی دا. (پی تەر) ئەوەندە لەدواوە تەماشای ئۆتۆمبێلەکەی کرد، تا لە بەرچاوان ونبوو، پاشان لە سەرەوژێرێک چووەتە خوارەوە و بەرەو دارستانەکە ڕایکردووە.

شەبەقی خۆر بە تیشکی باریک لەناو لق و گەڵای دارەکاندا دەدرەوشایەوە و بۆنی گوڵەکان بۆشایی ئاسمانی بۆنخۆش کردبوو. زەوی شێدار و قوڕاوی بوو، باڵندە و سمۆرەکان لەناو لق و گەڵاکان یارییان دەکرد، بەڵام (پی تـەر) نە سەرنجی لەسەر شکۆی دارستانەکە بـوو، نە لەسەر جوانی دنیای گیانەوەران، زۆربەی سەرنجی لەسەر ڤرەڤرِی ئۆتۆمبیلەکان و ڕیزی سەربازان بوو، کە بەسەر جادەکەدا دەڕۆیشتن.

(پی تەر) لەبن دارێک دانیشت و خەیاڵبردییەوە، نزیکەی

سەعات چواری دوای نیوەڕۆ، ئەو دەنگەی بیست کە چاوەڕوانی بوو، ئەو دەنگە بریتی بوو لە نەڕەی ماتۆڕەکان و ئۆتۆمبێلی پۆلیس.

دوای چەند چرکەیەک، (پی تەر) لە پشتی دارەکانەوە توانیی لە سنووری بیست ئۆتۆمبێلی ڕەش (زیم)، کە لەلایەن پۆلیسەکانی سواری ماتۆڕەکانەوە، پارێزرابوون ببینێت. شەش ئۆتۆمۆبێلی سەر بە سوپای سووری سۆڤێت و هەنگاریا بوون و لەناو ئەو کەسانەدا، کۆلێنێل لارلوماتیاس، فەرماندەی هەنگاریا و کۆلێنێل فرانس زوگنەر، سەرۆکی دەزگای سیخوڕیی سوپای هەنگاریا دەبینران.

لەدواوەی ئەو ئەفسەرانە، ئۆتۆمبێلی جەنەراڵ (ئیڤان سرۆف) فەرماندەی ڕوسی و بەرپرسی گیانی شروخۆف دەڕۆیشت، لەدوای ئۆتۆمبێلەکەیەوە، زرێپۆشێک دەڕۆیشت کە هی سەرۆکی کۆمۆنیستەکانی هەنگاریا، واتە (ژانۆس کاردار) بوو، لەپەنا ئەو پیاوە، وەزیری دەرەوەی سۆڤێت، ئەندرێ گرۆمیکۆ دانیشتبوو.

لە ئۆتۆمۆبیلەکەی دیکەدا، ڕێک لەسەر کورسیی پشتەوەی شوفێرەکە، تەنیا یەک کەس دانیشتبوو، ئەو پیاوە سەررووتاوە، بەردەوام تەماشای دەورووبەر و خەڵکەکەی دەکرد و (پی تەر)ی مێرمنداڵ، بە دیتنی ئەو لەبن لێوانەوە وتی: خرۆشۆف!

(پی تەر) بە ئاستێک شڵەژابوو، ئارەزوی دەکرد چەکێکی وەک دەمانچە، یان نارنجۆک و بازۆکای هەبێت و لێکدا لێکدا نزای دەکرد دەیوت خوایە گیان، چەکێکم بدەیە تا چاوەڕوانیی ئەوانی دیکە نەبم، هەر ئێستا خرۆشۆف بکوژم.

پیاوە سەرڕووتاوەکە کە لە ئۆتۆمبێلە ڕازێنراوەکەدا دانیشتبوو، بزەیەکی هێنایە سەر لێوان و لە بیری ئەوەی هیچ کەس نەینەناسیوە، زۆر دڵخۆش بوو، چونکە بە هاوشێوەی خرۆشۆف ئەژماردەکرا، لێکچوی وەسفنەکراوی بە خرۆشۆف زۆر سەیر دەینواند.

خرۆشۆفی ئەسڵی، لە ئۆتۆمۆبێلێکی دیکەدا، کە لەگەڵ ئۆتۆمۆبێلەکانی دیکەی سیاسەتکارانی کۆمۆنیست دەڕۆیشت، دانیشتووە و پەردەی ڕەشی بە شووشەی ئۆتۆمبێلەکە دادابوو.

کاتێک ئەو ئۆتۆمبێلە بە بەردەم پی تەردا تێپەڕی، کوڕیژگە قژزەردەکە، هەروەک تەماشای ئەو ئۆتۆمبێلەی دەکرد، کە هاوشێوەکەی شرۆخۆف لەناویدا دانیشتبوو.

سەرەنجام پی تەر لە شوێنی خۆی هەستاوە و بەسەر جادە لماوییەکەی ناو دارستانەکەدا ڕایکرد، وەک ئاسکێکی چاپووک ڕایدەکرد، ئەوەندە ڕایکرد تا چەند دەنگێکی بیست و گەیشتە شوێنی یارییەکە، هەنگاوی سستکردن و

سەرەنجام چووە ئەو شوێنە کراوەوە، کە نزیکەی سێ بۆ چوار کەس لە پیاو و ژن، لەوێ کۆببوونەوە.

ئەو کەسانە خەریکی هەڵکەندنی چاڵی تفەنگ و نارنجۆکەکان بوون، دەیانەویست بەوانە خرۆشۆف بکوژن و پی تەر هاواری کرد: ئەو ئێستا لە (ناتابانیا)یە.

هەموو ئەو کەسانە چاوەڕوانی ئەو قسەیە بوون، بەزەحمەت توانییان شڵەژاوییان بشارنەوە، تەنیا بە تەوقەکردن و پێکەنین ڕازیبوون، بە خێرایی زیاتر خەریکی هەڵکەندن بوون تا زووتر چەکەکان بشارنەوە.

لەو کاتەدا، خرۆشۆف و یاوەرانی گەیشتوونەتە ناتابانیا، گەورەترین شاری پیشەسازیی هەنگاریا و ئەو سەربازانەی، کە لە شەقامەکانی شاردا وەستابوون، ڕێزیان نواند. لەودیو تەلە دوڕوەکاندا، چەند خانوویەکی داری ڕەنگنەکراو، کە شوێنی نیشتەجێبوونی زیاتر لە 700 زیندانی سیاسی بوون، بەرچاودەکەون. هەر بینایەک بۆ چوار ژوور دابەشکراوە، لە هەرژوورێک سی بۆ چل زیندانی دەژیان، قەرەوێڵە و دۆشەک لە گۆشە و قووژبنەکانی دانراون، لە هەرژوورێک، سۆپایەک هەبوو کە هەرگیز دانەدەگیرسا و مێزێکی گەورەی دار، ژوورەکەی دەڕازاندەوە.

زیندانییەکان کە لەوێ دەژیان، بێگاریان پێدەکراو ناچاریان دەکردن، لە کانزای ترسناک (تانابانیا) کاربکەن.

ڕۆژانـه، حوکومدراوانی زەحمەتکێش و ئەشکەنجەدراو، سەعات چواری بەیانی شوێنەکانیان بەجێدەهێشت، سەعات هەشتی شەو دەگەڕانەوە ،زیندانییە قورسەکان هەرگیز قاچەکانیان نـەدەکرانـەوە، لە سەرمای شەوانەش سۆپا دانەدەگیرسا تا خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە.

وێـڕای زیندانییەکان، نزیکەی هـەزار کەس لە حەوت هـەزار و سێسەد و دوازدە نفوسی شـار، لـە کانەکان کاریاندەکرد، ئەو کانانەیان ناودەنا (گۆڕەکانی مردن)

سالانە، زۆربەی کانچییەکان بەهۆی ئاگرکەوتنەوەوە، خنکان، تەقینەوە، هەرەسی بەردەکان و خراپی تونێلەکان و کەوتنی داری ڕایەڵەکان دەکوژرێن، ژمارەیەکی زۆریش بەهۆی هەڵمژینی گازی ژەهراویکەری خەڵوزی بەردینەوە دەمرن.

دڵتەزێنترین و خەمناکترین تـراژیـدی، ساڵی 1950 ڕوویـدا و لـەو سـاڵـەدا، بـەهـۆی تەقینەوە و هـەرەسـی تونێڵەکە، 400 کریکار کوژراوە،هـەزار بریندار بووە. لە ساڵی 1951، کاتیک کرێکاران بۆ دەربڕینی نارەزایی، لەبەرامبەر نەبوونی کەلوپەلی پێویست، بەتوندی مانیان گرت، پاسەوانی کانەکان و پۆلیس، دایاننە بەر گولله و بیست و نۆ کەسیان لێ کوشتن، بەڵام کاتێک خرۆشۆف چووە ناو شاری (ناتابانیا)وە، بێدەنگی باڵی بەسەر هەمووشۆنێکیدا

کێشابوو. پۆلیسی نهێنی و سەربازەکان بە شێوەیەکی باش بارودۆخەکەیان ڕێکخستووە،خەڵک مات و بێدەنگ لەسەر شەقامەکان ڕیزیان بەستووە، چاوەڕوانی هاتنی خرۆشۆفن و هەرکاتێک کە ئەفسەر و پۆلیسەکان، بڕیاریاندەدا: ئەوان هەستی خۆشیان دەردەبڕی.

ئاڵای سوور، سپی، سەوزی هەنگاریا و ئاڵای سووری سۆڤیێت، لەسەر دەرگای قوتابخانە و کانەکان هەڵکرابوون.

لەسەر سەربانی زۆربەیماڵەکانی شاری (ناتابانیا)، هیچ ئاڵایەک نەدەبینرا، هۆیەکەی ئەوەبوو کە خاوەنی ئەو ماڵانە زیندووبوون. ئەو ئاڵایانەی کە دروشمی بەخێرهاتنیان لەسەر دەنووسرێت، لەسەر منارەی کڵێسای کاسۆلیک و سەندیکای کرێکاران و گازینۆی کانچییەکان بوونی نەبوو.

خرۆشۆف و ئەندامە گرنگەکانی حیزبەکەی خۆی، لە هۆتێلێکی سپیی دوو نهۆمی نزیک گۆڕەپانی کانەکە نیشتەجێ بوو.

سێ ڕیانێک کە بە شارەکە کۆتایی دەهات، لە ناوەڕاستی شارەکە چوارڕیانێک هەبوو، کە سەری یەکێکیان بە دەروازەی یەکێک لە کانەگەورەکان کۆتایی دەهات. لەم گۆڕەپانەدا، سەکۆیەکی گەورە هەبوو، کە تایبەت بوو بە وتاردان و خرۆشۆف بڕیاریداوە، کە لە 8ی مانگی

نیسان (واتە بۆ بەیانی)، لەوێ وتەیەک پێشکەشبکات. لاوە هەنگارییەکان، کە لە دارستانەکە سەرقاڵی پیلانگێڕان بوون، نەخشەیەکی دیکەیان هەبوو. ئەو کۆمەڵە سیخوڕە دەیانویست سەرەتا نەخشەکەیان بە پەلاماردان جێبەجێ بکەن، خرۆشۆف بکوژن.

پۆلیسی نهێنی و یەکەکانی سوپا گەمارۆی شاریان دابوو، بەڵام سیخوڕە هەنگارییەکان، باش دەیانزانی چ بکەن.

(پی تەر) هەمان کوڕیژگەکە، عاقڵترین ئەندامی پیلانگێڕان بوو، ئەوانی دیکەش، هەموو ئەو کەسانە بوون، کە پێشتر لە سوپای سوور خزمەتییان کردووە، شارەزای ئەرکەکەی خۆیان بوون.

پیلانگێڕان، کەسانێک بوون نیازی تۆڵەسەدنەوەیان هەبوو، چونکە لە شۆڕشیساڵی 1956، زیاتر لە 32000 کەس کوژرابوون.

یەکێک لە پیلانگێڕان، کە ناوی (ساندوربار کوک) بوو، بڕیاریدا بۆ کوشتنی خرۆشۆف، نەخشەیەکی نوێ دابڕێژێت و بۆ ئەو مەبەستە، بۆمبە سەعاتە گچکەکەی، کە هێندەی گرێی قامکێک بوو، هەڵگرت (چەک بە شێوەیەکی قاچاخ لە ئەڵمانیا و ئیتالیا و بەلجیکا بە ئەوان، واتە هەنگارییەکان دەگەیشت) و جلوبەرگی خۆی گۆڕیوە، خۆی گەیاندووەتە

شوێنێک، کە دەیزانی خرۆشۆف بۆ بەیانی لەوێ وتاردەدات، هەرچۆنێک بوو، خۆی گەیاندە خزمەتکارەکەی باڵەخانەکە و (ئەو پیاوەش لە پیلانگێڕەکان بوو)، بڕیاری پێویستی دا و پاشان بۆمبە سەعاتییە گچکەکەی پێسپارد، دووبارە بۆ خۆی بۆ دارستانەکە گەڕایەوە.

خزمەتکارەکەی هەنگاریا، بۆمبەکەی بۆ سەعات چواری ڕۆژی بەیانی تەوقیت کردووە، لە شووشەی دەرمانی هاویشت، کە لەسەر مێزی شوێنی وتاردانەکەی خرۆشۆف بوو.

ئەگەر ئەو بۆمبە دەتەقییەوە، نەک تەنیا ئامادەبووانی دەکوشت، بەڵکو باڵەخانەکەشی هەڵدەگێڕایەوە.

***

خرۆشۆف نیازی وابوو سەعات چواری هەشتی نیسان، سەرەتا لە هۆڵی هۆتێلەکە وتاربدات، پاشان بچێتە گۆڕەپانەکە (واتە هاوشێوەکەی بچێتە گۆڕەپانەکە)، وتەیەک لە بەردەم خەڵکەکەدا پێشکەش بکات، قسە لەگەڵ کرێکاری کانەکان بکات.

کاتی وتاردان هات، (خرۆشۆف) هاتە پشت مێزەکە و خەریکی وتاردان بوو، سەرەتا بەهێمنی قسەی دەکرد، دەنگی ئاسوودەییەکی تایبەتی هەبوو، بەڵام وردە وردە دەنگی بەرزبووەتەوە، ڕوخساری سوورهەڵگەڕا و شڵەژا،

که دەستەکانی ڕادەوەشاند و سەرەو خواری دەکرد.

پیلانگێڕان لە گۆڕەپانەکە کۆبوونەتەوە، بە ترس و لەرزوە، چاوەڕوانی تەقینەوەی بۆمبەکە بوون.

پێنج خولەکی بۆ سەعات چوار مابوو!

خرۆشۆف بە ئاستێک شڵەژابوو، باسی وڵاتەکەی خۆی و بیروباوەڕی دەکرد، کە وەک ئیسپرینگ لە شوێنی خۆی هەڵدەبەزێتەوە و سەری ڕادەوەشێنێت. ڕێک کە شەش چرکەی بۆ سەعات چوار مابوو، شڵەژانی خرۆشۆف بە ئاستی هەرەبەرزی خۆی گەیشت، دەستی درێژکرد و لە کاتی قسەکردندا، سەرەتا مستێکی لەسەر مێزەکە دا، پاشان شووشەکەی سەر مێزەکەی هەڵگرت.

ئەو شووشەیە هیچ شتێکی دیکە نەبوو، بێجگە لە شووشەی مەرەکەب و بۆمبەکە. یەکێک لە پیلانگێڕەکان لە هۆڵەکە دانیابوو، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و تەماشای سەعاتەکەی کرد.

تەواوی ئەو ڕووداوە لە ماوەی کەمتر لە چرکەیەک ڕوویدا. خرۆشۆف وەها توورە و شڵەژابوو، ئاگری لە ناوچاوانی دەباری، لەناکاو دەستی خۆی هەڵبڕی و هاواری کرد:

- هاوڕێیان پێویستە کاربکەین، دەبێت پیس و چەپەڵەکان دووربخەینەوە. دەبێت هاوڕێی خراپ دەربکەین. خائینان بکوژین و بە شێوەیەک لەسێدارەیان بدەین، بێنەوە سەر خۆیان.

خرۆشۆف دوای ئەوەی قسەکەی تەواو کرد، بۆ نواندنی قسەکەی خۆی شووشەکەی بەرەو پەنجەرەکە هەڵدا.

مەرەکەبەکە بە شووشەی پەنجەرەکەدا هەڵڕژا، شووشەکە چووەدرەوە، لە هەمان کاتدا، لەنێوان زەوی و ئاسمان تەقییەوە. دەنگی تەقینەوەی گوێکەڕکەر، لەشی هەمووانی خستە لەرزەوە و بەیەکجار وەک بڵێی دەریایەک خرۆشابێت، ئامادەبووان لە شوێنەکەی خۆیان هەستان و بوو بە گاڵە گاڵ.

پۆلیس و سەربازەکان یەکسەر ڕژانە هۆڵی هۆتێلەکەوە، خرۆشۆف بە ڕەنگ و ڕووی پەڕیوەوە بە یاوەریی پاسەوانەکانی خۆی، گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و دەرگای هۆڵەکەیان لەدواوە داخست.

***

بەو شێوەیە بوو کە پیلانەکە سەری نەگرت و پۆلیس لێکۆڵینەوەکانی خۆی فراوانکرد، بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبوو، تەنیا هەموویان ئەو ڕووداوەیان بە پەرجویەک دەزانی، هیچ کەس نەیزانی کە ئەسڵی بابەتەکە چییە، هەواڵەکەشی بڵاونەکرایەوە، هەر ئەو ڕۆژە، هاتوهاوار کپبووەوە و ڕووداوەکە لەبیرکرا.

***

ئەو شەوە، پیلانگێڕان لە دارسانەکەدا مژولی پاککردنەوەی چەکەکانیان بوون. مەخزەنەکانیان پڕدەکرد لە گوللە و نیازیان وابوو بۆ بەیانی، گەمارۆی هۆتێلەکە بدەن و خرۆشۆف بکوژن.

(ساندور) سەرۆکی پیلانگێڕان، بەردانگ بە هاوڕێکانی خۆی وتی:

کوڕینە! ئێمە ئەمڕۆ سەرکەوتوو نەبووین، بەڵام بۆ جاری دووەم پێویستە حەتمەن بەئەنجام بگەین. باش تفەنگەکانتان خاوێن بکەنەوە، پێش پڕکردنەوی مەخزەنەکان بەباشی دەرزیلەی تەقەکردن تاقیبکەنەوە. بەرگی تفەنگەکان بکەنەوە و فیشەکە تەڕەکان لە وشکەکان جیابکەنەوە.

(ساندرو) دوای ئەوەی قسەکەی کرد، لەسەرخۆ و خاکییانە، نارنجۆکێکی هەڵگرتووە، تراقەکەی دەرهێنا و ئینجا باسی چۆنیەت ی درووستکردنی کرد و وتی: تا ئەو کاتەی ئامادەی پەلاماردانیت، نابێت ئەڵقەی نارنجۆکەکە ڕابکێشیت، پاشانیش دەبێت پێنج ژمارە بژمێریت و نارنجۆکەکە بەرەو ئامانجەکە بهاویت.

تاریکی دارستانەکەی داپۆشی و ئەو گرووپە، ئاگریان کردەوە. هیچ کەس نەیدەتوانی لە لای جادەکەوە بیانبینێت، لەوانەبوو گڕی ئاگرەکە لە ئاسمانەوە بەرچاوبکەوێت، بەڵام لەسەر زەوی و لە دەوروبەر، هەرگیز نەدەبینرا. چل پیلانگێڕ

لەسەر زەوی پاڵکەوتوون و لە کاتێکدا چەکەکانی خۆیان لەبن سەریان بوون، خەوتن.

سەعات سێ و سی خولەکی بەرەبەیان، کاتێک کە زیندانییە سیاسییەکانی (ناتابانیا) دەبرانە کانەکان، ساندور هاوڕێکانی خەبەرکردەوە و بڕیاری ڕۆیشتنی دا.

وا بڕیاربوو هەموویان بە غاردان بەرەو شار بڕۆن، پاشان لە گۆڕەپانی گەورە، لەدەوری یەک کۆببنەوە، چاوەڕوانی هێما بن و لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تیشکی خۆری بەرەبەیان لە ئاسۆی زێڕینەوە، پەلاماری ئەو هۆتێلە بدەن کە خرۆشۆفی لێیە.

دنیا ساردبوو، لە خەو هەستان و (ساندور) جارێکی دیکە بڕیاری پێویستی دەرکرد. لە دەستی چەپی دەمانچەیەکی حەوت تیر و کلاشینکۆفێک بە شانییەوە دەبینرێت. بەر چاوەکانی بازنەیەکی ڕەش خەرمانەی داوە و ڕوخساری زۆر گەنجی کردووە.

(پی تەر)، هەمان کوڕیژگە کە بۆ یەکەم جار هاتنی خرۆشۆفی ڕاگەیاندبوو، باوێشکێکی هاتێ و لە جێگەی خۆی هەستا و چاوەکانی هەڵگلۆفت. تفەنگێکی سووکی هەڵدەگرت و لە مندالی ئەو جووتیارانە دەچوو، کە بەنیازن ورچ ڕاوبکەن.

پیلانگێڕان، چەکەکانی خۆیان تاودایە و یەکێکیان، بۆ

زیاتر دڵنیابوون لە باش تەقەکردنی تفەنگەکەی، دەستێکی لە قۆنداغەکەی دا و لەناکاو پەنجەی دۆشاومژەی بەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە کەوت، دەنگی تەقینەوەیەکی گەورە بیسترا، تەقەکە لە دارستانەکەدا دەنگی دایەوە.

لەوانەیە ئەو گوللەیە بەڕێککەوت تەقیبێت، یان بەئەنقەست تەقێنرا، بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نەبوو، لەو ڕۆژە بەدواوە، کەس نەیزانی ئەو گەنجە چی بەسەرهات، کە گوللەکەی تەقاندبوو.

دوای تەقینەوەکە، بێدەنگییەکی کوشندە باڵی کێشا و هەموویان هەناسەیان لە خۆیان بڕی.

ئەو بێدەگییە تەنیا خولەکێک درێژەی کێشا، چونکە دوای کەمێک، باڵندەکان خەبەریان بووەتەوە و فڕیون و بەلایەکی وا بوو، پیلانگێڕان بۆخۆشیان زراویان چوو، وەک دەیانزانی پۆلیس چاودێریی جادەکان دەکات، بێگومان دەنگی تەقەکەیان بیستووە، بۆیە هەموویان هەستان و چەکەکانی خۆیان لەسەر زەوی داناوە، ڕایانکرد و هەر چەند (ساندور) بانگی کردن، کە خۆیان تێک نەدەن و ڕانەکەن، کەس گوێی پێنەدا.

دەنگی تەقەی گوللەکە بە گوێی دوو لە پۆلیسە نهێنییەکان، کە لەسەر جادەی (ناتابانیا - بۆداپست) ئێشکیان دەگرت گەیشت، ئەوان یەکسەر ناوەندی فەرماندەییان لە مەسەلەکە ئاگادارکردەوە، لە ماوەی کەمتر لە پێنج خولەک، سەدان پۆلیس

و سەرباز ڕژانە دارستانەکەوە و گەمارۆیان دا، چاوەڕوانی دەرکەوتنی خۆر بوون.

زرێپۆشەکان، ڕێگەکەیان گرت و سەربازە سوارەکان، تەواوی جادە خۆڵەکەیان خستە ژێر چاودێریی خۆیانەوە.

بە شێوەیەک دارستانەکە گەمارۆدرا، تەنانەت مێرووولەیەکیش نەیدەتوانی بجووڵێتەوە، دوای نیوسەعات، پۆلیس و سەربازەکانی سۆڤێت و هەنگاریا، چوونە ناو دارستانەکەوە.

ژمارەیەک لە پیلانگێڕان نیازی ڕاکردنیان هەبوو، بەڵام سەعات دەی سەرلەبەیانی، پێنجیان لێ کوژراوە و زیاتر لە بیست کەسیان دەستگیرکران.

(پی تەر) و ساندرو لە دەستگیرکراوەکان بوون، دەستیان لەپشتەوە بەستن و بە هەرجووڵانەوەیەک، پەتەکە گۆشتی دەستیانی دەبڕی. گیراوەکان خرانەناو ئیڤای سەرداپۆشراوەوە، پۆلیسە ڕەشپۆشەکان، چەک بە دەستەوە، لەپەنایان دانیشتن.

ئیڤایەکان بەرەو گرتووخانەی (فۆتکا) کەوتنەڕێ، دەستبەجێ دەنگەدەنگەکە کپبووەتەوە، جارێکی دیکە بێدەنگی و ئارامی، دارستانەکەی داپۆشیوتەوە.

***

(خرۆشۆف) تازە لە نانخواردنی بەیانی بووەتەوە، کە بریتی بوو لە زەلاتە، هێلکە و ماسیی سوورەوەکراو و چا، دەستەکانی دەشووشتن، سەرۆکی پاسەوانەکانی، جەنەراڵ

پوان مرۆڤ، لە دەرگای دا دوای ئەوەی هەواڵی سەلامەتیی خرۆشۆفی پرسیی، ڕایگەیاند کە پلاگێڕان ئاشکرابوون و دەستگیرکراون، پاشان لەسەری ڕۆیشت چۆنچۆنی پۆلیسەکان، توانیویانە خائینان پێش ئەوەی بگەن بە شاری (ناتابانیا)، بگرن. بە باوەڕی سرۆف، ئەو هەنگاوەی پۆلیس، زۆر گرنگ و شایانی سەرنج بوو.

کاتێک سرۆف قسەکانی تەواوکرد، خرۆشۆف کوپە چایەکەی لەسەر مێزەکە دانا، بە چاوی وێکهاتووەوەیی، تەماشای ڕوخساری جەنەراڵ سرۆفی کرد و پرسیی: بۆچی ئەو پیلانە زووتر ئاشکرانەکراوە؟ بۆچی هێشتا ئەوەندەی پێبچێت؟ بۆچی کارمەندەکانی ئێمە، یان هەنگاریا پێشتر چەکەکانیان نەدۆزیوەتەوە؟ ناوبانگتان هەیە، کە ئێوە خاوەن دیارترین پۆلیسی جیهانن، بەڵام سەرەڕای ئەوە نەتانتوانیوە پێشتر بە خائینان بزانن.

***

ئەوەندەی پێنەچوو (سرۆف) لەسەر کار لابرا، تەواوی ئەو کەسانەی کە گومان دەکرا لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکەیان کەمتەرخەم بووبن، گیران یان لە کارەکەیان دوورخرانەوە.

خرۆشۆف بۆ بەیانی لە گۆڕەپانی شار دەرکەوت، بەڵام ئەم جارەیان نە بزە لەسەر لێوانی بوو، نە ڕوویەکی خۆشی هەبوو، گۆڕەپان و شەقامەکان پڕبوون لە خەڵک،

زیاتر لە هەزار و دووسەد سەربازی چەکدار لە جادەکان وەستاون و چاوەڕوانی بڕیارن.
ژمارەی خەڵکەکە زیاتر لە سی هەزار کەس بوو. کانە خەڵووزی بەردین، داخراوە و کرێکارەکان لەوێ بوون.
خرۆشۆف کە لە تووڕەییان دەلەرزی و ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو، تەماشای ئاپۆرەی خەڵکەکەی کرد، پاشان چووە پشت مایکەکە و وتی: ئەگەر جارێکی دیکە شۆڕش و ئاژاوە، یان پیلانگێڕی بکرێت، هێزەکانی سوپای سۆڤێت و هەنگاریا، بەبێ ئەوەی بەزەییان بە کەسدا بێتەوە، خائینان بە سزای تاوانەکەیان دەگەیەنن.
بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بەسەر گۆڕەپانەکەدا کێشابوو، خرۆشۆف بەردەوام بوو: ئەگەر ئێوە ڕەخنەکانی منتان پێ خۆش نییە، بەناچاری قووتیان بدەن و پاشان تێدەگەیت، کە بەو شێوەیەی بیرتکردووەتەوە، دەمتان تاڵ نابێت.
دەسەڵاتدارانی هەنگاریا بە ئامادەبووانیان ڕاگەیاند، کە بارودۆخی وڵات بۆ قبووڵکردنی گەشتیارانی ڕووسی، لەبارنییە و خرۆشۆفیش سەفەرەکەی کۆتایی پێهێناوە و بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە.
مانگێک دوای ئەوەی پیلانی کوشتنی خرۆشۆف ئاشکرابوو، خرۆشۆف بڕیاری لەسێدارەدانی (ئیمرناکی)، سەرۆکوەزیرانی هەنگاریای لە ساڵی 1956 دەرکرد.
زیندانییەکان یەک لەدوای ئەوی دیکە (پیلانگێڕان)،

بەردەبوون و تەواوی ئەو کەسانەی، کە هاوکاری (ناکی) و (مالی تەر) بوون، دەستگیرکران.

کارمەندانی نهێنیی سۆڤێت بۆ کانەکان دەنێردران. ئەو بیست لاوەی کە نیازی کوشتنی خرۆشۆفیان هەبوو، ئەشکەنجەدران و ناچاریانکردن دان بە کارەکەیان دابنێن.

ئەو بیست کەسە لە زیندانی (ماریانوسترا) زیندانی بوون، پاسەوانێکی ئەو گرتووخانەیە، کە چۆنیەتیی ئەشکەنجەدانی گرتووەکانی دیتووە، بۆ نەمسا ڕایکردبوو، بۆ کارمەندانی دەزگای هەواڵگریی خۆرئاوا ڕایگەیاندبوو: ڕۆژانە دەستگیراوەکانیان بە مست و پێلاقە و قامچی ئەشکەنجە دەدا، دەست و لاقیان بە جگەرە دەسووتاندن و تەنانەت لە هەندێک کاتدا نینۆکی دەست و لاقیان دەردەهێنان تا ئیعتراف بکەن. کێ فەرمانی پێکردوون خرۆشۆف بکوژن. دەستگیرکراوێک کە سەرکێشی دەکرد و ئیعترافی نەدەکرد، ئەشکەنجەیەکی سەیریان دا، بەو مانایەی کە بتڵێکیان لە ....... ڕۆکرد و شووشەکە شکا، بووەهۆی خوێنبەربوونی ناوەوە و ئەو پیاوە بە ئازارێکی زۆرەوە گیانی سپارد.

زیاتر لە دە کەس لەو گرووپە بەنهێنی دادگایی کران و بڕیاری مردنیان بۆ دەرکرا، یان لەسێدارەیان دان، یان گوللەبارانیان کردن، بەڵام ئەو کەسانە چانسیان هەبوو، کە گوللەباران کران، چونکە بە مردنێکی ئاسانتر ماڵاواییان لە دنیا کرد، لانیکەم، ئەشکەنجە و ئازاردانیان

نەبینی، کە لەسێدارە دراوەکان بەرگەیان گرت.

هەندێک جار لە حەوشەی گرتووخانەکە، جەللاد هەبوو پەتەکەیان لە ملی ئەو کەسانە دەکرد، کە بڕیاری لەسێدارەدرانیان هەبوو، بە جۆرێک ئەو کارەیان بە نەزانانە دەکرد، کە حوکومدراوەکان، زیاتر لە نیوسەعات دەست و لاقیان ڕادەوەشاند تا دەخنکان.

(ساندور) سەرۆکی پیلاگیڕانیان بە هەمان بارودۆخ لەسێدارەدا، بەڵام (پی تەر)، هەمان کوریژگەی ناوبراو لەو کەسانە بوو، کە گوللەباران کراو ئەو بە هەمان هێلەک و پانتۆڵی چەرمی (کە لە مێژووی حەوتی نیسان، لە کاتی چوونەدەرەوە لە ماڵ و دەستگیرکردنی لەبەریدابوو)، لە ڕیزی حوکومدراوەکان وەستاوە، وەک زۆر گەنج بوو، بۆیە بە پێچەوانەی ئەوانی دیکە هیچ کەس لە دواتەمەنیدا فەرمووی جگەرەی نەکرد، کەسیش لەبارەی دوائارەزووی پرسیاری لێنەکرد، زۆر سادە پەڕۆیەکی سپیان لە چاوەکانی بەست و لە پشتەملی، لەسەر مووە زەردەکانی گرێیاندا.

کاتێک پەڕۆکەیان دەبەست، چاوە ڕەنگ قاوەییەکانی تەواو وشکببوون، بەڵام ڕەنگی ڕوخساری پەڕیوە و لێوەکانی دەلەرزن و وەک تەمەنی لە دوازەساڵ زیاتر نەبوو، بۆیە دەوترا گەنجترین مەحکومێکە، کە تا ئەو مێژووە لەو گرتووخانەیەدا گوللەباران بکرێت.

# بەرهەمە چاپکراوەکانی دەزگای ئایدیا

| ژ | ناوی بەرهەم | نوسەر | وەرگێڕ | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ئاشنابوون بە ئەفلاتوون | ڕێباز مستەفا | | 2014 |
| 2 | ئاشنابوون بە سپینۆزا | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 3 | ئاشنابوون بە کیرگە گۆر | شۆڕش مستەفا | | 2014 |
| 4 | ئاشنابوون بە شۆپنهاوەر | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 5 | ئاشنابوون بە کارل پۆپەر | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 6 | ئاشنابوون بە ئالان تۆرین | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 7 | ئاشنابوون بە سوقرات | لوقمان ڕەئوف | | 2014 |
| 8 | ئاشنابوون بە ئەرستۆ | ڕێباز مستەفا | | 2014 |
| 9 | ئاشنابوون بە قەشە ئاگۆستین | سەرهەنگعەبدولرەحمان | | 214 |
| 10 | ئاشنابوون بە جان جاك ڕۆسۆ | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 11 | ئاشنابوون بە دیڤید هیوم | مستەفازاهیدی | | 2014 |
| 12 | ئاشنابوون بە نیچە | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 13 | ئاشنابوون بە فرۆید | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 14 | ئاشنابوون بە جۆن لۆك | عەتاجەمالی | | 2014 |
| 15 | ئاشنابوون بە لینین | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 16 | ئاشنابوون بە ئەریك فرۆم | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 17 | ئاشنابوون بە قوتابخانەی فرانکفۆرت | عوسمان حەمە ڕەشید | | 2014 |
| 18 | ئاشنابوون بە بزووتنەوەی فێمێنیزم | کۆمەڵێک نوسەر | | 2014 |
| 19 | بلیمەتی و شێتی | بازگر | | 2014 |
| 20 | ئاشنابوون بە کریشنا مۆرتی | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 21 | ئاشنابوون بە سیکۆلاریزم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 22 | ئاشنابوون بە سیمۆن دیبۆڤوار | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 23 | ئاشنابوون بە ڤێرجینیا وۆلف | لوقمان ڕەئوف | | 2014 |
| 24 | ئاشنابوون بە یۆرگن هابرماس | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 25 | ئاشنابوون بە درێدا | کۆمەڵێك نوسەر | | 2014 |
| 26 | مەکری ئیسلامییەکانی کوردستان | ماجید خەلیل | | 2013 |
| 27 | کتێبی سور | ماوتسی تۆنگ | فازڵ حسێن مەلا ڕەحیم | 2014 |
| 28 | سەیران بۆ سەرێکانێ | ستران عەبدوڵلا | | 2014 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 29 | گەندەڵی | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | | 2014 |
| 30 | یوتۆپیا | کۆمەڵێک نوسەر | پێشەوا فەتاح | 2015 |
| 31 | لەقەندیلەوە بۆ کوبانێ | ئەنوەر حسێن - شۆڕش مستەفا | | 2015 |
| 32 | پرۆیستڕۆیکای بەهاری عەرەبی | ئەنوەر حسێن (بازگر) | | 2015 |
| 33 | گەشتە بێ ئاکامەکانی سەرکردەیەك | بریتا بولەر | ڕێکەوت ئیسماعیل | 2015 |
| 34 | داعش و داعشناسی | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 35 | گروپی قەیرانی چارەسەری پرۆسەی ئاشتی نێوان تورکیاو پەکەکە | ماجد خەلیل | | 2015 |
| 36 | گۆڕینی رژێم و شۆڕشەکان، ئەو ڕووداوانەی سیستمی سەدەیەکیان سرییەوە | سەجعان میلاد ئەلقزی | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2015 |
| 37 | ئاشنابوون بە بێرکلی | ئەرسەلان حەسەن | | 2015 |
| 38 | ئاشنابوون بە باشلار | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 39 | ئاشنابوون بە دیکارت | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 40 | ئاشنابوون بە هایدگەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 41 | ئاشنابوون بە جیل دۆلۆز – بەرگی یەکەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 42 | ئاشنابوون بە جیل دۆلۆز – بەرگی دووەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 43 | ئاشنابوون بە هانا ئارێنت | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 44 | ئاشنابوون بە هیگڵ | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 45 | ئاشنابوون بە سارتەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 46 | ئاشنابوون بە نیچە | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 47 | ئاشنابوون بە ڤۆڵتێر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 48 | ئاشنابوون بە سلاڤۆی ژیژەك | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 49 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی یەکەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 50 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی دووەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 51 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی سێیەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 52 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی چوارەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 53 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی پێنجەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 54 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی شەشەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 55 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی حەوتەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 56 | ئاشنابوون بە مارکس – بەرگی هەشتەم | جەلال حەمید | | 2015 |
| 57 | بۆچی مارکس لەسەر حەق بوو | تێری ئیگڵتۆن | پێشرەو محەمەد | 2015 |
| 58 | خەوتن لەگەڵ شەیتان | رۆبێرت بایەر | ئەرسەلان حەسەن | 2015 |
| 59 | ئاشنابوون بە فیورباخ | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 60 | ئاشنابوون بە تۆماس مۆر | وریا غەفوری | | 2015 |
| 61 | ئاشنابوون بە شۆپنهاوەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 62 | ئاشنابوون بە گرامشی – بەرگی یەکەم | ئەرسەلان حەسەن | | 2015 |
| 63 | ئاشنابوون بە گرامشی – بەرگی دووەم | ئومێد عوسمان | | 2015 |
| 64 | ئاشنابوون بە ئەرستۆ | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 65 | ئاشنابوون بە دیموکراسی | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 66 | ئاشنابوون بە ئەلبێر کامۆ – بەرگی یەکەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 67 | ئاشنابوون بە ئەلبێر کامۆ – بەرگی دووەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 68 | ئاشنابوون بە ئەلبێر کامۆ – بەرگی سێیەم | مستەفا زاهیدی | | 2015 |
| 69 | ئاشنابوون بە ئەرکون | د. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد | | 2015 |
| 70 | ئاشنابوون بە فۆکۆ | جەبار ئەحمەد | | 2015 |
| 71 | ئاشنابوون بە تۆماس ئەکیونی | ماجید خەلیل | | 2015 |
| 72 | ئاشنابوون بە ئەنگڵس | ئارۆ هەورامی | | 2015 |
| 73 | ئاشنابوون بە جۆن ستیوارت میل – بەرگی یەکەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 74 | ئاشنابوون بە جۆن ستیوارت میل – بەرگی دووەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 75 | ئاشنابوون بە جۆن ستیوارت میل – بەرگی سێیەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 76 | ئاشنابوون بە جاك لاکان | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 77 | ئاشنابوون بە لایبنتز | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 78 | ئاشنابوون بە میکاڤیلی | کۆمەڵێك نوسەر | | 2015 |
| 79 | مارکس کێ بوو | د.عبدلعلی مقبل | مەجید مارابی - جەواد حەیدەری | 2015 |
| 80 | حرکة الحداثة فی الشعر الکردی | د.سەروەر عەبدوڵڵا | | 2015 |

| 81 | فیتنە | هشام جعیط | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2016 |
|---|---|---|---|---|
| 82 | داعش و میلیشیاکان | ئەنوەر حسێن | | 2016 |
| 83 | ئاشنابوون بە پۆڵ ریکۆر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 84 | ئاشنابوون بە ئاڵتۆسێر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 85 | ئاشنابوون بە سپینۆزا | سەرهەنگ عەبدولرەحمان | | 2016 |
| 86 | ئاشنابوون بە پۆپەر | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 87 | ئاشنابوون بە دۆرکهایم | ئارام مەحمود - دانا لەتیف جەلال | | 2016 |
| 88 | ئاشنابوون بە دریدا | ئارام مەحمود | | 2016 |
| 89 | ئاشنابوون بە لیوتار | ماجید خەلیل | | 2016 |
| 90 | ئاشنابوون بە لینین - بەرگی یەکەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 91 | ئاشنابوون بە لینین - بەرگی دووەم | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 92 | ئاشنابوون بە ترۆتسکی | پێشرەو محەمەد | | 2016 |
| 93 | ئاشنابوون بە بێرتراند راسڵ | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 94 | ئاشنابوون بە پۆپۆلیزم - بەرگی یەکەم | ب. لیڤا | | 2016 |
| 95 | ئاشنابوون بە پۆپۆلیزم - بەرگی دووەم | ب. لیڤا | | 2016 |
| 96 | ئاشنابوون بە ئەفلاتون | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 97 | ئاشنابوون بە رۆزا لۆکسۆمبۆرگ | ئاکام بەسیم | | 2016 |
| 98 | ئاشنابوون بە سیمۆن دیبۆڤوار | کۆمەڵێك نوسەر | | 2016 |
| 99 | ئاشنابوون بە کریشنا مۆرتی | شاسوار کەمال | | 2016 |
| 100 | ئاشنابوون بە تۆتالیتاریزم - بەرگی یەکەم | ئەرسەلان حەسەن | | 2016 |
| 101 | ئاشنابوون بە تۆتالیتاریزم - بەرگی دووەم | ئەرسەلان حەسەن | | 2016 |
| 102 | ئاشنابوون بە مانفێستی حزبی کۆمۆنیست | موصلّح شێخ شیسلامی | | 2016 |
| 103 | سێگۆشەی گرگرتوو | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | | 2016 |
| 104 | دەروازەیەك بۆ ناسینی جەنگی عێراق - کوەیت | هەڵگورد جەلال | | 2016 |
| 105 | گەشتی دوورو درێژی ئەتۆمی ئێران تێچوون و مەترسییەکانی | سۆران عەلی | | 2016 |
| 106 | چەتەکانی دەریا لە باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا، خۆرئاوای ئەفریقیاو سۆماڵ | هەڵگورد جەلال | | 2016 |

| 107 | خەبات لەپێناو فرەییدا دوای شۆڕشەکانی باکوری ئەفریقیا | سۆران عەلی | 2016 |
|---|---|---|---|
| 108 | جوڵانەوەی ئەمازیغی و دینامیکیای ژیانی سیاسی لیبیا | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2016 |
| 109 | نەوت و گازی شیلی ئەمەریکاو ئاکامە جیۆپۆلۆتیکەکانی | ئەرسەلان حەسەن | 2016 |
| 110 | کۆچ لە جیهانێکی بێئۆقرەدا | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2016 |
| 111 | تیرۆر، تیرۆریزم و تیرۆریزمی نێودەوڵەتی | ڕێباز مستەفا | 2016 |
| 112 | چین و سیستەمی بازرگانی جیهانی | بابان ئەنوەر | 2016 |
| 113 | ئومێدی خۆرهەتاوی من | سەرهەنگ عەبدولرەحمان | 2016 |
| 114 | ئازادی و خیانەت لە ئازادی | ئەرسەلان حەسەن | 2016 |
| 115 | فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی رەوتە ئیسلامییەکان | فوئاد مەجید میسری | 2016 |
| 116 | کورد و ئیسلام لە یەکتربڕدا | نەوزاد جەمال | 2016 |
| 117 | کارل مارکس و لیۆن ترۆتسکی | بابان ئەنوەر | 2016 |
| 118 | مارکسیزم لە هەزارەی سێیەمدا | بژار سەردار - ئازاد ئارمان | 2016 |
| 119 | چوار سندوق | مەریوان هەڵەبجەیی | 2016 |
| 120 | گفتوگۆ | مەریوان هەڵەبجەیی | 2016 |
| 121 | سەڵتەکان | مەریوان هەڵەبجەیی | 2016 |
| 122 | چیرۆکی ورچەکانی پاندا | مەریوان هەڵەبجەیی | 2016 |
| 123 | وردە تاوانەکانی ژیانی هاوسەرێتی | مەریوان هەڵەبجەیی | 2016 |
| 124 | کورد و مێژووی جەژنی نەورۆز | د.کەیوان ئازاد ئەنوەر | 2016 |
| 125 | ئەو شتانەی لێیان بێدەنگ بووم | ساراڵ فەهمی شەریف - هێمن تاهیر | 2016 |
| 126 | چۆن ئیسلامی میانڕەو دەبێتە کارگەی بەرهەمهێنانی تیرۆر؟ | سۆران سێوکانی | 2016 |
| 127 | ئومێد بە زیندووی بهێڵەرەوە | یاسین محەمەد عەلی - هێمن تاهیر | 2016 |
| 128 | باوەڕدارە تیرۆریستەکە | سۆران عەلی | 2016 |
| 129 | پێغەمبەرو پرۆلیتاریا | پێشڕەو محەمەد - هێرۆ خوسرەوی | 2016 |
| 130 | مارکسیزم چۆن کاردەکات | بابان ئەنوەر | 2016 |
| 131 | ئامانجی فەلسەفە | شاسوار کەمال | 2016 |
| 132 | پرسی ژن | عادل عەلی | 2016 |
| 133 | چەپی نوێ | د.ئەکرم میهرداد | 2016 |
| 134 |ناملکەی لێبوردەیی | فەرشید شەریفی | 2016 |
| 135 | یاداشتەکانی جەنگ | ستران عەبدوڵڵا | 2016 |

| 136 | ژنێك له نێو سەردەستەی میلیشیاکاندا | دڵشاد محەمەد - هێمن تاهیر | 2016 |
|---|---|---|---|
| 137 | مارکس و رەخنەی سیاسەت | هاوار محەمەد | 2016 |
| 138 | له بڵاوکردنەوەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان | یوسف محەمەد بەرزنجی | 2016 |
| 139 | فەلسەفە له ئێستادا | دانا شوانی | 2016 |
| 140 | تێۆری زانینی زانستیانه | د.حەمید عەزیز | 2016 |
| 141 | مارکس و ئازادی | دانا شوانی | 2016 |
| 142 | شرۆڤەی ئەفسانەی سیزیف | ئیسماعیل ئیسماعیل زاده | 2016 |
| 143 | سەلەفییەت له کوردستانی ئێران | ماجد خەلیل | 2016 |
| 144 | هەژموونی نەوت | سۆران عەلی | 2016 |
| 145 | دەوڵەت | سمکۆ محەمەد | 2016 |
| 146 | مێژوی ئابوری جیهان | محەمەد چیا | 2016 |
| 147 | له تۆڵەیتۆڵەوە بۆ ناوزەنگ | خەڵەف غەفور | 2016 |
| 148 | پارت و رێکخراوە سیاسییەکان له تورکیا | محەمەد فاتح | 2016 |
| 149 | دەقی شیعری کوردی له روانگەی سیمیۆلۆژییەوە | د.لوقمان رەئوف | 2016 |
| 150 | تیۆری چوارەمی سیاسەت | وریا غەفوری | 2017 |
| 151 | هونەری شێوەکاری نوێ | رامیار مەحمود | 2017 |
| 152 | جیهانگیری له روانگەی جیاوازەوە | حەسەن بارام | 2017 |
| 153 | پاکستان و گۆڕانیەکانی ناوخۆو دەرەوە | بابان ئەنوەر | 2017 |
| 154 | پەیوەندی ئێران و هندستان | ماجید خەلیل | 2017 |
| 155 | چین و ئێران | محەمەد چیا | 2017 |
| 156 | ژنان له بەهاری عەرەبیدا | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 157 | سیستمی نێودەوڵەتی هێز یان دادپەروەری | ئارام مەحمود ئەحمەد | 2017 |
| 158 | رکابەری ئەمەریکاو ئێران له ئەمەریکای لاتین و ئەفەریقیا | کۆشان عەلی زەمانی | 2017 |
| 159 | کاریگەرییەکانی دابەزینی نرخی نەوت | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2017 |
| 160 | پێگەی ئێران له خۆرهەڵات ناوەڕاستدا | بەختیار ئەحمەد ساڵح | 2017 |
| 161 | مۆریتانیا وڵاتێکی درەوشاوەی کەنارو بیابان | شاناز هیرانی | 2017 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 162 | هەرێمی کوردستان و ململانێ ناوچەییەکان | ئەنوەر حسێن (بازگر) | 2017 |
| 163 | فەلسەفەی هانا ئارێنت | ئارام مەحمود | 2017 |
| 164 | نەوت بەرامبەر زەوی | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2017 |
| 165 | پوختەی سەرمایەی مارکس | بابان ئەنوەر | 2017 |
| 166 | چوارینەی دیموکراسی | رەنجەی نابینا | 2017 |
| 167 | نفوذ الهلال الشیعی فی الشرق الاوسط | عەلی محەمەد صالح | 2017 |
| 168 | هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتی نەرمی قەتەر | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 169 | سۆفیزم لە ئاسیای ناوەڕاستدا | عەبدوڵلا مەلا ئەحمەد | 2017 |
| 170 | لە ئیسلامی قورئانەوە بۆ ئیسلامی فەرمووده | سۆران سێوکانی | 2017 |
| 171 | مێژووی درۆ | هاوار محەمەد | 2017 |
| 172 | پرسی کورد | ماجید خەلیل | 2017 |
| 173 | پۆست کۆمۆنیزم | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 174 | پرۆگرامە ئەتۆمییەکان | جەواد حەیدەری | 2017 |
| 175 | پەیوەندی روسیا و ئەمەریکا | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 176 | دەربارەی میواندۆستی | هاوار محەمەد | 2017 |
| 177 | بەرەو ئاشتی هەمیشەیی | رێبین رەسوڵ | 2017 |
| 178 | رۆشنگەری چییە؟ | رێبین رەسوڵ | 2017 |
| 179 | چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی و رۆژنامەوانی | یوسف ئەحمەد مەنتك | 2017 |
| 180 | سەرەتایەك لەسەر ئاسایشی سروشتی | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 181 | مێژووی پەیەدە | ماجید خەلیل | 2017 |
| 182 | کتێبی سور - چاپی سێیەم | فازڵ حسێن مەلا رەحیم | 2017 |
| 183 | مەحرەمی راز شەرحی غەزلیاتی حافز | ئەکرەم عەنەبی | 2017 |
| 184 | مارکس کێ بوو؟ چاپی دووەم | مەجید مارابی - جەواد حەیدەری | 2017 |
| 185 | ئالان بادیۆ | کۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 186 | رولان بارت | کۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 187 | جۆرج باتای | هاوار محەمەد | 2017 |
| 188 | چۆمسکی | کۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 189 | جۆن دیۆی | د. لوقمان رەئوف - ئارام محمود | 2017 |
| 190 | رۆدۆلف کارناب | کۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 191 | کۆنفۆشیۆس | کۆمەڵێك نوسەر | 2017 |

| 192 | جوليا كريستيڤا | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
|---|---|---|---|
| 193 | ليڤی شتراوس | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 194 | مارتين بوبەر | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 195 | ماوتسی تۆنگ | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 196 | مۆنتيسكۆ | سيار خورماڵی | 2017 |
| 197 | پيەر بۆرديۆ | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 198 | سپێنوزا | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 199 | ويتگنشتاين | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 200 | والتەر بنيامين | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 201 | فرانسيس فۆكۆياما | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 202 | مارتن لۆسەر | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 203 | سان سيمۆن | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 204 | دێڤد هارڤی | كۆمەڵێك نوسەر | 2017 |
| 205 | جەنگی سارد | شاناز رەمزی هيرانی | 2017 |
| 206 | سيخوڕی و دژە سيخوڕی | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 207 | بيرەوەريی هەواڵگری | كارناس جوبرائيل | 2017 |
| 208 | هەواڵگری و تۆڕە كۆمەڵايەتييەكان | ئاران عەلی | 2017 |
| 209 | ئايندەی كاری هەواڵگری لە سەدەی بيست و يەكدا | رەوەند هەورامی | 2017 |